# نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش

## ژیاننامە و بیرەوەری

شێرکۆ بێکەس

له زنجیره بڵاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب ١٨

# نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش

## ژیاننامە و بیرەوەری

بەرگی ١

## شێرکۆ بێکەس


- بەرگ: فەرزاد ئەدیبی
- پێداچوونەوە و ڕێکخستن: مەریوان عەلی
- چاپ: یەکەم- ٢٠١٣
- چاپخانە: کارۆ
- تیراژ: ٢٥٠٠ دانە
- نرخ: ٢٠٠٠٠ دینار (نرخی دوو بەرگ)
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ١٧٤٤ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.

نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش، دەستگرتنی شێرکۆ بێکەسە بە ئاگر و ژیلەمۆی ژیانی شاعیرێکەوە، کە بە تەنها موڵکی خۆی نییە؛ موڵکی گەلێکە، کە بۆ یەکەمجار بە ڕوونی بە تێری وێنەی کوردبوونی خۆی لە ناو پەیڤ و شێعر و ترپەی ئەو شاعیرەدا دەبینێتەوە. شێرکۆ بێکەس سەرگوزەشتەی ئەو شاعیرە لە زاری خۆی و لە یادەوەری خۆیەوە بۆ نەوەکانی ئایندە دەچرێت، سەرگوزەشتەیەک کە خێرای کرد، بەر لەوەی مردن بگات گێڕایەوە، و بەو پەڕی میهرەبانییەوە پێشکەشی غەزەلنووسی کرد تا بڵاوی بکاتەوە.

لە ماوەی دوو ساڵی کارکردنی غەزەلنووس دا، وەک ناوەندێکی ئەدەبی و جێگەیەکی بچووکی کچان و کوڕانی لاو بۆ باسی ئەدەبیات، مامۆستا شێرکۆ ئامادەیی دیاری هەبوو، سێبەری قورسی ئەو بۆ هاوڕێیانی غەزەلنووس جێگەی دڵخۆشی بوو، چونکە ئەو دەیگووت: من دەمەوێت لەگەڵ لاوەکاندا کار بکەم، پێم خۆشە لەگەڵ غەزەلنووس کارم هەبێت، چونکە دەزانم ئەدەبی کوردی لە دەستی ئەم نەوەیە دایە..

هەنوکە؛ غەزەلنووس بە پەژارە و دڵێکی تەنگەوە ئەم بەرهەمە دەخاتە بەر دیدەی خوێنەران، چونکە بەر لە نەخۆشییەکەی و لە دوا سەردانی مانگی نیسانماندا بۆ لای، بریار وابوو بە ئامادەیی مامۆستا شێرکۆ و لە سەرەتای مانگی ئاب دا کتێبەکە بڵاوبێتەوە، بەڵام مەرگ خێرای کرد و مامۆستا شێرکۆی برد و دەرفەتی ئەومان نەبوو جارێکی دی پێکەوە لە دەوری مامۆستا لە غەزەلنووس کۆببینەوە.
ماوەتەوە بڵێین: غەزەلنووس شانازی بەوەوە دەکات، لە کارنامەی دوو ساڵی دا، دوو بەرهەمی مامۆستا شێرکۆی چاپ و بڵاوکردۆتەوە، بە ڕێزەوە ئەو نووسینەی بە ئاوی خۆڵەمێش نووسرا پێشکەشی کتێبخانەی کوردی دەکات.

ناوەندی غەزەلنووس

## خۆێنەری هێژا...

من بۆ خۆم لە دەمێکەوە شەیدای خۆێندنەوەی بیرەوەری و گێڕانەوەی یادەوەریی کەسە بە ناو و دەنگەکانی جیهان بووم. جا ئەو کەسایەتییانە؛ سیاسەتمەدار بووبن، یان فەرماندەی سەربازی، یاخود نووسەر و شاعیر و بیریار و ڕووناکبیر. وەلێ لە ناو ئەو دەیان کتێبی بیرەوەرییانەدا کە خوێندوومنەتەوە، دووانیانم هەرگیز بیر ناچێتەوە، یەکەمیان: یادەوەرییەکانی سیاسەتمەداری بەناوبانگی جیهان (ونستۆن چەرچڵ)ی ئینگلیز و دووەمیشیان: یادەوەرییەکانی شاعیری گەورەی شیللی و هەموو دنیا (پابلۆ نێرودا)، کە لەم ڕۆژانەدا نووسەر و وەرگێر کاک 'پێشڕەو حسێن' کردوویەتی بە کوردی و بلاوکراوەتەوە... لە ڕاستیدا چەرچڵ بە تەنها هەر سیاسییەکی بلیمەت نەبوو، بەلکو نووسەر و ئەدیبێکی دیاریش بوو، ڕەنگە باشترین بەلگەیش بۆ ئەم قسەیە ئەوە بێت، کە لە دوای بلاوبوونەوەی یادەوەرییەکانی لە پەنجاکانی سەدەی ڕابوردوودا خەلاتی 'نۆبل'ی ئەدەبی لەسەر وەرگرت. ئەمە لە کاتێکدا هەر لەو سەردەمەدا و لە جیهاندا بە دەیان ڕۆماننووس و شاعیری مەزن هەبوون، کەچی لەو سالەدا ئەو خەلاتەی نۆبلیان بەرنەکەوت. دیارە من لە ڕێی زمانی عەرەبییەوە ئەو بیرەوەریانەم خۆێندووەتەوە و عاشقیان بووم، بەلام ئەی ئەبێ

خوێندنەوەیان بە زمانە ئەسڵییەکانی خۆیان چ تام و چێژێکی زیاتر و بەهایەکی جوانتر و شیرینتریان پێ ببەخشن؟ سەرتاپای بیرەوەرییەکانی نیرۆدایش؛ کە دەستەواژەی (ئەشهەدو ژیام)ی بۆ کردووە بە ناونیشان، ئەوەندە تەلیسماوییە وەک ئەڵێن بە جۆرێک کەمەندکێشت ئەکات، کە ناتوانی خۆتی لێ دەرباز بکەیت، یان باشتر وایە بڵێم: خۆتت لە بیر ئەباتەوە و حەز ناکەیت و لە خۆشیاندا ناتەوێ کتێبەکە کۆتایی بێت و ئەتەوێت هەر درێژ بێتەوە و لە گەڵیا بژیت. ئەو کاتەی نیرۆدا قسە ئەکات تێئەگەیت تۆ لە بەردەم ڕووناکبیرێکی مەزندای، کە زانا و بیرمەند و مێژووناسە، جوگرافیا و سروشت و فەلەکناسە، ڕاستگۆیانە و ئازایانە و بێ پەردەپۆشی ژیانی خۆیت بە ڕووتوقووتی نیشان ئەدات و بە هەموو تاڵی و شیرینی و هەڵە و خەوش و هەورازونشێوێکەوە حیکایەتی ژیانی خۆیت بۆ ئەگێڕێتەوە. لە وەختی خوێندنەوەی ئەو بیرەوەرییانەدا ئەزانیت تۆ کەوتویتە چ زەریایەکی قووڵەوە. من بۆ خۆم تا ماوەیەکی زۆر ئەو یادەوەرییانەی نیرۆدام لە تەنیشت سەرینەکەمەوە دانابوو.

ئێمەی کورد تا ئێستا بە مانای وشە (ئەدەبی بیرەوەریمان) لە جێی نەبووانە، ئەگەر هەیشبن تاکوتەران. ئەوەی ڕاستیبێ سەبارەت بە خۆیشم، ڕۆژێ لە ڕۆژان بیرم لەوە نەکردبووەوە یادەوەرییەکانم بنووسمەوە، چونکە نە دەفتەرێکم هەبووە بۆ نووسینەوەی ڕۆژانەی یادەوەری و تەنانەت بە سەرەقەڵەمیش هیچ ڕووداو و بەسەرهاتێکی شەخسی و گشتیم تۆمار نەکردووە، ئەمە گەورەترین بۆشایی و هەڵەی ناو ئەم لاپەڕانەیە، بەتایبەتی بۆ ناوی خەڵک و شوێن و بۆنە و ئەو دیدارە ئەدەبییە گەورانەی کە لە سوید و ئەورووپادا بەشداریم تێدا کردبوون و بە دەیان کەڵەنووسەر و شاعیری بەناوبانگی جیهانم تێدا دیبوون. نووسینەوەی ڕۆژانەی یادەوەری وەک کۆکردنەوەی کەرەسەی خاو و خشت وایە بۆ بیناکردنی دیوار وماڵی یادەوەرییەکانت، یان ئەبنە کۆمەڵە کلیلێ بۆ کردنەوەی چەندین دەرگای تر. بەداخەوە من نە ئەو خشتانەم بووە و نە ئەو کلیلانەیش، بەڵام ئەی بۆچی و چۆن ئەم یادەوەرییانەم نووسی؟ لە هەڵکشانی تەمەندا خۆزگە و خەونەکان زۆرتر ئەبن، ڕابوردوو سێبەرێکە و لەگەڵتایە. ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ لە هاورێ نزیکەکانم سەریان کردە سەرم بۆ ئەوەی هەرچۆنێک بێ یادداشتەکانم بنووسمەوە، پێشم وتن: (وەلێ ناتەواو و پڕ لە کەلێن ئەبن!) وتیان (بەڵام دیسان هەر باشترە لەوەی کە هیچ نەنووسی) کەواتە من بە تەنها پشتم بە زەینی خۆم

خۆت سانسۆر لە سەر خۆت دابنێیت. بە بڕوای من هەتا گۆڕانی جەوهەری بەسەر دین و بڕگەکانی شەریعەتدا نەیەت، گۆڕانی گەورەیش بەسەر کۆمەڵدا نایەت. بۆیە ئەتوانین بڵێین: نووسینەوەی یادەوەری لە دنیای ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا، هەمیشە یادەوەرییەکی نوقسان ئەبێ؛ چ لە ترسی هەژموونە ڕەهاکەی "دین" و شەریعەت و چ لە ترسی کۆتوپێوەندەکانی دابونەریتی ناو کۆمەڵ خۆی. بەمجۆرە ئەم یادەوەرییانەی منیش لەو سڵەمینەوە و ترس و پەردەپۆشیانە خالّی نین.

من لە نووسینەوەی ئەم یادەوەرییانەدا هەوڵم داوە سنگفراوان لێبوردە بم، پەنا نەبەمە بەر جۆرێک لە تۆڵەسەندنەوە، یان بە واتایەکی تر؛ کای کۆن بە با نەکەمەوە، تەنانەت بەرامبەر بەو چەند کەسەیش، کە تا سەرئێسقان ئازاریانداوم، توومەتی ناڕەوایان بۆ دروست کردووم، بەلام من بۆخۆیشم هەڵەم هەبووە، کەسیش نییە لەم دنیایەدا بێ هەڵە بێت، بەتایبەتی ئەو تاکانەی لە نێو کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوودا چاویان کردووەتەوە و بە ڕێورەسمێکی نامۆ گۆشکراون. هەروەها ئەبێ ئەوە بڵێم؛ وەک شیعری جوانم هەیە، شیعری خراپیشم هەر هەیە. من هەرگیز لاریم لەوە نەبووە ڕەخنەم لێ نەگیرێ، یان قبووڵی ڕای پێچەوانەی بەرامبەرەکەم نەکەم، وەلێ ئەوەی لای ئێمە و تا ئەم ساتەوەختەیش "بالادەستە" ڕەخنەی جنێو و تانەوتەشەر و سووکایەتی پێکردنە، زمانی ڕقاویی ئیرەیی پێبردن و شێواندنە.

من بە درێژایی تەمەنی شیعریم بۆ ئەو هەموو تیروتوانج و بەردانەی تێمگیراون و گەلێ زۆریشن، لە چەند وەلامدانەوەیەک، کە لە پەنجەی هەردوودەست تێناپەڕن زیاترم نەبووە و ڕەنگە لە ئێستەشدا لە نیوەی ئەو وەلامانەی خۆم پەشیمان بم.

بێگومان وەک ئەزانن لە نووسینەوەی بیرەوەریدا هەر نووسەرێ شێوازی تایبەت بە خۆی هەیە. من هەوڵم داوە ئەوەندەی بتوانم کورت و پوخت بنووسم. درێژدادڕی نەکەم. هەوڵم داوە زیاتر بایەخ بە شتە پەراوێزخراوەکان و شتە بچووکەکان بدەم. لە سەر ئەزموونی ئەدەبی و شیعری خۆم زیاتر بوەستم. لە گەلێ لاپەڕەدا و لە هەندێ شوێندا گێڕانەوەکان شێوەی نیمچە پەخشانێکی ئەدەبییانەی وەرگرتووە، بۆیە خەیاڵیش هەمیشە لەم یادەوەرییانەدا ئامادەن و تێکەڵ بە واقیع ئەبنەوە. نوختەی هەرە لاوازی ئەم بیرەوەرییانە وەک پێشتر ئاماژەم بۆ کردبوو، هەندێ جار لەبیرچوونەوەی ناو و شوێن و ئەو کەسایەتییە

ئەدەبییە بەناوبانگانەی دنیا بوون، کە لە میهرەجان و سیمینار و کۆڕ و کۆبوونەوە زۆرەکانی ئەورووپادا ناسیومن و دواتر لە یادم کردوون و ناوەکانیانم بیرچووەتەوە. ئەوەندەی لە سەر مەسەلە ئەدەبی و هونەرییەکان قسەم کردووە؛ ئەوەندە لە سەر مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان نەوەستاوم، ئەگەرچی پشتگوێم نەخستوون. دیارە ئەوەی گرنگە درۆم لەگەڵ خۆم و هەڵوێست و قەناعەتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانمدا نەکردووە. بەداخەوە ئەم بیرەوەرییانە لە ڕۆژژمێرێک ئەچن چەندین پەڕەی لێ بوویێتەوە و لە دواییدا با بردبێ و تازە جارێکی تر دەست نەکەنەوە و نەدۆزرێنەوە. بە کورتی (زۆر)م بە دڵ نین؛ یان بە جۆرێکی وا (دەرنەچوون) وەک خۆم لە ناوەوەی خۆمدا خوازیاریان بووم. هەڵبەت ئەم یەکەم بەشەی یادەوەرییەکان لە ڕۆژی لەدایک بوونمەوە تا مانگی دەی ١٩٩١ هاتووە. پرسیارەکەی تر ئەوەیە؛ ئایا ئەتوانم "تەواویان" بکەم، یان هەر ئەمە ئەبن و هیچی تری بەدوادا نایەت؟ نازانم و هیچ بەڵێنێکیش نادەم بۆ ئەو تەواوکردنە، چونکە ئێستا بە تەواوی هەست ئەکەم بەوەی ساڵ لە دوای ساڵ باری تەندروستی و جەستەییم ڕوو لە کزی و داکشانە، کە دیارە ئەمەش شتێکی حەتمییە، بۆیە ئەترسم لەوەی بەڵێنێ بدەم و بۆیشم جێبەجێ نەکرێ.

لە دواییدا سوپاس بۆ هەموو ئەو ئازیزانەی هاوکارییان کردم، بە تایبەت نووسەر و ڕۆژنامەنووس کاک مەریوان عەلی؛ کە هەر لە سەرەتاوە تەواوی ئەم یادداشتانەی تایپ کردووە و بەشەکانی پۆلێن کردووە و ناونیشانی بۆ داناون و ڕێکی خستوون و لە سەرنج و تێبینییەکانی خۆی ئاگاداری کردوومەتەوە، دیسانەوە لە دڵەوە سوپاسی ئەکەم و هیوادارم تەندروست و تەمەن درێژ بێت. سوپاس بۆ کتێبفرۆشیی غەزەلنووس، کە ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم یادداشتانەی گرتووەتە ئەستۆ. سوپاسیش بۆ ئەو خوێنەرەی، کە بە بایەخەوە ئەم کارە ئەخوێنێتەوە و لە ڕاکانی ئاگادارم ئەکاتەوە و هەر بژین.

**شێرکۆ بێکەس**

سلێمانی- ٢٠١٣/٣/١٥

بەیانییەکی شوومی زستان، ڕۆژی وا ساردو بەسەرماوسۆڵەو تۆفو تووش کەم بینرابوو، من بۆ خۆم تاگەیشتوومەتە ئەم تەمەنە، ڕەنگە هەر چەند جارێ ڕۆژی واسەختم بینیبێ. بارێزەیەکی تیژی بەگڤەگڤو لوورەلوورو ئاسمانێکی خۆڵەمێشی تەواو نزمو ترسناک. لەو ڕۆژانەی کەس ناوێرێ سەر لەکون بێنێتەدەر .

لەو بەیانییە شوومەداو لەهۆدەو هەیوانێکی سەر مالاندا، (خانووی مەلا مستەفا لەشاری هەڵەبجەو ڕێک بەرامبەر شارەوانییە کۆنەکەی ئەوێ)، باوکە فایەق بێکەس لەهەڕەتی پیاوەتیو جۆشو خرۆشی نیشتمانپەروەرییو لەگەرمەی وەرزی شیعر نووسینی خۆیداو لەتەمەنی (٤٣) ساڵیدا، لەسەر دۆشەکێکی پەڕێ، دوای کۆکە گرتنێکی توند، دڵی گەورەی لەلێدان کەوتو ساردبووەو جارێکی دی هەڵنەسایەوە .

ئەو تاقە دکتۆرە سمێڵ قیتە میسرییەی لەهەڵەبجەدا بوو، وەختێ لەگەڵ کاک ئەحمەد میرزای ئامۆزای بێکەس-دا گەیشتنە ماڵەوە، سەماعەکەی نابەدڵییەوە، دوای چەند چرکەیەک لایبردو بەدەنگێکی نزم کوچی دوایی بێکەسی ڕاگەیاند !.

ئەو مردنە لەناکاوەی باوکم، سەرلەبەری ژیانی ئێمەی گۆڕی، دایکمو منو هەردوو خوشکەکەم، بێدالدەو بێپەنا ماینەوەو هەر ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی لە

حەوشەکەی خۆماندا بێکەسیان شتو کفنیان کرد، لەگەڵ تەرمەکەیدا، کە لەسەر پاسێکی بۆدی تەختە دابەسترابوو، روومانکردەوە شاری سلەیمانی. بیرمە بەو رۆژە سەختو لەو تۆفو کرێوەیەدا، خەڵکێکی زۆر لەقوتابیانو کاسبکارانو هەموو چینوتوێژەکانی شاری سلەیمانی، لەچاوەڕوانی گەیشتنی تەرمی بێکەس-دا کەسیرەو غەمبار ڕاوەستابوون. ئەو ساتەیش، کە لەگردی سەیوان نزیک بەگومەزەکەی شێخ مارفی نۆدێ بەخاک سپێردرا، بیرمە دوو کەس لەسەر گۆڕەکەی وتاریان خوێندەوە، کە هەردوو شاعیری هەڵکەوتوو و ئازادیخواز دیلانو کامەران بوون .

ئەو رۆژە شوومە (١٩٤٨/١٢/١٨) بوو، تەمەنم هەشت ساڵی پڕ نەکردبۆوە، لەپۆلی دووی سەرەتایی بووم .

تائێستەیش بەوردی دیمەنی ساتەوەختی ئەو مردنەی باوکم هەر لەپێش چاوە .

دایکم خەبەری کردمەوە، خەڵووزی ناو مقەڵییە گۆپکە زەردەکە گەشابوونەوە، ئەبوایە منیش وەک هەموو بەیانیانێکی تر، بچووما یە بۆ نانکڕین. باوکمو خوشکەکانم نووستبوون. بەڵام لەپڕ ئەو کۆکەیەم بیستو دایکم شڵەژاو پەلاماری باوکمیداو رایوەشاندو هەر ئەو ساتەیش هاواری لێکردم بچم بەشوێن کاک ئەحمەد میرزای ئامۆزایدا، کە هەر کۆلانێک لەولاترەوە بوونو ئیتر ئەویش هەر بەبیجامەو ڕۆبێکەوە پێشم کەوتو چوو دکتۆرە میسرییەکەی هێناو وەختێ خۆم کردەوە بەماڵدا هەندێ لەماڵە دراوسێکان کۆببوونەوەو دایکیشم هەر لەخۆی ئەدا. بۆ منیش ئەوە یەکەمجاربوو وا لەنزیکەوە ترسو سامی مردن ببینمو زراوم بچێ، لەنێوان بڕواکردنو نەکردندا سەرم گێژی ئەخواردو نەمئەزانی ئەوە چیبوو لەچرکە ساتێکدا هاتو ئەم ماڵەی ئێمەی هەژاند .

واقم وڕو حەپەسابووم، نەیشئەگریام. شیوەنی دایکمو قژڕنینەوەو سنگ کوتانی، ئەوەندی تر ئێمەی منداڵی تۆقاندبوو. ئەم مردنە نەئەچووە عەقڵی منداڵی منەوە. ئەو رۆژەو رۆژەکانی دواتر، یەکەمین پرسیاری بوونو نەبوونی لا وروژاندم، لە دڵی خۆمدا ئەموت: بۆچی باوکم مرد؟ مردن چییە؟ بۆ ئەمرین؟ !.

هەر ئەو رۆژەیش هەستمکرد چەند ساڵێ گەورەتر بووم، وەک لەناخەوە هەڵتەکابم وابوو، تووشی رامانێکی قوڵی خەماوی ببووم. لەوساتە بەدواوە حەزم نەئەکرد تێکەڵاوی دەوروبەربم! ئەمویست تەنیاو گۆشەگیربمو کەس

نەیەت بەلامدا. دایکم بەگەنجی و لەتافی جوانیی خۆیدا لێی قەوماو هەموو دەردەسەریی‌و مەینەتیی‌و بێوەژنکۆشی بۆ ئەو مایەوە .

دایکم ژنێکی ئازاو زیرەک‌و دەستڕەنگین‌و بەسەبر بوو، دەستەپاچەو مردەلۆخە نەبوو. وەک ئەڵێن: (لەهوویەک موویەکی ئەکردەوە)، لەسەر هەقی خۆی سوورو لەهیچ غەدرێک بێدەنگ نەئەبوو .

بیرمە زۆرجار لەگەڵ دایکی‌و خزم‌و کەسوکاریدا، لەسەر قسەیەکی ناهەق یان کارێکی ناجۆر ئەهاتە دەنگ‌و یەخەی ئەگرتن، قسە لەڕووبوو. دەموپل پاراو و وەختێ ئەو بدوایە ئەوانی تر بێدەنگ ئەبوون. دایکم خەمەکانی خۆی لەڕێی گاڵتەو پێکەنین‌و تەنزەوە بەبا ئەدا.

دوای تەواوبوونی پرسەی باوکم بەماوەیەکی کەم، لەگەڕەکی سەرکارێز هۆدەو هەیوانێکمان لەماڵی وەستا حەسەن-دا بەکرێگرت .

وەستا حەسەن؛ پیاوێکی کاسبی خێرخوازو دەستودڵ جوان بوو، باجی لەعلەی ژنی، کە تائەم دواییانەیش لەژیاندا بوو، لەژنە ڕووخۆش‌و دڵپاکەکان بوو، لەو لێقەومانەدا بوو بەیەکێک لەدەستە خوشکە هەرە نزیکەکانی دایکم، بۆ ئێمە خۆیی و وەستا حەسەن جێی پشت‌و پەنا بوون .

ئێمە؛ هەر لەمنداڵییەوە زیاتر تێکەڵی ماڵە خاڵووان بوین‌و لەخزمەکانی باوکەوە دوور بووین، مەگەر ساڵی جارێ دووجارێ لەجەژنەکان‌و هەندێ بۆنەی تردا ئەوانمان بدیایە. هەندێ لەو خزمانەی باوکم بووەو دەوڵەمەندبوون، بەڵام هیچ ئاوڕێکیان لەئێمە نەئەدایەوە. نەک هەر یارمەتییان نەئەداین، تەنانەت سەردانیشیان نەئەکردین !

مامە تایەر-یشم بێباک‌و خەمساردبوو، ئەگەرچی خۆی فەرمانبەرێکی بچووکی میری بوو، بەڵام ئەوکاتەی بەخت ڕووی تێکردو لەتە بیتاقەیەکی "یانسیب"ی ئەوکاتەی بۆ دەرچوو، واتە دوو هەزارو پێنج سەد دیناری ئەو سەردەمە، کە ئێجگار پارەیەکی زۆربوو، کەچی لەڕێی تاقە دینارێکی نەگرتین! هەمووجارێ کە بیر لەو ڕۆژگارە تاڵانەی ژیانی خۆمان و ئەو خۆپەرستی‌و چاوچنۆکییەی مامم ئەکەمەوە، هەناسەیەکی ئەوەندە سارد هەڵئەکێشم، خەریکم لەگەڵیا بتوێمەوە!.
لەناو هاوڕێکانی باوکیشما، ئەوەی ناوبەناوە ئێمەی بەسەر ئەکردەوەو یارمەتی ئەداین، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو .

تێکەڵی ئێمەو ئەم بنەماڵەیە، بۆ رۆژگاری دووری سەردەمی باوکم ئەگەرێتەوەو ئەم پەیوەندیی و خۆشەویستییەیش تائێستە بەردەوامەو وەفایەکە لەیادی ناکەین .!

نزیکەی هەشت ساڵ پێش ئەم کۆچە بێ وادەیەی باوکم، لەگەرمەی شەڕوشۆڕو ئاگربارانی دۆزەخە گەورەکەی جەنگی دووەمی جیهاندا، لەدووی مایسی (١٩٤٠)دا، لەشاری سلەیمانی گەڕەکی (گاوران) لەدایکبووم، مامانەکەم ژنە دیانێکی دراوسێمان بووە، جەمیلە خان، دایکی (کاکە نووری مەتی)، بۆ موبارەکیش هێشتا لەسەر کاسەی لەدایکبوون بووم بەکڵۆ خەڵووزێ نیشانەی خاچێکی لەسەر ناوچەوانم کێشاوە، دواتر لەگەڵ "جۆرج"ی کوڕیدا، منیشی گۆشکردووە، بەم پێیە، یەکەم برای شیریم کوڕە کوردێکی مەسیحی شارەکەم بووە. ئەم ڕێکەوتە، یەکەمین دەقیقەی ژیانمە، من بەڕێکەوتێکی پیرۆزو بەختەوەرانەی لەقەڵەم ئەدەم، کە نیشانەی تەبایی و خۆشەویستی دوو پەیامی ئاینی کوردستان و لەهەمانکاتدا رەتکردنەوەی هەموو جۆرە توندوتیژییەکە و مانای خۆشەویستی و پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی جیاوازییەکان ئەگەیەنێ.

لەباوکەوە، بنەماڵەی ئێمە، بەبن‌و بنەچە "قەڵاچوالان"ین، باپیرە گەورەمان، ئەلیاسە قوچە، لەگەڵ یەکەمین کاروانی رەوکردوودا، بۆبنیاتنانی شاری سلەیمانی، بارگەو بنەی خۆی پێچاوەتەوەو هاتۆتە سلەیمانی و بەئێجگاری لەشارە نوێیەکەی ئیبراهیم پاشادا نیشتەجێ بووە. تا شەست ساڵێکیش لەمەوبەر، لەسەروو گەڕەکی سابونکەران، ئەو دارتووە پەل‌وپۆدارە هەر بەپێوە بوو، کە بەدارەکەی "قوچە" بەناوبانگ بوو. باوکی باوکیشم "عەبدوڵڵا بەگ" کە بۆ خوێندن چۆتە ئەستەمبوڵ و سلکی سەربازیی هەڵبژاردووە، پێگەیشتووەو لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای بیست-دا کراوە بەقایمقامی عەسکەری ناوچەی شارباژێڕ، کە ئەوسا "سیتەک" مەرکەزی قایمقامییەت بووە.

باوکیشم، هەرلەوێ لەساڵی (١٩٠٥)دا لەدایکبووە. هەڵبەت ئەو نازناوی "بەگ"ە، روتبەیەکی سەردەمی عوسمانییەکان بووە، عەبدوڵڵا بەگ بەپلەو پایەدا هەڵئەکشێ تا ئەبێتە "میرال".. هاوڕێی مێژوونووسی بەناوبانگی کورد ئەمین زەکی بەگ بووە. لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقدا، ئەو وەختەی ئەمین زەکی و هاوڕێکانی بڕیاری گەڕانەوە ئەدەن بۆ عیراق، بەعەبدوڵڵا بەگ-یش ئەڵێن، بەڵام ئەو قایل نابێت و لە تورکیا ئەمێنێتەوە، دوا پلەو پایەشیی ئەبێتە پارێزگاری عەسکەری شاری مەرعەش و هەر لەوێش کۆچی دوایی ئەکات .

عەبدوڵلا بەگ؛ کچی نەبووە، سێ کوڕی بووە، حەمە سەعید، فایەق، تایەر، یەکەمیان لەتافی لاویداو لەڕووباری دیجلەدا ئەخنکێ !

لەدایکی باوکیشمەوە ئێمە لەتایەفەی ئاغالەرەکانی شاری سلەیمانین، حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا، لەخزمە هەرە نزیکەکانی باوکم بووە. لەدایکیشمەوە ئێمە لەتایەفەی "فاتمە غەزایی" هۆزی گەڵباخی-یەکانین .

قسەی دەماودەم واهاتووە، کە ئەم نازناوی "غەزایی"یە پەیوەندی بەو شەڕو جەنگانەوە هەبووبێت، کە لەنێوان هێرشی رووسەکان و بەرەنگاربوونەوەی دەسەلاتەکانی ئەم ناوچانەدا روویاندابێ و ئەم ژنەیش وەک ژنێکی ئیماندارو چاونەترس، لەو شەڕانەدا ڕۆڵی لەبەرچاوی هەبووبێ و دواتر ئەم غەزاییەی بەسەردا دابڕابێ. باو و باپیری دایکم وەستاباشی بەنا بوون. حەمامی پاشا لە هەڵەبجەو پردە کۆنە مێژوویی یەکەی "قلیاسان"ی نزیکی سلەیمانی، کە تا ئەو چەند سالانەی دواییش چەند تاقێکی مابوون، وەستا "حەسەن"ی باپیری دایکم رەنگی ڕشتوونو دروستیکردوون .

تێکەلاوبوونیشمان لەگەڵ جوولەکەکانی هەڵەبجەدا، هەر بۆ ئەو سەردەمە ئەگەڕێتەوە. واتە ئەو کاتەی، کە وەستا حەسەن لەهەڵەبجە خەریکی دروستکردنی حەمامی پاشا ئەبێ و بەسەر دیوارەوە خەریکی کارو گرتنەوەی نیمەخشت و بنکەشیکردن ئەبێتو ژنانی گەڕەکیش بۆ ئاوبردن دێنە سەر ئەو کانییەی تەنیشت حەمامەکە، وەستا حەسەن، بەتیری عەشقی ژنە جوولەکەیەک گرفتار ئەبێ، کە ناوی "ملوک" ئەبێت .

وەستا حەسەن نیازی دڵی خۆی ئەباتە لای وەسمان پاشاو، خانمی وەسمان پاشایش، ئەنێرێ بەشوێن "ملوک"داو ئیتر لەپاش چەند رۆژێ ژنە هەر لەماڵی پاشادا موسڵمان ئەبێ و وەستا حەسەن مارەی ئەکاتو هەر لەوێش ئەیگوێزێتەوە. هەڵبەت تاماوەیەک کەسوکاری ملوک هەموو پەیوەندییەک لەگەڵ ملوک-دا دائەبڕن، بەلام دواتر ئاشت ئەبنەوەو ئەکەونەوە هاتوچۆی یەکتر، لەدوا سالی ژیانی بێکەسداو ئەو وەختەی لەهەڵەبجەبووینو باوکم مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو. دێتەوە بیرم. ئەو جوولەکانە زۆر بەگەرمی هاتووچۆی لای ئێمەو دایکمیان ئەکرد. دیارە ئەو کاتە من نەم ئەزانی، ئەم ئامشۆ گەرمەی ئەوان لەچییەوە هاتووە! لەنێو ئەو ئامشۆکەرانەی ماڵی ئێمەدا، کچێکی بالابەرزی تێدابوو، ناوی (لولو) بوو، بەتەمەن چەند سالێک لەدایکم بچوکتر بوو. بۆ ئیشی ناوماڵو لەوەختی نانکردن و کاری پێویستی تردا

یارمەتی دایکمی ئەدا، گەرمترین شیوەنیش ئەوان بۆ بیکەس-یان گیرا. دوای کۆچکردنی بەکۆمەڵی هەموو جولەکەکانی کوردستانو عیراق بۆ ئیسرائیل. ئەوانیش رۆیشتنو هەڵەبجەیان بەجێهێشت .

لەو ساڵانەی دوایشدا دوای ئەوەی دایکم پێی خستە هەشتاکانی تەمەنەوە، دیسانەوە بەو بیرەوەرییانەی خۆیدا ئەچۆوەو حەزی ئەکرد بزانێ ئەو خزمانەی ئیسرائیلی چییان بەسەرهاتووە، بەتایبەتی بۆ لولو، بزانێ لەژیاندا ماوە یان نا؟. منیش کەوتمە سۆراخکردن و بەهۆی هاوڕێم کاک ئاواتی نامیق ئاغاوە، نامەیەکی دایکم کە بۆ لولوی نووسیبوو تەرجەمەی زمانی عیبری کراو گەیشتە ئیسرائیل و لەڕێی بەرنامەیەکی رادیۆوە بڵاوکرابۆوە. دوای ماوەیەک کاک ئاوات ئاگاداری کردمەوە، کە لولو ماوەو کەوتۆتە تەمەنەوەو نامەکەی دایکیشمی پێگەیشتووە، بەڵام سەیر ئەوەبوو، هیچ وەڵامێکی نەبوو. جا لەبەر هەر هۆیەک بووبێ، حەزی نەکردووە پەیوەندیمان پێوە بکاتەوە. ئیتر ئێمەیش بێدەنگیمان لێکرد.!

وەک خەونێکی پەرت و تەماوی دێتەوە بیرم. ئەو کاتەی فامم کردەوەو دایک و باوکی خۆم ناسی. ماڵمان لەگەڕەکی حاجی حان بوو. تەمەنم چوار ساڵ و نیو ئەبوو، لەم تەمەنەوە بەڕوونی یادەوەریم بێ گرێوگۆڵ لەبەرچاوە. لەو تەمەنەیش بەرەو خوارتر واتە لەنێوان دووساڵی و سێ ساڵیدا، دووترووسکەی دوورم دێنەوە بیر .

یەکەمیان لە دووساڵیدا، ئەو وەختە دایکم هەڵیئەبڕیم و لەکونێکەوە ئەیدامە دەست یەکێکی تر، جاران لەخانووە کۆنەکانی سلەیمانیدا و لەنێوان ماڵاندا، کونێک ئەکرایە دیوارو لەو ڕێیەوە بۆ هاودەنگی و ناردن و وەرگرتنی کەلوپەل و شتی پێویست، یەکتریان بەسەر ئەکردەوە. ئەوە لەماڵی نەنکم بوو، لەودیویشەوە ماڵی پوورم بووەو بەو جۆرە منیان وەرگرتوەو دواتریش بەهەمانشێوە منیان گەڕاندۆتەوە .

دووەم یادەوەریم لەتەمەنی سێ ساڵاندایە، باوکم ئەو ساڵە، لەقەرەداخ مامۆستا بووە. لەسەر پردێکی تەختە بوو، چوار پێنج قازێ پەلاماریانداومو بەدەمدا خستویانم و لووتم بریندار بووە. هەتا ئێستەیش جێی ئەو برینە وەک نیشانەیەک بەلووتمەوە دیارە .

لەتەمەنی پێنج ساڵیداو هەر لەسلێمانی و گەڕەکی حاجی حان بووین، باوکم لەقوتابخانەی مەلکەندی سەرەتایی مامۆستا بوو. گەلێ جار ڕۆژانە دەستی ئەگرتم و لەگەڵ خۆیدا ئەیبردم بۆ قوتابخانەو لەپۆلی خوێندندا لەتەنیشت قوتابییەکەوە دای ئەنام‌و منیش گوێ قولاغ ئەبووم. بیرمە ئەو شتەی کە زۆر پەستی ئەکردم لەو هاتوچۆیەدا، ئەو منداڵە ورتکانە بوون کە لەپشت باوکمەوە ئەڕۆیشتن‌و وەک ئەو دەستیان ئەخستە پشت پاشوویان و ورگیان دەرئەپەڕاندو لاسایی ئەویان ئەکردەوە. لەنێو پۆلیشدا تائێستەیش دیمەنی هاتوچۆی باوکم‌و دەرس وتنەوەیی و دارەکەی دەستی و پێکەنین‌و تووڕەبوونیم هەر لەپێش چاوە. هەر لەو تەمەنەیشدا بوو، ئەگەر شەوێ لەماڵەوە بوایە شیعرەکەی خۆی:

" تۆ چیت؟ من کوردم .

خۆترسنۆک نیت؟ !

نەخێر نەبەردم .

چی تۆی زەبوون کرد؟!

دوو دڵی و نیفاق.

چۆن رزگار ئەبی؟!

هەر بەئیتیفاق"ی

پێ لەبەر ئەکردم. هەر لەو سەرودەمەیشدا بوو، گەلێ جار ئەفەندییەکی سدارە بەسەر ئەهات بۆ ماڵمان و لەگەڵ باوکمدا دائەنیشتن‌و قسەیان ئەکرد. دواتر زانیم ئەو پیاوە بەختیار زێوەری شاعیر بووە .

دوکانی سەوزە فرۆشەکەی گەڕەکی خۆیشمان لەئێمەوە نزیکبوو، ئەگەر بێکەس شەوێک لەماڵەوە بیخواردایەتەوە، بەتایبەتی لە زستاندا، ئەیناردم بۆ ئەو دوکانە تا تووری بۆ بکڕم. من بەدیارییەوە دائەنیشتم‌و ئەویش بەدەم خواردنەوەوە شیعرەکانی خۆی ئەخوێندەوە. منیش خواخوام بوو زوو لێبێتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی دەنکە شقارتەیەکم بۆ ئاگرداو بیخاتە ناو شووشەکەوەو کڵپەیەکی شینی ببینم .

هەر لەو ساڵەیشداو لەوەرزی هاویندا بوو، ئێمە چووبووین بۆ ماڵی نەنکم، شەو تۆزێ درەنگ گەڕاینەوە، وەختێ گەیشتینە بەردەرگا، دایکم هاوارێکی لێهەستاو وتی: (قفڵەکە شکاوەو دز هاتۆتە سەرمان..!). وەختێ چووینە ژوورەوە

تەماشامانکرد، راستە، هەندێ شت کۆکراونەتەوەو نوێنەکان خراونەتە جاجمێکەوەو شەتەک دراون، بەڵام فریای بردنی نەکەوتوون. دایکم زۆر شڵەژابوو، نیو سەعاتی پێنەچوو بەدەم گۆرانی و دەنگی "عەلی مەردان"ەوە، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا، کە باوکمیان هێنابۆوە، گەیشتنە لامان، دایکم تووڕە ببوو. وا دیاربوو کە پێی ئەوت تۆ لەبەزمی خۆت ناکەوی و ئەوەتا دز هاتۆتە سەرمان! باوکیشم دیاربوو پێکەنینی بەو قسانە ئەهات‌و وەک دواتر دایکم بەدوورو درێژی بۆیگێڕامەوە وتبووی (دز؟ ئەوە چ دزێکی نەگبەتە هاتۆتە سەر ئێمە!). هەردوولا شیپانی دەرگای حەوشەی خستبووە سەر پشت، بەخۆیی و عەلی مەردان‌و ئەو چەند کەسەی تر ئەو کەلوپەل‌و دەستە نوێنەی دزەکان پێچابویانەوەو هێنابوویانە دەرەوە بۆ کەلاوەکەی ئەو بەرمان و باوکیشم چووبووە سەر شوێنێکی بەرزو هاواریکردبوو (ئەی دزی نەگبەت وەرەو مەمنونت ئەبم ئەم سەروەت و سامانەم لەکۆڵ کەرەوە!). بیرمە هەر لەوماڵەدا گەزیزەی خوشکم لەدایکبوو، فریشتە-یش کە لەقەرەداغ لەدایک ببوو، تازە تەمەنی ببوو بەسێ ساڵان.

گەڕەکی حاجی حان و پیرمەسوور لەژیانی منداڵیی مندا، ئەو نیشتمانە بچکۆلەیەن، کە جێی یەکەمین خەون و یادگارو یارییەکانی منداڵی و هێلانەی باڵەفرێم بوون. دیسانەوە جارێکی تر لە تەمەنی دە ساڵیدا، دوای مردنی بێکەس، لەگەڕەکی سەرکارێزەوە هاتینەوە هەمان گەڕەکو نزیک بەماڵە کۆنەکەمان و لەناو دراوسێ دێرینەکاندا خانوویەکی ترمان بەکرێ گرتەوە .

رەنگە دواتر لەگێڕانەوەی ئەم بیرەوەریانەدا دوورو درێژتر باسی ئەم گەڕەکە خۆشەویستە و ئەو ماڵەی ترمان بکەم .

## جزدانەکەی بێکەس و
## ئەفسانەی بووک و خەسوو!..

لەساڵی (١٩٤٦-١٩٤٧)دا ڕۆژێکیان کەلوپەلی ماڵ پێچرایەوەو هەموومان سواری پاسێکی تەختەی شەقو شڕ بووینو ڕوومانکردە دەرەوەی شار. باوکم نەقڵی سورداش کرابوو. چیای بەردین و سەختی چەرماوەند و ڕەوەزو لوتکەی شاخە سەرکەشەکەی "پیرەمەگروون"و مێرگە پاراوەکانی دۆڵی سورداش و داروباری کۆتەڵ و ئەشکەوتەکەی هۆمەرقەوم و نواڵەو دەشتی بەگیا و گوڵی بەهارانی کانی خانو کانی ساردو تابین، ئەو دیمەنە دڵگیرو ئەفسووناوییانە بوون، وەک سەرسامیان ئەکردم، خەیاڵیشیان ئاو ئەدام و شەوانەیش دەبوونە مایەی خەونی ڕەنگاوڕەنگی منداڵی و لەتەک حیکایەتەکانی دایکمدا، پوورەهەنگی دەیان پرسیاریان لەشانەکانی مێشکە بچکۆلەکەمدا دەوروژانو، یەکەمین گەرای خۆشەویستیی سروشتی کوردستان و زمانی شیرینی کوردیو شیعریان لەدڵما دانا .

بەشاخەکەی پشت سەری سووورداشەوە، دوو تاشە ڕەوەزی دیار کە سروشت شێوەی دوو مرۆڤی پێبەخشیبوون و وەک ڕێبکەن بەو جۆرە ئەنوێنن، خەڵکی ئەفسانەی بووکو خەسووی بۆ خوڵقاندون، کە خودا غەزەبی خۆی بەسەردا باراندونو لەوێدا کردوونی بە بەرد.

ئەم ئەفسانەیە بوو بە مەراقمو هەموو جارێ کە سەیری شاخەکەم ئەکردو ئەمبینین، لەدڵی خۆمدا ئەموت لەوانەیە خوا جارێکیتر بیانکاتەوە بە ئینسانو بێنە خوارێ و خۆیان بکەن بەماڵی ئێمەدا !

هەر لەسورداشیش کاتێ پێمنایە تەمەنی حەوت ساڵانەوە، خرامە پۆلی یەکو لەوێوە یەکەم هەنگاوی ناودنیای حەرف و وشەو ژمارەم هەڵهێنا، دەفتەرو قەڵەمو کاغەزم ناسیو پەنجەکانم کەوتنە گاگۆڵکێ کردنو لەدنیای بەرچاوڕۆشنی قوتابخانەدا، سەرەتای دەستپێکردنی گەشتی تەمەنی شیرینو تاڵی ژیان، ئاواتو ئازار، لەوێوە سەرچاوەی گرتو وەک رووبارێ بەرەو خوار بۆوە .

باوکم بەر لەسورداش لەناوچەکانی بازیانو چەمچەماڵو هەورامان و قەرەداغ-یش ببوو. ئێمە ماڵ بەکۆڵ بووینو هەمیشەیش هەر کرێچی بووین. دوای باوکیشم هەر ساڵ و دوو ساڵێ لەگەڕەکێ بووین، حاجی حان و سەرکارێزو سابونکەرانو سەرشەقام، تاسەرەتای شەستەکان کە ئیتر خانوویەکی "ئیسکان"مان وەرگرت و لەوگەڕەکەدا جێگیربووین .

ئەو ساڵەی لەهەڵەبجە بووین تازە چووبوومە پۆلی دوو، باوکیشم کە هەر مامۆستامان بوو، قرائەتی عەرەبی پێ ئەوتینەوە، لەهەموو قوتابییەکانی تر زیاتر لەمنی ئەپرسییەوە، ئەگەر شتێکیشم نەزانیایە سزای من، لەوانی تر زۆرتر بوو. بەیانیان لەگۆڕەپانەکەی مەکتەبدا، ریز ئەکراینو چەند سروودێکمان ئەوت و ئینجا ئەچووینە ناو پۆلەکانمانەوە. هەنێ لەو سروودانەی وەکوو شاخی گۆیژەو، ئەی دلێران بێچووە شێران، خوایە وەتەن ئاواکەی و ئەی کوردینەو مەردینەو.. هتد، ئەو دڵۆپە شیعرانە بوون، کە بۆ یەکەمجار بەبیری کوردایەتی گۆشیانکردم!. بەلام لەمانای هەندێ وشەشیان نەئەگەیشتم! لەسروودەکەی زێوەردا، کە ئەڵێت: "کورد میللەتێکی قەدیمە".. تا ئەو شوێنەی کە ئەڵێت "لەمەعاریف بەجێماوە!" لەدڵی خۆمدا ئەموت :"باشە ئەوە دائیرەی مەعاریفەو ئیتر بۆ بەجێماوە."!

هەر لەهەڵەبجە بوو، بۆ یەکەمجار هەستم بەوەکرد کە باوکم ناتوانێ و نییەتی وەک هەندێ باوکی تر ئەوەی حەزی لێبکەم بۆم بکڕێ! چونکە جارێکیان بردمی بۆ ماڵی ئەنوەر بەگی جاف و لەوێ کوڕەکەی کە هەر لەتەمەنی خۆمدا ئەبوو، پایسکیلێکی سێ پێچکەیی هەبوو، لەو سەردەمەدا مەگەر هەرماڵێکی وابووە توانیبێتیان پایسکیل بۆ منداڵەکانیان بکڕن .

بەدیارییەوە ئەوق ببووم. ئای کە مەرایی مندالانەم کرد تا ڕێگەیدام چەند دەقیقەیەک سواری ئەو پاسکیلەبم .

مووچەی مامۆستا شتێکی وانەبوو، ئەوەی بێکەس بیری لێنەئەکردەوە پارەو پوولو مالی دنیابوو. دوای مردنیشی وەک دایکم بۆیگێڕامەوە، جزدانەکەی شەش حەوت پەنجایی و چەند فلسێکی تیابوو. هەر لەوێش هەندێ زولم و زۆری ئاشکرام بینی و پەستو بێزاری کردم .

ئێمە هەموو قوتابی بووینو کورد بووین، بەلام هەندێ لەقوتابییەکان ئازاری کۆمەلێ قوتابی تریان ئەداو لێیان ئەدانو دەفتەرو کتێبەکانیان ئەدڕاندن، لەبەر ئەوەی جوولەکە بوون! دیارە ئەو مندالانە لەلایەن باوکو کەسو کاریانەوە راسپێردرابوون! لەمالەوە کە ئەمەم بۆ باوکم گێڕایەوە وتی (تۆ نابێ کاری وابکەی، چونکە هەموویان براتن..).

کە هاتینەوە سلەیمانی لەمەکتەبی فەیسەلییە وەرگیرام، مامۆستا جەلال سەیفوللا کە بە مامۆستا جەلالی مەلا کاکە حەمە بە ناوبانگ بوو، بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو. لەوسەردەمەدا ئەم قوتابخانەیە لە قوتابخانە هەرە باشەکانی شاری سلەیمانی بوو. تا پۆلی شەشم تەواوکرد هەر لەوێ بووم. بیرمە یەکەم مامۆستا کە هاتە پۆلەکەمانەوە (عەزیز شالی) بوو، پیاوێکی قۆزی چوارشانەو بەهەست، خێرا خێرا بەژوورەکەدا ئەمسەرو ئەوسەری ئەکرد، بەقەلەمێکی سوور نیشانەی باشو خراپی لەسەر دەفتەرەکانمان دائەنا. لەقۆناغی سەرەتاییدا، من نەقوتابییەکی زۆر زیرەک بووم و نەتەمەلیش! مام ناوەندی بووم. لەوانەکانی مێژوو جوگرافیاو پەروەردەو کوردیو عەرەبیدا زۆر باش بووم، بەلام لەحسابدا تابلێی کۆلەواربووم. چونکە یەکێک بوو لەو دەرسانەی حەزم لێنەئەکردو ڕقم لەمامۆستاکەیشی ئەبۆوە. لاموایە جەزرەبەی لێدانو دارەکانی وایانکردبوو تووشی جۆرێک لەنائومێدیم بکەن بۆ ئەوەی فێری نەبم. ئەم کۆلەوارییە لەماتماتیکدا درێژەی کێشا تاناوەندی پیشەسازیشم تەواوکرد. یەکێک لە نەریتە جوانەکانی مەکتەبی فەیسەلییە، کە دیارە فەزلەکەی بۆ مامۆستا جەلال سەیفوللا ئەگەڕێتەوە، ئەوەبوو هەموو سالێ وێنەگری بەناوبانگی ئەوکاتە بەخۆیی و کامێرا قاچدارەکەیەوە ئەهاتو پۆل بەپۆل وێنەی قوتابیانو بەڕێوەبەرو مامۆستاکانو وەرزشکارانی ئەگرتو بەوجۆرە جوانترین ئارشیفی بۆ ئەو قوتابخانەیەو نەوە لەدوای نەوەی ئەمشارە جێهێشت .

ئەگەر بێکەس نەبوایە،
راپەڕینیش نەدەبووا..

لەتەمەنی هەشت نۆ ساڵانداو هەر لەگەڕەکی سەرکارێز، هاوڕێ نزیکەکانم ئەنوەر ئەحمەد سەیفوڵڵا و فاروقی مەلا مستەفا و ئومێد ڕەشید بوون.ماڵەکانیشمان لەیەکەوە نزیک بوون. ئومێد بەسەزمان بوو لەئێمە نەئەچوو، لەخێزانێکی بووەو دەوڵەمەندبوو. ئێمەیش بزێوو گلاراو بووین. هەر لەهاوینێکی ئەو ساڵەدا بۆ ئەوەی تۆزێ دابینمان بکەن‌و لەو گلاراوییە دوورمان بخەنەوە، منو فاروق-یان برد بۆلای مامۆستا نەجمەدین مەلا، گوایە لەپشووی هاوینیشدا بخوێنین. دەستیانگرتین‌و دوو دۆشەکەڵەیشیان بۆ هێنابووین، بەکورتی و پوختی بەمامۆستا نەجمەدین مەلایان وت: (گۆشتیان بۆ تۆو ئێسقانیان بۆ ئێمە). هەر یەکدوو ڕۆژمان خۆشبوو، ئەوێشمان شڵەژان! فاروق لەمنیش بزێوتر بوو. بیست سێ قوتابییەک ئەبووین. مامۆستا مقەبایەکی بەپەتێکەوە هەڵواسیبوو لەمدیوی نوسرابوو: "هاتەوە" لەودیویشی "نەهاتەوە !"

ئەمە بۆ ئەوەبوو ئەگەر قوتابییەک چوو بۆ دەستَ بەئاو گەیاندن، مقەباکەی هەڵئەگێڕایەوە سەر "نەهاتەوە".. کە ئەیشهاتەوە ئەیخستەوە سەر "هاتەوە". ئەوسا یەکێکی تر بۆی هەبوو بچێتە دەرەوە. بەڵام فاروق ئەم کارەی تێکوپێکدا، هێشتا ئەو کەسە نەهاتبۆوە، ئەم ئەیخستە سەر "هاتەوە" بەمجۆرە جاری واهەبوو دە قوتابی لەدەرەوە بوون‌و مقەباکەیش هەر لەسەر "هاتەوە" بوو. تا

ڕۆژێک مامۆستا هەردووکمانی لەقافدا گرتو کەوتە بێزارکردنمان، بەڵام ئێمەیش دۆشەکەڵەکانمان خستە بنهەنگڵ و بۆی دەرچووینو لەدەرەوە لەسەر بەرزاییەکی بەرامبەر بەژوورەکەی مامۆستا دەستمانکرد بەهاوار هاوار و هەڵڵاو زەنایەک ئەو ناوەمان خرۆشانو دۆشەکەڵەکانیش هەر لەبن دەستماندا بوون، ئیتر ماڵیشەوە ناچاربوون وازمان لێبێنن .

ئەنوەر؛ منداڵێکی زیتو بیری بۆ شتی سەیر ئەڕۆیشت، کاک ئەحمەدی باوکی دوکانێکی پێڵاوفرۆشی لەناو بازاڕ هەبوو. ئەنوەر ئەهات لەمقەبا پێڵاوو جانتای دروست ئەکردو بەمنداڵانی ئەفرۆشتەوە، بێگومان عومری ئەو پێڵاو و جانتایانە لەیەکدوو دەقیقەیەک تێپەڕی نەئەکرد .

مەلاو مجەورو نوێژکەرانی مزگەوتەکەی مەلا مستەفایش دادوبێدادیان بوو لەدەست فاروقو منو ئەنوەر .!

لەم بیرەوەرییانەدا بەر لەوەی بەرەو ژوورتر هەڵکشێم، ئەبێ جارێکی تر بۆ ئەو ڕۆژگارانە بگەڕێمەوە، کە باوکم هێشتا لەژیاندا بوو، تا باسی دوو دیمەنی تر بکەم، کە هەرگیز لەبیرم ناچنەوە.

یەکەمیان ...

ئەو کاتەی لەسورداش بووین، باوکم بەتەنیا سەردانی سلەیمانی ئەکرد، لەیەکێک لەو سەفەرانەدا منیشی لەگەڵ خۆیدا برد. لەو سەر کاتێ گەڕاینەوە، هەر بەهەمان پاسی تەختە. لەناو پاسەکەدا مەلایەکی مێزەر سپیشی تێدابوو. لەڕێگە باوکمو ئەو مەلایە بوو بەدەمەقاڵێیان! دیاربوو دەمەقاڵێیەکە گەرمو تا ئەهات توندوتیژ ئەبوو. نەمئەزانی مەسەلە چییە، هەر ئەوەندەم لەبیرە باوکم زوو زوو ئەیوت: "مەلا عەقڵی خۆت بگۆڕە!". دواتر لەعومرێکی هەڵکشاوتردا، تێگەیشتم، شیعرەکەی بێکەس "ئەی مەلا تووبی خودا لەم فیکرە کۆنەت لابدە/ فەننی تازەم پێنیشاندە بۆ تەرەقی و ڕێی نەجات" لەوێوە، لەو سەفەرەوە، سەرچاوەی گرتووەو لە دەمەقاڵێی نێو پاسەکەوە ئەو شیعرەی بۆ هاتووە.

دووەمیان...

لەچلەی مێژوونووسی گەورە ئەمین زەکی-دا بوو. لەباخچەی مەعاریف، بەرامبەر مزگەوتی گەورە، کە بەڕاستی یەکێک بوو لەباخچە جوانەکانی شاری سلەیمانی، لەوێ جێگە چاککرابوو. تەختەبەندێکی تۆزێ بەرز، وەک شانۆ ئامادەکرابوو، ئەوانەی وتارو شیعریان هەبوو، یەک لەدوای یەک ئەچوونە

سەرەوە، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، لەو چلەیەدا پیرەمێردو بێخودو سەلامو چەند شاعیرێکی تریش شیعرو وتاری خۆیان خوێندەوە .

گەلێ جاریش لەماڵەوە باوکم ئەدی بەپاڵکەوتنەوە کتێبی ئەخوێندەوە، بەرگی کتێبێکیان کە وێنەی مانگێک "هیلالێکی" لەسەر کرابوو، سەرنجی بۆلای خۆی ڕائەکێشام. دواتر زانیم کە ئەو کتێبەیش گۆڤاری "الهلال"ی بەناوبانگی میسری بووە. باوکم لەماڵەوە کتێبخانەی نەبوو. تەنها کۆمەڵێ کتێب بوون لەناو باوەڵێکی تەنەکەدا هەڵگیرابوون .

بێکەس جگەرەی ئەکێشاو لەماڵیشەوە دیزداشەی لەبەر ئەکرد، من قەت بیجامەم لەبەردا نەدیوە. پێستی سپی بوو، دەموچاوی لەئەنجامی نەخۆشی ئاوڵەوە کونج کونج ببوو. تەنیشت چاوی ڕاستی، پەڵەیەکی سووری پێوەبوو، دواتر دایکم پێی وتم: (ئەو پەڵە سوورە بەجەزرەبەی لوولە تفەنگ لەڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠-دا وایلێهاتووە) .

بێکەس هەر شاعیر نەبوو. پیاوێکی قسە خۆش و دەموپل پاراوو بەهەڵوێستو ڕووبەڕوو بێ پێچ و پەنا قسەی خۆی کردووە، جا بەرامبەرەکەی هەر کەسێ بووبێو هەر پلەو پایەیەکی هەبووبێت. بێکەس یەکێک بووە لەپێشەنگی ئەو ڕووناکبیرانەی لەسەردەمی خۆیدا بڕوای بەمافی یەکسانی ژنو پیاو هەبووە. شیعری "نەسرین دەمێکە"ی ڕەنگدانەوەی ئەو هەستو هۆشەیە بەرامبەر ئازادی ژنو بەشداریکردنی لەبنیاتنانی کۆمەڵێکی پێشکەوتوودا .

مامۆستا برایم ئەحمەد، کە یەکێک بوو لەهاوڕێ هەرە نزیکەکانی بێکەس، لەدانیشتنێکدا بۆی گێڕامەوەو وتی (ئەگەر بێکەس نەبوایە ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولی (١٩٣٠) نەئەبوو! ئەو لەئێمە بەتەمەن تر بوو. بەچەند ڕۆژێ بەر لەشەشی ئەیلوول، بێکەس و ڕەشۆل و سەعید دارتاش و چەند کەسێکی تر کەوتنە ناو بازاڕەوەو هانی کاسبکارانو خەڵکیان ئەدا بۆ ئەوەی ڕاپەڕن و دژی حکومەتی عێراق خۆپیشاندان بکەن، ئەوە یەکەمجار بوو شەقامی شار هەڵسێتە سەرپێ و بێکەس سەرقافڵەی خەڵکەکە بوو. هەر ئەو ڕۆژەیش بریندارکراو گرتیان و خستیانە زیندانەوە) .

مامۆستا برایم، لە درێژەی قسەکانیدا وتی (وەختێ بێکەس ئەگرن و ئەیبەن بۆ زیندان، لەبەردەمی دەرگاکەدا، ڕیزێ پۆلیس ئەبینێ کە هەموو لەڕۆژی ڕاپەڕینەکەدا سەریان شکاوەو بە سارغی سپیی بەستویانن، ڕوویان تێئەکاو

پێیان ئەڵێن: "سەگبابینە خەڵکی تر ئەبێ دوانزە عیلم بخوێنێ و ئینجا مێزەری سپی ببەستێ! من بەچەند سەعاتێ هەمووتانم کرد بەمەلا!". هەر لە زیندانیشدا شیعرە بەناوبانگەکەی "ئەی وەتەن" ئەنووسێ) .

لەبارەی خوێندنەوەی شیعری (٢٧) ساڵەکەیەوە بەرامبەر بەئەدمۆنسی موستەشاری ئینگلیز لەعێراق، مامۆستا برایم گێڕایەوەو وتی (چاکم لەبیرە، نمەنمە باران ئەباری، سواری عەرەبانەیەکی دوو ئەسپی بووینو وتمان لێخوڕە بۆ گردی مامە یارە. ئەوەیشمان ئەزانی لە نەورۆزدا "نەورۆزی ١٩٤٦" ئەدمۆنس سەردانی سلەیمانی ئەکات، ئەوکاتە مەعروف جیاوک موتەسەریفی سلەیمانی بوو. لەڕێگە پێش ئەوەی بگەین بێکەس ڕووی تێکردین و وتی "ئێ باشە وامن ئەو شیعرە ڕووبەڕووی ئەدمۆنس ئەخوێنمەوە. بەڵام ئەی ئەگەر لەوەزیفە دەرکرامو گیرام! ئەی ماڵ و منداڵەکەم؟! مامۆستا برایم وتی: پێموت "ئەوەیان بۆ من بەجێبێڵە .!"

گەیشتینە گردی مامەیارە. خەڵکێکی زۆر کۆببوونەوە، لەڕیزی پێشەوە ئەدمۆنس و مەعروف جیاوک و ئەشراف و بازرگانی شار دانیشتبوون، کە پیرەمێرد ئێمەی بینی هاتو وەک دڵی ختوورەی شتێکی کردبێ، ڕوویکردە بێکەسو پێیوت: "چۆنە هاتوویت؟ خۆ لێمان تێکنادەی؟!". ئەویش پێیوت : "نا حاجی مەترسە هیچی وانییە!" بەهەرحاڵ دوایی وتی: "سروودی (بەخێربێن ئێوەو نەورۆز و بەهار/ دوا ڕۆژمان ئەوێ لەگەورەو سەردار) دیارە (گەورەو سەردار) مەبەست لەئەدمۆنس و گەورە پیاوانی حکومەت بووە. لێرەدا لەمامۆستام پرسی "شیعرەکە هی کێ بوو؟!" وتی: "شیعری ا. ب. هەوری بوو .!"

دەستکرا بەخوێندنەوەی وتارو شیعری تر، تا دەرفەتەکە هەڵکەوتو بێکەس چووە پێشەوەو بەردەمی مێزەکەی ئەدمۆنس و یەک دوو مەترێ دوور لەوەوە دەستیکرد بەخوێندنەوەی تەواوی شیعری (٢٧) ساڵە .

گەڕایەوە لامانو مقۆمقۆو شڵەژانێ کەوتە ناو ڕیزەکەی پێشەوە. ئەدمۆنس و مەعروف جیاوک هەڵسانو ڕۆیشتن. ئێمەیش ئەوەندە نەماینەوەو گەڕاینەوە بۆ ناوشار. پاش ڕۆژێک مەعروف جیاوک ناردبووی بەشوێن بێکەسداو پێی وتبوو: "بۆچی واتکرد؟!" ئەویش وەڵامی دابۆوە: "لەبەر ئەوەی ئەبوو وابکەم!". بەکورتی دوای ماوەیەکی کەم بێکەس نەقڵی (حلە) کراو دوورخرایەوە) .

بێکەس ساڵ زیاتر لەحلە ئەمێنێتەوە، یەکێک بووە لە مامۆستایانی زمانی عەرەبی‌و هەر ئەو دەرسەیشی بەقوتابیان وتۆتەوە. ڕۆژێ لەحلە موفەتیشێ ئەچێتە پۆلەکەیەوە. ئەیەوێ بزانێ ئەم مامۆستا کوردە چۆن چۆنی دەرسی عەرەبی ئەڵێتەوە! زۆر ڕائەوەستێ و ناتوانێ هیچ هەڵەیەکی لێبگرێ، بەرلەوەی بێتە دەرەوە. ڕوو ئەکاتە بێکەس‌و پێی ئەڵێ: "ساعە شکت؟" ئەویش وەڵامی ئەداتەوە "العفو.. ماعندی ساعە" موفەتیشەکە بەگاڵتەپێکردنەوە پێی ئەڵێ "هلا هلا معلم و ماعندک ساعە!." ئەچێتە دەرەوە .

کە دەوام تەواو ئەبێ و بێکەس ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ ناوشاری حلە، لەبەردەرگا موفەتیشەکە ئەبینێ ڕاوەستاوە. ئەچێتەبەردەمی "بلا زحمە ماتوصلنی للمدینە" ئەویش ئەڵێ: "واللە ماعندی سیارە" بێکەس-یش پێی ئەڵێ "هلا هلا مفتش و ماعند سیارە!". بەوجۆرە هەقی خۆی لەجەنابی موفەتیش ئەکاتەوە.!

هەر لەهەمان دانیشتندا مامۆستا برایم گێڕایەوەو وتی (لەسیەکان و سەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابوردوودا،ماڵی بازرگانێکی سوخۆرو مشەخۆر هەبوو لە سلێمانی، زۆرجار شەوانە ڕوومان تێئەکرد. هەندێک قوماریان ئەکردو هەندێکی تر ئەیانخواردەوە، بۆ بازرگانی سووخۆریش گرنگ ئەوەبوو واری خۆی وەربگرێ. هەڵبەت ئێمە بەر لەوەی بچین هەرچی پێداویستی دانیشتن هەبوو بۆ ئەو ماڵەمان ئەنارد. سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهان بوو، نەخۆشی مەلاریا ناوچەی شارەزووری پەرێشان کردبوو. تازەیش حەبی (M. B )پەیدابووبوو. ئەم بازرگانەیش یەکێک بوو لەوانەی بازرگانی بەو حەبانەوە ئەکردو بەگران بەو خەڵکە هەژارەی ئەفرۆشتەوە .

بێکەس ئەمەی زانیبوو، ئێوارەیەکیان دوای دانیشتن بەکابرای وت "ئەرێ فلان ئەڵێی حەبی(M. B) ، ئەم داهێنانە تازەیەی پزیشکیت لادەست ئەکەوێ، حەز ئەکەم ببینم، بزانم شکڵ و ڕەنگی چۆنە؟!". کابرایش "ئەڵێ بەڵێ فایەقە فەندی هەمەو یەک دەقیقە بابچم بۆتبێنم". ئەڕوات و کەدێتەوە لە شووشەیەکی بچووکدا کە چوار پێنج حەبێکی تێدا ئەبێ، ئەیداتە دەست بێکەس‌و ئەشڵێت "ئەمەیە حەبی .(M. B)" بێکەسیش ئەڵێ سوپاس و سەری شووشەکە ئەکاتەوەو هەر چوارپێنج حەبەکە ئەخاتە سەر بەری دەستی‌و هەڵیانئەداتە ناو دەمییەوەو پەرداخێ ئاو هەڵئەگرێ‌و قووتیان ئەدا، پەرداخەکە دائەنێتەوەو بەکابرا ئەڵێ "موهیم ئەوە نییە من بمرم، موهیم ئەوەیە تۆ زەرەر بکەی"!) .

ئەگێڕنەوە ئەڵێن: شەوێکی تریش هەر لەهەمان ماڵ درەنگان، خواردنەوەیان نامێنێ، بەڵام ئەمان پێشتر ئەزانن چییان ناردۆتەوە. بێکەس بەکابرا ئەڵێ "قاپەکەی ترمان بۆ بێنە. ئەویش منداڵێکی خۆی بانگ ئەکاو پێی ئەڵێ بچێ لەژوورەوە لە تاقەکەدا ئەو بوتڵە بێنە". منداڵ ئەچێتو لەوەختی گەڕانەوەدا، لەسەر پلیکانەی هەیوانەکە ئەکەوێتو شووشەکەیش ئەشکێت. بۆ ماوەیەک هەموو ئەحەپەسێن، دوایی بێکەس بەمامۆستا برایم ئەڵێت "بلە گیان هەستەو بچۆ بۆنیکە، بزانە مەیە یان ئاوە؟ ئەم هیچ و پووچە هەموو شتێکی لەدەست دێ"، کەئەچێ بۆن ئەکات، ڕاست ئەوە دەرئەچێت کە مەی نەبوەو تومەز پێشتر ئەم نمایشەی ئامادەکردووە.

دایکم گێڕایەوە: لەدوای ئەوەی عەبدوڵڵا بەگی باوکی بێکەس لە تورکیاو شاری مەرعەش کۆچی دوایی ئەکاتو هەواڵەکەیش ئەگاتە باوکم و مامە تایەر، لەدوای ماوەیەک بێکەس کەڵکەڵەی ئەوەی ئەکەوێتە سەر سەفەرێ بکات بۆ مەرعەش، بەو نیازەی هەم سەرێ لەگۆڕەکەی باوکی بداو هەم ئەگەر میراتێکیشی لەپاش بەجێمابوو وەریبگرێ. سەفەر ئەکاتو ئەچێتە سەر گۆڕی باوکی. هەرچەندە ئەو میراتەی بەجێیهێشتووە ئەوە نابێ کە لە خەیاڵی ئەماندا بووە، ئەوەیش وەر ئەگرێو ناومالەکەیشی ئەفرۆشێو ئەیخاتە سەر پارەکەی ترو، ئیتر ئەکەوێتە کەیفو سەفاو، لەوسەرەوە ئەیشچێتە شاری حەلەبو لەحەلەبیش بەئارەزووی دڵی خۆی ئەخواتو ئەخواتەوەو ڕائەبوێرێ و تەنانەت ئەڵێن: کە چووە بۆ کابەریەکانی حەلەب، بیتاقەی دوو کورسی بڕیوە، یەکێکیان بۆ خۆیو ئەویتر بۆ فێستەکەی تا بە کەماڵی سەڵتەنەت لێی دانیشێ. بەکورتی وەختێ ئەگاتەوە سلەیمانی، مامم بەپەلە ئەچێ بۆلای بۆ ئەوەی گوایە بەشە میراتی خۆی وەربگرێ. ئەم فلسی پێنەماوە! بەمامم ئەڵێت: "میراتەکەی باوکمان هەر بەشی سەفەرەکەمی کرد. ئەم باوکەی ئێمە هەر خەریکی شەڕو تۆپ تەقاندن بووە، بیری لەپارەوپول نەکردۆتەوە". لەدواییدا بەدوورو درێژی باسی سەفەرەکەی خۆی بۆ مامم ئەگێڕێتەوە .

دایکم ئەڵێت: باوکت ئەیوت تایەر ئەوەندە بەوردی ئەو سەفەرەی من ئەگێڕێتەوە، ئێستا گومانم هەیە لەوەی من سەفەرم کردووە یان تایەر". مامە تایەر برا بچووکی بێکەس بووە، بەڵام هەمیشە بەینیان ئاڵۆز بووە، چونکە مامە تایەر بەئارەزووی خۆی قسەی کردووەو لای خۆیشییەوە زیادەی زۆری

پێوەناوە، لەبەر ئەوە زۆرجار باوکم پێی وتووە "تایەر من بڕوا بە تۆ ناکەم، چونکە تۆ ڕاست نالێیت."!

ڕۆژێک بەڕێکەوت بەتەنها هەر بێکەس خۆی لەماڵ ئەبێتو لەدەرگا ئەدرێ. باوکم هەڵئەستێ دەرگاکە بکاتەوە. ئەڵێ "ئەوە کێیە؟!" مامیشم لەودیو دەرگاکەوە ئەڵێت "خۆمانین. تایەرم!". باوکم دەرگاکە ئەکاتەوەو ئیتر ئەوە مامەمە و پێی ئەڵێ: "تایەر گیان بەڕاستی ئەمە یەکەمجارە ڕاست بکەیت."!

لەڕشتەی مرواریشدا مامۆستا عەلادین سەجادی کۆمەڵێ لەو بەسەرهاتو قسە خۆشانەی بێکەسی گێڕاوەتەوە .

بۆ ئەوەی کەسایەتی بێکەس باشتر بناسین، ئەبێ لایەنی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی فەرامۆش نەکەین. ئەو هاوڕێی هەمووان بوو. لەگەڵ منداڵدا منداڵ و بەزمانی ئەوان قسەی ئەکرد، بەلام بەداخەوە وەک دایکم ئەگێڕێتەوە بێکەس بەهیچ جۆرێ گوێی نەداوەتە تەندروستی خۆی، لەدوا ساڵی ژیانیدا، زۆر قەڵەو بووبوو، هەر لەبەر ئەوەیش وا زوو کۆچی دواییکرد!

لەساڵی (١٩٤٨)دا، یەکەمجار بوو خۆپیشاندان و ڕاپەڕینی شەقامو نارەزایی خەڵکی لەنزیکەوە ببینمو گوێم لەهاوارو دروشمەکانیان بێ. ئەوکاتە خاڵێکم دەستی ئەگرتم و لەگەڵ خۆیدا ئەیبردم و لەقەراغ شەقامەکانەوە تەماشام ئەکردن‌و کە ئەیشکەڕامە ماڵەوە، بابژیو بابڕوخێی ئەوانم ئەوتەوە. هەندێ لەو شیعرانەی ئەوان ئەیانوت لەبەرم ئەکردن‌و بێ ئەوەی بزانم مەسەلە چییە؟! ئەموتنەوەو دووبارەم ئەکردنەوە. ئەتوانم بڵێم دوای سرودەکانی قوتابخانە، یەکەم ئاشنایەتیم لەگەڵ شیعری نیشتمانیدا لەسەردەمی ڕاپەڕینەکانی (١٩٤٨)ەوە دەست پێئەکات .

ئەمە جگەلەوەی ئەو کۆبوونەوەو خۆپیشاندان‌و خرۆشانەی خەڵک مەودای خەیاڵ و بیرکردنەوەیان فراوان ئەکردم و ئەبوونە مایەی دەیان پرسیار، کە لەدواییدا لەگەورەکانی بکەمو چاوەڕوانی وەڵامی ئەوانبم .

لەپۆلی چوارو پێنج بووم لەماڵی نەنکم، دایکی دایکم، جگە لەو کۆمەڵە کتێبەی لەماڵی خۆماندا بوو، لەوێش هەندێ کتێبی ترم بەرچاوکەوت. سەبیحە خانی نەنکم، دوو شووی کردبوو، یەکەمیان بەوەستا سەعیدی بەنا، کە دایکم و پوورە بەهێ و ناهی و سەعد و خاڵە عومەری لێبووبوو. دوای وەستا سەعید، شوو ئەکاتەوە بەکەریم مەسرەف کە هەر خزمی خۆیان بوو، لەمیش سێ کوڕی بووە، ئەنوەر و بورهان و ئازاد .

کاک کەریم، سەرەک چاوەشەکانی شارەوانی سلەیمانی بوو، پیاوێکی باش و بەبەزەیی و خێرخواز بوو، بەلاّم تابلێی عاتیفی و هەمیشە شپرزەبوو. بەتایبەتی بۆ منداڵەکانی خۆی لەڕادەبەدەر نازی دابوونێ و بەدەوریاندا ئەهات. بۆ نموونە ئەگەر یەکێکیان سەفەرێکی بۆ بەغدا بکردایە، ئەم پیاوە ئۆقرەی لەبەر هەڵئەگیرا، بۆ ئەوەی بزانێ گەیشتووە یان نەگەیشتوە. کاروباری خۆیشی لەشارەوانیدا بەباشی جێبەجێئەکرد. بەکورتی زۆر مەسلەکی و جیدی بوو. من لە هەفتەیەکدا دووسێ ڕۆژێ لەوێ بووم. ماڵی نەنکم بۆ من خۆشترو زۆریش هۆگری خاڵەکانم بووم. لەو چاپکراوانەی بۆ یەکەمجار لەوێ بەرچاوم کەوتن، ژمارەیەکی زۆری گۆڤاری گەلاوێژو ڕۆژنامەی ژیان بوون. ئەگەرچی لەوکاتەدا هێشتا لەگڕوگاڵی خوێندنەوەدا بووم، بەلاّم ساڵانی دواتر سوودم لێوەرگرتن. هەر لەوێش بەزمانی عەرەبی "رحلە ریح"م بۆ یەکەمجار بەرچاوکەوت، بەلاّم نەمئەتوانی تێی بگەم. پێموایە تەرجومەی بەهادین نوری بوو. دیارە ماڵی نەنکم چەند ژوورێکی هەبوو. ژووری میوانیان نەئەکرایەوە، بۆ میوان نەبێت !

لەو ژوورەدا بۆ یەکەمجار تفەنگێکی تاپڕی لوولە درێژم بینی و سەرنجی ڕاکێشام. بەختنامەکەی بەشیرمشیریان هەبوو. هەمووجارێ بۆ نەنکم و دایکم و پوورەکانم ئەگرتەوە. هەندێ لەکرێکارەکانی شارەوانی خزمەتی ماڵەوەیان ئەکرد، بازاڕکردن بوایە یان ئیشی پێویستی تر. یەکێک لەو کرێکارانەی کە هەرگیز لەبیرمناچێتەوە (مام عەلی) بوو .

ئەم پیاوە لەشەستەکانی تەمەندا ئەبوو. خەڵکی دەرەوەی سلەیمانی بوو. جووتێ سمێڵی گەورەی پێوەبوو. چاوی زیتو دەم و پل پاراوبوو. شەوانی زستان، ئەهات بۆلای خاڵەکانمو حیکایەتی بۆ ئەکردین. بەیتو داستانە کۆنەکانی بۆ ئەگێڕاینەوە، ئەوەی ئەیوت نەیئەوتەوە، قسە لای ئەو تەواو نەئەبوو. ئێمەیش سەرسامو گوێ قولاّغ چواردەورمان ئەگرت. بەجۆرێک ئەیگێڕایەوە ئەوەندە بەتامو سیحراوی، میزمان ئەهات و نەئەچووین بیکەین! نەبادا نەزانینو بەسەرماندا تێپەڕێ دوای ئەوە دێوە سپییەکەو کوڕە بچکۆلەکە چییان بەسەردێت. ئەو بەسزمانە تادرەنگان حیکایەت لەدوای حیکایەتی ئەکردو ئێمە لەکۆڵی نەئەبووینەوە. زۆرجار کەماندوو ئەبوو وەنەوزی ئەدا، بەلاّم خێرا خێرا پێمان ئەوت (مام عەلی گیان بچۆ دەمو چاوت بشۆ باخەوت لێنەکەوێ!). حیکایەتەکانی مام عەلی پڕپڕبوو لەخەیاڵی شیعر و ئەفسانەو جوانیی زمانی کوردیو هەناسەی شاخو داخ و کەلتووری ڕەسەنی کوردی .

مام عەلی؛ یەکێکە لەو مامۆستایانەی ژیانم کە ناڕاستەوخۆو بێ ئەوەی بزانێ، زمانی منی لەگەورەبووندا بۆ ئەدەب فێری شەقڵ کرد .

هەر لەماڵی نەنکم، پووری دایکم، پوورە "حەلاو"م ئەبینی. ئەو هەموو قسە خۆشانەی ئەکرد بەبێ ئەوەی خۆی پێبکەنێ. ئەمە جگەلەوەی قسە خۆشەکانی، بێ پەردەبوون، ئەچووە ناو هەموو ئەرزە حەرامکراوەکانی ئەخلاقەوە، لەگەڵ ژنەکاندا، هەواڵی جووتبوونی شەوانەیانی لەگەڵ مێردەکانیاندا لێ ئەپرسین! ئەوان تەریق ئەبوونەوەو سەرپۆشەکانیان ئەهێنایە سەردەمو چاویان، بەڵام ئەم ئابڵووقەی ئەدان. گەنجینەیەک بوو بۆ قسەی خۆش‌و وەک ئەڵێن سەر بەقوڕی ئەهێنایە پێکەنین. نەنکیشم قسەی هەر خۆش بوو. دایکیشم هەروایە. بەڵام هەر هەموو لەسەر ئەوە ڕێکبوون کە پوورە حەلاو سەرچاوەیە بۆ ئەوان‌و کەسیان ناگەنە باڵای قسەی خۆشی ئەو .

پوورە "حەلاو" بۆیە بەلای منی منداڵەوە لەوتەمەنەدا جێی سەرنج و تێڕامان بوو. چونکە قسەکانی ئەو لەقسەی ئەوانی تر نەئەچوون، سنوورە قەدەغەکانی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی بەو قسەو گاڵتانە ئەبەزاندو وەک خۆی چۆنی ئەویست وا قسەی ئەکرد. ئەم ژنە توحفەیەک بوو لەپەندو سەرگوزشتەو پەیڤی ئازاو بوێر .

ئەگێڕنەوە (وەختێ بچوایە بۆ هەر تەعزییەکی ژنان، بەقسەو تەعلیق و تەنزەکانی خۆی ژنانی ئەهێنایە پێکەنین).. ئەڵێن جارێک ئەوکاتەی تازە قەوانی گرامەفۆن هاتۆتە سلەیمانی، ئەم لەبەر دەرکی سەرا بەبەردەمی چایخانەیەکدا تێئەپەڕێ، گۆرانیی "سلمی یا سلمی"ی "صەدیقە الملایە" (ئەگەر بە هەڵەدانەچووبم) لێئەدا. لەبەردەمی چایخانەکەدا ڕائەوەستێ و گوێ ئەگرێ و دوای ئەوە لەچایچییەکە ئەپرسێ: (ئەرێ بەقوربان سەلما کێیە؟!). کابرایش ئەڵێ (ئەوە ژنێکەو گۆرانیان بەسەردا هەڵداوە). ئەمیش دوایی ئەڵێ: (بەداخەوە خۆزگە ناوم سەلما بوایە!) .

پورە حەلاو؛ تاسەرەتای شەستەکانیش هەر مابوو، ماڵیان لەکۆڵانەکەی لای حەمامی سورەتەوە بوو، ناوبەناو سەرم ئەدا. دایکم ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت: (لەسەرە مەرگدا بوو کە چووین بۆلای، ئەوساتەیش هەر قسەی خۆشی خۆی ئەکرد، دووان چووبوونە ژێر باڵی تاهەڵسێتە سەر پێیان و بیبەن بۆ سەر پێشاو، لەو ساتەدا یارییەکی منداڵانی کۆنی خۆی بیرکەوتبۆوە وتبووی: (باشم بگرن خۆ بەنکە خوێنی دایکم نەپچڕاوە).

هەر لەو تەمەنەداو لەماڵی نەنکم، کە ئێمە هەر "دایەخان"مان پێئەوت، گۆڤاری "کواکب" و "المسور"ی میسریم بینی. وێنەی مەلیک فاروق و کۆشکەکانی و هەروەها وێنەی ئەکتەرو گۆرانیبێژە بەناوبانگەکانی وەکو "محمد عبدالوهاب"و "ئەسمەهان"و "فرید ئەترەش" و... زۆری تریش. من بۆ یەکەمجار وێنەی ڕەنگاوڕەنگم لەم گۆڤارانەدا بینی .

هەر لەماڵی "دایە خان"یش جاربەجار شاعیری گەورەی کورد "شێخ نوری شێخ صالح"م ئەبینی، چونکە لەڕێی زەکیەخانی ژنییەوە خزمایەتییەکی نزیکی لەگەڵ ئێمەدا هەبوو. بانگی ئەکردم و دەستی بەسەردا ئەهێنام‌و قسەی خۆشی بۆ ئەکردم، لەشیعرەکانی باوکمی بۆ ئەخوێندمەوە .

دوو سێ ساڵێ بەرەو ژوورتر، دوو کتێبی کوردی سەرنجیان ڕاکێشام‌و خۆم لەگەڵدا خەریک ئەکردن بۆ ئەوەی بەچاکی بیانخوێنمەوەو تێیانبگەم، چونکە هەستم ئەکرد شتی تازەو لەوەوبەر نەبیستراوم فێرئەکەن. ئەو دوو کتێبەیش "کەمانچەژەن"ی وەرگێڕاوی شاعیری گەورە پیرەمێردو ئەویتریشیان "شیعرو ئەدەبیاتی" مامۆستا ڕەفیق حیلمی بوون. جاری واهەبوو بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ چاوم لەسەر وێنەی ئەو شاعیرانە هەڵنەئەبڕی، کە لەدووتوێی ئەو کتێبەدا بوون‌و باوکیشم یەکێک بوو لەو شاعیرانە، سەروسیمای پیرەمێردو

ئەحمەد موختارو حەمدی و بێخود و ئەسیری خولیایان ئەوروژاندم و بەدڵ ئاواتە خوازبووم ڕۆژێ لەڕۆژان منیش وەکو ئەوان وێنەم بخرێتە ناو کتێبێکەوە.

لەساڵانی دواتردا، چەند جارێکی تر، ماڵ بەکۆڵ ئەم گەڕەکو ئەو گەڕەکمان کردەوە. ئەمجارەیان چووینە سابونکەران، کۆڵانەکەی مزگەوتی شێخ ئەمین ـی باوکی زانای بەناوبانگ شێخ محەمەدی خاڵ و نزیک ماڵی ئەوان. لەسەر حەوشەیەک کە چەند ماڵێکی تریشی تێدابوو، هۆدەو هەیوانێکمان بەکرێگرت. ماڵەکە ماڵی "ئایشێی عەلێ"یان پێ ئەوت. ئەم باجی ئایشێیە، پیرێژنێکی کۆماوەو نابینابوو. ئەویش بۆ خۆی لەهۆدەو هەیوانێکداو لەهەمان حەوشەدا ئەژیا. ئەم پیرێژنەیش لەگێڕانەوەی حیکایەت و بەیتوباڵۆرە کوردییەکاندا، گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووبوو. دەموپل پاراوو قسە نەستەقو بیرێکی تیژی هەبوو. من بۆیەکەمجار لەڕێی ئەم پیرێژنە پیرۆزەوەو لەسەر زاری ئەو، بەیتی شێخ مەحمودی نەمرم گوێ لێبوو. ئەو بەیتەی شەڕەکانی شێخو داستانی ئازایەتی و بەرەنگاری ئەوی ئەگێڕایەوە، خۆیو ئەسپە ڕەشو شەڕی ئاوباریکو بازیان و پێنجوێن و بریندار بوونی لەدەربەندی بازیان و دوورخستنەوەی بۆ هیندستان. ئەوەندە خۆش ئەیگێڕایەوە، تاقەتت نەبوو قەت بەجێیبێڵی. من لەم کەسانەوە، لەو ڕەگانەوە چوومەتە ناو دنیای کەلتووری داستانی کوردەوە. لەپەیڤی ئەو پیرەمێردو پیرێژنە جانانەوە، لەجوانیی ئەم زمانەم هەڵهێنجاوەو لەژێر کاریگەری ئەواندا ڕێگەی شیعرم بۆ ڕێگای داهێنانو ژیان گرتوتەبەر. هەر لەوکاتەدا، کە لەم حەوشەیەدا بووینو پێموایە لەپۆلی چوار یان پێنج بووم، بەیانییەک وەختێ ئەچووم بۆ مەکتەب، لەبەردەرکی سەراو بەر لەوەی بچمەوە ژوورەوە. دیمەنێکی ترسناکی چاوەڕوان نەکراوم بینی .

سێدارەیەک و تەرمێک بەپەتێکەوە..! بۆیەکەمجار بوو ئاوا لەنزیکەوە دیمەنێکی واتۆقێنەر ببینم. تەرمەکە تاچەندین سەعات بەو سێدارەیەوە مایەوە. ئەو ڕۆژە بەردەوام خەیاڵم هەر لەلای ئەو سێدارەیە و تەرمەکەبوو. لەمەکتەب و لەزاری قوتابییەکانەوە ئەوەم بیست ئەو کەسە لەسێدارەدراوە چەتەی بەناوودەنگ و برای خولەپیزە "تالە"یەو حکومەت گرتوێتی و لەسێدارەی داوە .

لەکۆتایی چلەکانو سەرەتای پەنجاکاندا، لەسلێمانیدا، وێردی سەر زمانی وردودرشت، ناوی خولە پیزەو خولە سەلکەو حەمەی بانی شاری و ئەو کۆمەڵە چەتەیە بوون، کە لەناوچەکانی شارباژێڕو پێنجوێن لەحکومەت یاخی بووبوونو

لەهەر شوێنێک بۆیان هەڵکەوتایە جەزرەبەی توندیان ئەگەیاندە هێزەکانی میری، بەتایبەتی هێزی "قوە سیارە" کە بەشی زۆریان پۆلیسی عەرەب بوون‌و لەناوچەکانی خواروویی عێراقەوە بۆ شەڕی خولەپیزە هێنابوویانن .

بەکورتی خولە پیزە بووبوو بەئەفسانەو داستان. لەخەیاڵی ئێمەدا نموونە بوو، بۆ ئازایەتی و قارەمانی و شەوانەیش تا ئەنووستین هەر ئەومان لەخەیاڵدا بوو. بیرمە لەترس‌و هەیبەتی خولەپیزە، شەوانە زۆرجار میزم ئەهات‌و بەڵام ئەترسام بەتەنیا ڕووبکەمە حەوشەکە، نەبادا لەپڕێکدا خولەپیزە پەیدا بێت .

من لەدڵدا خولەپیزەم خۆش ئەویست، چونکە ڕەمزێک بوو بۆ ئازایەتی و گیانبەختی، هەر لەسەرەتای پەنجاکانیشدا بوو. ئەو کاتەی (عومەر عەلی) موتەسەڕیفی سلەیمانی بوو، ڕۆژێکیان لەبەردەرکی سەرا لەسەر تەختەبەندێکی گەورەو لەناو گژوگیادا سێ چوار مەیتێکیان ڕیزکردبوو، ئەیانوت ئەوە خولە سەلکەو چەند چەتەیەکی ترن کە بەدەستی هێزەکانی میری کوژراون.

هەر ساڵێک لەو گەڕەکە ماینەوە. ئەمجارەیان ڕوومانکردەوە کۆنە گەڕەکی "حاجی حان"ی خۆمان. پشت ماڵەکۆنەکەمان، لەکۆلانێکدا خانوویەکی ترمان بەکرێ گرت، سەربەخۆ بووین، بەڵام هەر یەک هۆدەو هەیوانێ بوو. ناخۆشترین شتی ئەم ماڵە ئەوەبوو، ئاودەستخانەی تێدا نەبوو! ئەبوایە زۆرجار من بچم بۆ مزگەوتەکەی حاجی حان دایکم و خوشکەکانیشم بچن بۆ ماڵە دراوسێکان. ماڵەکەمان ڕێک بەرامبەر بەماڵی وەستا ڕەشیدی بانەیی بوو. کچەکەی وەستا ڕەشید بەهیە خان، ژنی وەستا ئەحمەد بوو. لەپاش ماوەیەکی کەم بوو بەخۆشەویستترین هاوڕێی دایکم. باشەو چاکەو خۆشەویستی ئەم خێزانە بۆ ئێمە، لەڕادەبەدەرو لەخزمەکانمان زیاتر بەتەنگامەوە بوون. کەم ئێوارە هەبوو لەو خواردنەی بۆ خۆیانیان لێ ئەنا ئێمەیشی لەگەڵدا بەسەرنەکەنەوە. شەوە ناشەوێکیش، یان ئێمە ئەچووین بۆ لایان یان بەهێ خان ئەهات بۆلامان. من زۆرترین جەژنانەم لەوان وەرئەگرت. بەدەورماندا ئەهاتن و دڵ نەواییان ئەکردین و ئاگایان لێمان بوو. لەولاتریشمانەوە بەدەستە ڕاستدا بەرەو سەرەوە، ماڵی میرزا تۆفیق بوو، باوکی میرزا عومەر و کاک نووری و حەپسەخان‌و باپیری کاک جیهان عومەر .

لەگەڵ ئەم ماڵە باشەیشدا هەر تەواو تێکەڵبووین. یەکێک لەهاوڕێ هەرە خۆشەویستەکانی دایکم کە تائێستەیش لەژیاندایەو لەگەڵ دایکمدا دووراو دووریش پەیوەندییان هەرماوە، حەپسەخان بوو. بیرمە بەردەوام سێ قۆڵی ئەو

و بەهێ خان‌و دایکم بەیەکەوە ئەچوون بۆ بازاڕو بۆ تەعزێ و بۆ شایی و بۆ سەیران‌و هەموو شوێنێ. ماڵی میرزا تۆفیق-یش بۆ ئێمە پشت‌و پەنابوون. کاک جیهان پێموایە هەر ساڵێ یان دوو ساڵ لەمن گەورەترە، بەڵام هاوڕێ بووین‌و بەیەکەوە لەکەلاوەکەی ئەوبەرەوە، یاری‌و شەڕەشەقی خۆمان ئەکرد. لەوکاتەدا کەم کەس شەبەکەی گەمەی یاریی باڵەی هەبوو. ئەو هەیبوو، ئەیهێناو لەمدیوەوە ئەیبەست و یاری باڵەمان لەسەر ئەکرد. لەهاوڕێ هەرە نزیکەکانی ئەو سەردەمەیش جگە لە جیهان، عیرفان‌و عارف‌و مەجید و واحید و لەتیف بوون. ئەم دووانەی دواییان کوڕی کاک ئەحمەدی پول بوون. باوکیان یەکێک بوو لەخوێندەوارە عەریزە نووسەکانی بەردەم سەراو پولیشی ئەفرۆشت. لەمەوە پێیان ئەوت (ئەحەی پوول). هەندێجار ڕێم ئەکەوتە ماڵیان. ئەم پیاوە، شیعری زۆری شاعیرانی لەبەربوو بۆ ئێمەی ئەخوێندەوە. هەموو جارێ باسی باوکمی بۆ ئەکردم و ئەیوت (شاعیری وا تازا نابێتەوە). عیرفان برا گەورەکەی وەستای بینابوو. عارف باوکی کۆپان دروو‌بوو، وەک بێتەوە بیرم، دوو چاوی سەوزی بریقەداری پێوەبوو. جارێکیان هەر لەو تەمەنەدا لەبۆنەیەکی خۆشدا نازانم مەولوودیان کردبوو یان ئاهەنگی ژنهێنان بوو، منیش چووبووم لەگەڵ عارفدا لەسوراحی شووشەدا ئاومان ئەگێڕا. لەپڕێکدا پێم لەشتێ هەڵنووت‌و کەوتم‌و سوراحییەکە شکاو پارچەیەکی چوو بەشانمدا و بریندار بووم‌و تائێستەیش ئەو نیشانەیە بەشانمەوە دیارە .

مەجید لەهەموومان بەسەزمانتر بوو، باوکیشی بەردەوام پاسەوان بوو بەسەریەوە، لەپێش هەموومانەوە ئەچۆوە بۆ ماڵەوە. لەکەلاوەکەی ئەولای ماڵی جیهان-ەوە، یاریمان ئەکرد. یەک بازوو بازی بەرز و ڕاکردن بەدەوری گەڕەکداو تا ئەودیوی مزگەوتی حاجی حان و ئینجا گەڕانەوە بۆ ناو کەلاوەکە. لاسایی نمایشتەکانی قوتابخانەمان ئەکردەوە. مەدالیامان لەوەرەقی سیپەچا دروست ئەکرد. جیهان تۆپێکی باشی هەبوو، ئێمە نەمان بوو. زۆرجار بەدزی دایکمەوە ئەو تۆپەوانانەی خستبوونییە سەردەمی گۆزەکان. هەڵمئەگرتن و ئەمبردنە دەرەوەو ئەمکردن بەتۆپ و شەقم تێهەڵئەدان. مزگەوتەکەی حاجی حان ژێر مێوەکەیی و حەوزە ڕوونەکەیی و جووڵەو هاتوچۆی ماسییەکانی ناوی، جێی تێڕامان و وردبوونەوەی من بوون. جاری وا هەبوو بەسەعات تەماشای ماسییەکانم ئەکرد. بەڵام مجەورە توورەکە زوو زوو دەریئەکردم. ئەو شەوانەی بچووینایە بەمیوانی بۆ ماڵە دراوسێکان یاری کلاوکلاوێنەمان ئەکرد .

کەریمی وەستا ئەحمەد، کە دواتر بەگەنجی سەری نایەوە، هەر تەواو سەرنجی منی ڕاکێشابوو. چونکە لەو سەری کۆلانەکەوە تابەردەرگای خۆیان لەسەر هەردوو دەست ئەڕۆیشت. ئەو لەئێمە گەورەتر بوو، تێکەڵی ئێمەی منداڵ نەئەبوو. ئێمەیش خۆزگەمان ئەخواست بەوەی کەڕۆژێ لەڕۆژان بتوانین وەکو ئەو لەسەر دەست بڕۆین. هەر بەوبەری ماڵی ئێمەوە، ماڵی ئایشێ خلە بوو. پیرێژنێک بوو تەمەنی خۆی ئەدا لەسەد ساڵ. کوماوەو گرمۆڵە بووبوو، بەهاوینان حەسیرێکیان لەبەردەرگا بۆ ڕائەخست و دائەنیشت. من هەرچەند ئەو ئایشێ خلەیەم ئەبینی پرسیارێکم بەخەیاڵدا ئەهات: (ئایا دایکیشم وایلێدێ؟!). چەند دووکانێکیش لەو کۆلانانەدا بوون. دوکانی تەنیشت مزگەوتەکەی حاجی حان کە تاڕادەیەک ئاوەدان بوو. بەرامبەر کەلاوەکەیش، دووکانەکەی مەلا هیندی بوو، پیاوێکی پیری نابیناو چەند تەبەقێ بۆنوقو ماجوومی و ڕازیانەو پووشێ خورمای خەستەوێو هەندێ نۆکو مێوژو وردەواڵەی تریشی ئەفرۆشت. بەردەوام قنج و قیت دائەنیشت. گوچانەکەی لە تەنیشتیەوە بوو. ڕۆژانەی من کە یەک عانەبوو، لای ئەو خەرجم ئەکرد. کە دوو فلسی یان عانەمان ئەدایە، پەنجەی لەپارەکانەوە ئەدا بزانێ ڕاستە یان قەڵبە. دوکانەکەی قوڵ بوو، مشک تەراتێنی تیا ئەکرد .

لەدیوانی "کەژاوەی گریان"دا هەر بەناوی "مەلا هیندی"یەوە لەشیعرێکدا ئەو ڕۆژگارانەم بەسەرکردۆتەوە. لەخوارتریش دوکانەکەی عومەری مام عەلی بوو، کە میوەو سەوزەواتی ئەفرۆشت و بەهاوینانیش بەفر. دوورکەوتنەوەی ئێمە لەو کۆلانەو تاپیرمەسوور تێپەڕی نەئەکرد. هەر لەوێشدا بەرامبەر شەخسەکەی پیرمەسوور، گۆزەکەرێکی ژن هەبوو، گۆزەکانی ئەویش و دەستو پلی لەوەختی کارکردندا، سەرنجیان ڕائەکێشام .

هەر لەنەورۆزێکی ئەو ساڵانەدا ئێمەی منداڵ ئاگرێکمان کردبۆوە، دووسێ کچیشمان لەتەمەنی خۆمان لەگەڵدا وەستابوو، دەمەو ئێوارەیەکی سارد بوو. شەوقی نارنجیی کڵپەی ئاگرەکەو دەموچاوی خڕنو سپی کچەکەی تەنیشتم و دووچاوی شینی، بۆ یەکەمجار ئارەزوویەکیان تێدا جووڵاندم کە لەوەوبەر هەستم پێنەکردبوو! بەبێ ئەوەی بزانم مەیلێک بەرەو لای ئەو کچە ڕایئەکێشام، ناوی کچەکە "صدیقە" بوو، خەڵکی کەرکوک بوون، کۆلانێک لەسەروو ئێمەوە بوون. حەزمئەکرد هەموو ڕۆژێ بیبینم، بەڵام پاشماوەیەک ماڵیان پێچایەوەو

گەڕانەوە بۆ کەرکوک. لام وایە ئەوە یەکەمجاری بزوتنی غەریزەی کوڕێنی بوو لەجەستەی مندا سەرهەڵبدا .

دایکم هاوڕێ و ئاشنای خۆی زۆربوو. چونکە ژنێکی قسەخۆش بوو، کراوەو سادە بوو، لەبەر ئەوە ژنانی تر لەتەمەنی خۆیدا یان خوارترو بەرەو ژوورتر، زوو هۆگری ئەبوون و ئەیانویست لەنزیکەوە تێکەڵی بن. من ئەو کاتە (١١-١٢) ساڵان بووم. لەناو ئەو ئاشنایانەی دایکمدا، بالا بەرزێکی چاوڕەشی ئەسمەری تێدابوو، پێموایە هەرچەند ساڵێ لەدایکم منداڵتربوو، دەموچاوێکی سیحراوی پێوەبوو. شوویکردبوو، بەڵام بەنابەدڵ و مێردەکەی حاجییەکی پیرەمێرد بوو. لەمانگێکدا دووسێ جارێ سەردانی دایکمی ئەکرد. ئێمەیش جارێک چووین بۆ ماڵیان و شەو لەوێماینەوە. مێردەکەی بەباوکی ئەشیا. مرومۆچ و لوت زل و ناشیرین. کە ئەهات بۆلای دایکم ڕازی دڵی خۆی هەڵئەڕشت و هەندێ جارش ئەگریا. من زیتو گوێ سووک بووم، تێگەیشتم بەرلەوەی شوو بەم حاجییە بکات، حەزی لەیەکێکی تر کردووەو پەیوەندیشی لەگەڵ ئەو کەسەدا بەردەوامە. من لەدڵەوە حەزم لێئەکردو لەناوەوەی خۆمدا هەر ئێجگار پەرۆشی بووم. نازانم بۆچی! بەڵام لەتەمەنی هەڵکشاوتریشدا من هەمیشە حەزم بەو ژنانە ئەکرد کە لە تەمەندا لەخۆم گەورەتربن. بەر لەیەکدوو ساڵێ ئەو ژنەم لەماڵە ناسیاوێک بینییەوە، بەڵام تەمەن و زەمان، پاچکاری خۆیان تێدا کردبوو، جوانییەکەی هەڵوەریبوو، ڕەنگی زەردو پەشۆکابوو. پیربووبوو .

من بەمنداڵی لەوانەی وێنەکێشاندا باش نەبووم، بەڵام حەزم بەتەماشاکردنی هەموو وێنەیەکی جوان ئەکرد. هەموو جارێ وێنەی سەردیواری حەمامەکانی قشڵەو سوورەت سەرنجیان ڕائەکێشام. شاخو ئاوو ئاسکێک لەدوورەوەو یان پەڵە هەورێ بەئاسمانەوە. لەتاقە ژوورەکەی خۆیشماندا بیرمە لەسەر دیوارەکەی وێنەی پیاوێکی فێست بەسەرمکردبوو، هەرچەند دایکم ویستی بیسڕێتەوە، ڕازی نەبووم .

لەسەرەتای پەنجاکانی سلەیمانیشدا وێنەکانی جەمال بەختیارو خالید سەعید لەزۆربەی زۆری ماڵاندا بوون. خالید سەعیدی هونەرمەند نزیک مزگەوتی گەورە، دوکانێکی گرتبوو، هەندێ لەتابلۆکانی خۆی تیا دانابوو. هەر وەختێ ئەگەیشتمە بەردەمی شووشە بەندەکەی، ماوەیەکی باش ڕائەوەستام و لەو وێنانە ورد ئەبوومەوە. خۆیشی پشت لەدەرەوە خەریکی وێنەکێشان بوو، دووکەڵی سەبیلەکەیشی لەسەر سەری پەنگی ئەخواردەوە .

من و دایکم و خوشکەکانم لەسینەما بووین،
ستالین و چەرچڵ و رۆزفلێتیش لەتاران!..

دوورترین یادەوەریم لەگەڵ سینەمادا ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٤٥-١٩٤٦)، واتە ئەوکاتەی تەمەنم پێنج شەش ساڵان بوو. شوێن سینەمای سیروانی ئێستاو سەردەمێکیش کە چایخانەی بەهەشتیی حەمە ڕەق بوو .

ئالەوێدا، من و دایکمو خوشکەکانم سەیری فیلمێکمانکرد، پێ ئەچوو فیلمێکی بەڵگەداری جەنگی دووەمی جیهان بێت، چونکە ئەو دیمەنانەی لەبیرەوەری مندا ماونەتەوە، کۆبوونەوە مێژووییەکەی هەرسێ سەرکردە گەورەکەی جیهان "ستالین و چەرچل و ڕۆزفڵت" بوو لە تاران، ئەوە دوورترین بیرەوەری منە لەگەڵ فیلمدا .

دیارە ئیتر لەتەمەنێکی هەڵکشاوتردا، مانگی جارێ بەتایبەتی هاوینان لەگەڵ دایکم و حەپسەخانو بەهێ خانی هاوڕێیدا ئەچووین بۆ سینەمای گۆیژەی هاوینان. سینەمایەکی خنجیلەو پاک و خاوێن، بەرامبەر قوتابخانەی گۆیژەی کوڕان، کەئێستا ئەو ناوە هەمووی بۆتە بازاڕو دوکان .

بیرمە بۆیەکەمجار لەوێ فیلمێکی عەرەبیم بینی کە "صباح"ی گۆرانیبێژ ڕۆڵی سەرەکی تیا ئەبینی و بەدەنگە خۆشەکەی گوێگرانی مەست ئەکرد. دیارە دایکم و حەپسە خان حەزیان لەدەنگی ئەکردو هەر لەبەر ئەوەیش هاتبوون بۆ بینینی فیلمەکەو منیشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو .

هەر سەبارەت بە سینەما، ڕووداوێک ڕوویدا کەهەرگیز لەبیرم ناچێتەوە. پێموایە ئەو وەختە سەرەتای پەنجاکان بوو، سینەمای ڕەشید هێشتا هەر تازەبوو، فیلمیش هەر فیلمێکی "صباح"ی شۆخ و شەنگ بوو .

کاک "صالح"ی برای پیاوێ ناسراو کاکە ئەحمەدی دادی، گەنج ئەبێت، لاموایە خۆیشی بەپیشە نانەوابوو، مەست ئەبێ و ئەچێ بۆ بینینی فیلمەکەی "صباح". دوای تەواوبونی فیلمەکە وەختێ دێتە دەرەوە ئەڵێت (دوای "صباح" ژیان بۆچی چاکە!) خۆیدابووە بەر خەنجەرو هەر لەوێدا جوانەمەرگ ئەبێت! ئیتر نازانم لەفیلمەکەدا "صباح" ئەمرێ و ئەکوژرێ؟! یان هەر خۆی تووشی نائومێدی بووەو هۆی تر هەبووە بۆ ڕوودانی ئەم کارەساتە .!

نازانم هەر لەگەڕەکی "حاجی حان" تەمەنم دە ساڵ ئەبوو، ڕۆژێکیان هەر لەپشت ماڵی خۆمانەوە، بوو بەقەرەباڵغی و پیاوان بەیەکدا ئەهاتن. لەخەستەخانەوە سێ مەیتیان هێنابۆوە بۆ ماڵی حاجی عەبدوڵلای بۆسکانی (باوکی عەلی بۆسکانی). ئێمەی منداڵ گەیشتینە ئەو سەربانەی بەسەر حەوشەکەی ماڵی ئەواندا ئەیڕوانی، مەیتی سێ پیاوی گەنج، ڕووتکرانەوەو دەستیانکرد بەشتنو کفن کردنیان. ئەوانە کوژرابوونو جێگە گوللەکان بەلەشیانەوە دیاربوون. وتیان ئەمانە بۆسکانینو لەشەڕدا کوژراون. بەڵام کام شەڕو بۆچی؟! ئەوەم بۆ ڕوون نەبۆوە. ئەوەی بەقوڵی کاری تێکردمو غەمگینی کردم، لاشەی شێواویان بوو! ئەم دیمەنە ماوەیەکی زۆر لەبەرچاوم نەئەڕەویەوەو شەوانە خەوی لێزڕاندبووم .

شەوانی هاوینانی گەڕەکی حاجی حان، چیغی سەربان و گۆزە ئاوو، هامشۆی گەرمی دراوسێتیو، مانگەشەوو، گۆرانیی دەنگ خۆشەکانو گەڕانیان بەکۆڵانەکاندا، لەو دیمەنە جوانانەبوون کە لەبیرناچنەوە. ئێمەی منداڵیش هەر دوای نانخواردنی ئێوارە ئەچووینە دەرەوە، لەژێر دارگلۆپەکەی بەردەرگای ماڵی حاجی عەبدوڵلاو لەسەر قالدرمەکان دائەنیشتینو دەستمان ئەکرد بەگولەبەڕۆژە خواردنو قسەکردنو گاڵتەوگەپ لەگەڵ یەکتردا. عیرفانی هاوڕێم تا ئەم ساڵانەی دواییش هەر ئەمبینی، بەڵام نەخۆشو دەردەدار بوو .

لەگەڵ جیهان عومەر-دا، تائێستەیش هاوڕێیەتی و دۆستایەتیمان بەردەوامە. عارفی هاوڕێمان لەساڵی (١٩٥٩)دا وەک بیستم ئەبێتە کۆمۆنیستو هەر لەوساڵەداو لەئەنجامی ململانێی توندوتیژی ناعەقڵانی سیاسییەوە، لەگەڵ چەند

کۆمۆنیستێکی تردا بەر هێرشێکی ناڕەوا کەوتن‌و بوونە قوربانیی ڕۆژگارێکی تاریکیی ئەم وڵاتە!

لەهاویناندا! ئێواران ئاسمان پڕ ئەبوون لەکۆلارە، بەڵام من لێمنەئەزانی و کۆلارەکەم باش بەرزنەئەبۆوە. هەر لەولای ئێمەوە لەبەری پیرمەسوور، ماڵی (سوران) هەبوون، کۆلارەکانی عوسمان‌و جەماڵی سوران بەفەنەرەوە بەرز ئەبوونەوەو تادرەنگانی بەئاسمانەوە بریسکەیان ئەهات. ئاواتم بەوە ئەخواست کۆلارەیەکی وام هەبووایە.

ئەوکاتەی دایکم چوو بۆ بەغدا؛
مشکەکان چییان پێکردم...

دایکم نزیکەی حەوت ساڵ بەبێوەژنی مایەوە. بەلام دواتر لەسەرەتای پەنجاکاندا. شووی بەکاک عومەر هەڵمەت-کرد .

کاک عومەر؛ خۆی هەر خەڵکی سلەیمانی و لەنەوەی جوامێرئاغای دوانزە سوارەیە. کە تائێستەیش برایەکی لەباوکی و کەس‌و کارەکەی لەگوندی (کانی میران) نزیک سورداش ئەژین. کاک عومەر لەدەرچووانی قوتابخانەی پیشەسازی بوو. ئەو سەردەمە لەبەغدایش یەکێک بوو لەبێژەرەکانی ڕادیۆی کوردی‌و لەگەڵ حسێن قەرەداخی و شەماڵ سابیردا هاوڕێی نزیکی یەکتربوون .

جگە لەوەش لەکاروباری میکانیکی و چاککردنەوەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و ئامێرەکانی کارەبادا شارەزاو دەست ڕەنگین بوو. دواتریش بوو بەمامۆستا لەقوتابخانەی پیشەسازی سلەیمانی و هەروەها بەرامبەر بەمزگەوتی گەورە، دووکانێکی بەکرێ گرت‌و دوای نیوەڕوانیش خەریکی چاککردنەوەی ئەو ئامێرانەبوو. لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا یەکدووجارێ بەنهێنیی چۆتە دەرەوە بۆ بەشداریکردن لەدامەزراندنی ڕادیۆی شۆڕشدا، کە ئەوکاتە 'م. س'ی پارتی لەناوچەی ماوەت و ئاوەکورتێ بوون .

کاک عومەر هەڵمەت؛ پیاوێکی کورد پەروەرە، لە گەنجییەتییەوە خواست‌و خەیاڵی هەمیشە بۆ ئەوەبووە بگاتە ئاستێکی بەرزتر لەکارەکەیدا، تابتوانێ لەو ڕێگەیەوە خزمەت بە گەلەکەی خۆی بکات و نەچێتە ناو هیچ حزبێکەوە. بەلام هەمیشە ئامادەبووە بۆ پێشکەشکردنی هەر کارێ کە بەو بکرێ .

دایکم؛ لەم شووکردنەوەیەدا بەختیار نەبوو. چونکە پانزە ساڵ لەکاک عومەر گەورەتر بوو، پاش چەند ساڵێ هەر ئەم جیاوازی تەمەنەیش لەدواییدا بووە هۆی ئەوەی پێکەوە نەگونجێن و لەیەکتر جیاببنەوە. دایکم؛ کاوەو کامەران و ژیانی لەم بووە .

لەسەرەتای شەستەکاندا، کاک عومەر عێراقی بەجێهێشتو ڕوویکردە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەو وەختەوە لەوێ جێنیشتەیەو هەر لەوێش خۆی پێگەیاندو تا گەیشتە ئەوەی کە بۆ دواجار ببێ بە بەرپرسی بەشی بازرگانی لەوەزارەتی بازرگانی ئەوێ. دواتر پەیمان خانی کچی (شێخ نوری) خوشکی کاک ئاسۆی هێناو لەویش کچو کوڕێکی هەیە. کاک عومەر چەندین جار سەردانی کوردستانی کردەوەو هاتۆتەوە.

من؛ تەمەنم سیانزە چواردە سالان بوو، کە دایکم شووی بەعومەر هەڵمەت کردەوە. خەریکبوو شەشی سەرەتایی تەواوبکەم، بەلام من ئەم شووکردنەوەیەی دایکم زۆر پێناخۆش بوو. چونکە ئەقڵی ئەوسام بەهیچ جۆرێک ئەمکارەی قبوول نەئەکرد، هەرچەند قسەیان لەگەڵدا کردم بێ سوودبوو. لاموایە هۆی هەرە گەورە ئەوەبوو کە پیاوێکی تر دێ و دایکم لێ داگیر ئەکات. ئەبوو دایکم هەر هی من بێ و لەگەڵ مندابێ و بەجێمنەهێڵێ و کەسی تریش نەیە بەلایدا..! بەلام تازە ئەو شووی کردبوو، ئەشبوو بڕۆن بۆ بەغداو سلەیمانیش بەجێبهێڵن. هەر لەسەرەتایشەوە یەکێک لەمەرجەکانی دایکم لەم شووکردنەوەیەدا، ئەوە بووە کە دەست لەمنداڵەکانی هەڵناگرێ و بچێ بۆ هەر شارێ ئەبێ ئەوانیشی لەگەڵدابێ. زۆرم لەگەڵدا خەریکبوون، باسی خۆشیی بەغدایان بۆ ئەکردم، بەلام من وەک یاخیبوون یاخیی بوومو نەچووم .

ئەم جیابوونەوەیە برینێکی قوڵ و بەسوێی کردە دڵمەوەو ڕۆژانی ئایندەمی لەبەرچاو ڕەشکردم! ئیتر دایکم و هەردوو خوشکەکەم ڕوویانکردە ماڵی تازەی بەغدایان و منیش نائومێدو دڵشکاو، باوەڵە تەنەکەکەم خستە سەرشانم و ڕوومکردە ماڵی خاڵە عومەرم .

لەو سەردەمەوە تاماوەیەکی دووروودرێژی داهاتووم ڕەش بینی و بیرکردنەوەی پڕ لەنائومێدیو تەمومژاوی بەرچاویان تاریک کردبووم و خەمێکی قورس وەک مۆتەکە، سواری سنگم ببوو. حەزم ئەکرد تەریک بمو تێکەلاوی کەس نەبم، ئەو شیعرانەم ئەخوێندەوە کە چاو بەفرمێسک بوونایەو بۆ کڕووزی جەرگی

هەڵقرچاویان لێبهاتایە. حەزم ئەکردو پەرۆشی ئەو گۆرانیانە بووم کە لاواندنەوەو ئاهەنگی غەمگین سەرچاوەی ئاخو ئۆفیان بێ .

ماڵی خاڵم، واتە یەک ژوور لەماڵی خاوەن ماڵداو هیچی تر! خاڵە عومەرم تازە ژنی هێنابوو. کچێکی بچکۆلەیان هەبوو (هێرۆ)، تابڵێی ئێسک سووکو نەشمیلانە بوو، پاشماوەیەک تووشی نەخۆشی تەنگەنەفەسی بوو مرد. گریامو زۆرم پێناخۆش بوو. خاڵم لەشارەوانی وەک چاودێر دانرابوو، مووچەیەکی کەمو هەژارانە ئەژیانو وامنیش بووم بەسەرباری خەمێکی تر بۆ ئەوان. بەڵام چارم ناچار بوو، چونکە هیچ لانەیەکی ترم نەبوو .

تاماوەی یەکدوو مانگێ هەر لەولای خۆیانەوە جێگەیەکیشیان بۆ من ڕائەخست. من ئەوکاتە هەستم بەوە ئەکرد کە ژنو مێردایەتی چییە! لەبەرئەوە لەدڵدا حەزم بەم سپڵی لاورگییەی خۆم نەئەکرد. هەر لەهەمان حەوشەداو بەوبەرەوە ڕێک بەرامبەر دەرگای حەوشە، ژوورێکیان هەبوو کۆنو داڕزیوو، نادیاربوو، هەر تەرکیانکردبوو. هەندێ گۆزەو دیزەی زەخیرەو کەلوپەلی شکاوو پەڕپووتی تێدابوو. من چوومە ئەو ژوورەو لەسەر حەسیرێ دۆشەکێکیان بۆ ڕاخستمو باوڵەکەشم کە دەفتەرو کتێبی مەکتەبو یەکدوو کراسو بانتۆڵێکی تێدابوو، لەتەنیشت خۆمەوە دامنا. ئیتر هەر ئەوەندەی شەو ئەهاتو وەختی نووستن، بەدەیان مشک تەراتێنیان تیا ئەکرد. مشکی ڕەشی گەورە گەورە. لێفەکەم لەخۆمەوە ئەئاڵاند. بەڵام ئەهاتنە سەر ورگمو زۆرجاریش لەشیرین خەودا، وەختێ نینۆکی قاچمیان ئەکرِاندەوە خەبەرم ئەبۆوە .!

تەڵە فریایان نەئەکەوت! لەو سەردەمەداو لەهەمان ماڵدا، کچە بچووکی خاوەن ماڵ کە لەخۆم گەورەتربوو، وەختێ ئەهاتە بەر بەلوعەکەی حەوشە، بەتایبەتی ئەگەر شەوبوایە، منیش ئەچوومو دەستبازیم لەگەڵدا ئەکرد، ئەوە یەکەم جاربوو لەنزیکەوە دەست لەدەستی کچو جەستەی مێینە بدەمو شەهوەتم تێدا دابگیرسێ!

لەبەر مشک خواخوام بوو شەو دانەیەت، یان ئەو شەوە خۆشترین شەوم بوو کە بچوومایە بۆ ماڵی دایەخان و لەوێ بنوستمایە، خەسووی خاڵم "باجی ڕەعنا"، ژنێکی هەژار بوو، بۆ بژێوی خۆی، ئیشی بۆ دایکی شاکیر فەتاح ئەکرد، کەماڵەکەیان کەوتبووە ئەوسەری ئەو کۆڵانەی ئێمەی تێدابووین. ناوبەناوێ ئێواران خواردنیان بەمندا بۆ ئەنارد.

خان؛ کەوتبووە تەمەنەوە، بەتەنیا لەماڵێکی گەورەداو لەبەشی سەرەوەدا ئەژیا، خانوەکە باخچەیەکی ئێجگار بەدارو بارو فراوانی هەبوو، ئەم پیرێژنە لەهیچ کەسێکی تر نەئەچوو، چونکە بەردەوام خۆی ئەڕازاندەوەو سوراوو سپیاوی ئەکردو لەسەر کورسییەکی بەرز دائەنیشتو ئاوێنەیەکی بەدەستەوەبوو تەماشای خۆی ئەکرد .

بەتەواوی منی تووشیی ڕامانو بیرکردنەوە کردبوو، چونکە نە نەنکم و نەهیچ نەنکێکی ترم نەدیبوو بەوجۆرە دڵتەڕو ژیانی خۆش بوێ..! ناوبەناو نوقڵێکی ئەدامێ، بەلام خاڵۆژنمو باجی ڕەعنا هەر زوو ئامۆژگاری ئەوەیانکردم کە بەهیچ جۆرێ وشەی "مردن"م لەدەم نەیەتە دەرەوە، چونکە بەبیستنی ئەو وشەیە زارەترێک ئەبێ و ئەیکا بەهەراو زەناو شیوەن و باجی ڕەعنایش دەرئەکا. من هیچ قسەم نەئەکرد. بەلام جارێک پێموت: "بەڕاستی تۆ جوانیت" هەر ئەوە بوو شاگەشکە بێتو ئەوجارە عانەیەکیشی دامێ .!

لەسالانی دواتردا ئەم حاڵەتە سەیرو سەمەرەیە بوو بەبیرۆکەی کورتە چیرۆکێکم، بەلام تەواوم نەکرد و نەیشچوومەوە سەری.!

هەر بەڕەنگی خۆڵەمێش؛
سکێچێ بۆ سلێمانی!..

سلەیمانی؛ سەردەمی منداڵی من، شارێکی خنجیلانە و جوان بوو. ئەوسا هەرچەند شەقامێک هەبوون‌و بەس .

کاوەو مەولەوی و پیرەمێرد و ئەمین زەکی. ئەوسەری سلەیمانی بەرەو کەرکوک کە دوابازگەی لێبوو، کەوتبووە خوار سەرۆکایەتی زانکۆی ئێستاو ئەولای ماڵی قادر ئاغاوە، بەتەنیشت چایخانەکەی سەعە تاکویی، کە ئێواران گەنجان ڕوویان تێئەکردو ئەڵقە ئەڵقە دائەنیشتن‌و کۆڕی قسەوباسیان تیا گەرم ئەکرد. گەڕەکی شۆڕش- عەقاری ئێستا، ئەوە دەشتی تەیارە خانەکەیان پێ ئەوت، لەسەردەمێکدا نمایشی وەرزشی ساڵانەی قوتابخانەکان لەوێدا ئەکرا، یان کە حاجیەکان لەحەج ئەگەڕانەوە، بۆ بەپیرەوە چوونیان خزم و کەس‌و کارو خەڵکی گەڕەکەکەی لەوێ گرد ئەبوونەوە. یەکێک لەو شتانەی لەمنداڵیدا، دڵی منیان خۆش ئەکرد ئەوەبوو بچین بەپیر حاجییەکی ناسیاوەوەو یەکێک لەئاڵا سەوزەکانیش هەڵگرم‌و لەپێشەوە بڕۆم .

دیمەنێکی تریش کە ئەبووە مایەی بەختیاریم ئەوەبوو، دایکم یان دایەخان و پوورەکانم پییانبوتمایە (ئەچین بۆ ماڵان و ئادەی بڕۆ عارەبانەیەکمان بۆ بێنە) .

بەدەیان عەرەبانەی دوو ئەسپی لەسلێمانیدا هەبوون‌و مۆڵگەی سەرەکیشیان هەر لەبەردەرکی سەراو سەرەتای شەقامی سابونکەران‌و بەرامبەر ڕیزە دووکانەکانی جەرجیس و مەتی و کەریمە ڕەش‌و عەبدول شمقار بوون .

عارەبانەی دوو ئەسپیم ئەهێنا، هەر بۆ ئەوەی لەتەنیشت عەرەبانچییەکەوە دانیشم، زۆجاریش جەزرەبەی قامچی داخی ئەکردمو یان عەزیزییەکانم لە تەلەکانی پشتەوە ئەئالان و لەدواییدا بەرئەبووینەوەو ئەکەوتینو دەمو پلمان پڕ ئەبوو لەخوێن و عەزیزییەکانیشمان هەڵئەتلیشان .

لەکۆتایی چلەکانو سەرەتای پەنجاکاندا، دوو دیمەن هەبوون یەکێکیان ئەیترساندمو ئەویتریان ئەیهێنامە پێکەنین .

یەکەمیان: وەختێ لەکونەکەی گومەزی حەمامی موفتی-یەوە لە سابونکەران، لەسەرەوە بۆ خوارەوە تەماشام ئەکرد، کابرایەکی نیوە ڕووتی لاوازم لەبەردەمی توونی بەئاگردا ئەبینی. تونچییەکە پەیتا پەیتا ئاگرەکەی خۆش ئەکرد. من ئەترسامو ئەو جەهەننەمەم بیرئەکەوتەوە کەدایکم بۆی باسکردبووم .

دووەمیان: لەسەر شەقامی مەولەوی، بەرامبەر کەسپەڕی مەی فرۆش، کۆگاکەی حسێنە فەندی بوو. ئەم پیاوە ئەیویست شتی تازەو نەبینراو بێنێتە سلەیمانییەوە. کۆگاکەی ڕازاوەو جوانو جامخانەکەی ئەبریسکایەوە. لەناو جامخانەکەی دەستە چەپدا، مۆکێتێکی حاجی لەق لەقی دانابوو، هەرتاوە ناتاوێ، حاجی لەقلەق ئەجوولاو، ملی دائەنەواندو بەدەنووک ئاوەکەی بەردەمی ئەخواردەوە، جاری واهەبوو نیو سەعات زیاتر بەدیارییەوە ئەوەستامو ئەیخستمە پێکەنین .

دیمەنی شێتەکانی ناو سلێمانیش خۆی بۆ خۆی مایەی تێڕامان و بەزەیی و لەسەر وەستان بوو .

من سالە شێتم دیبوو، بەدیزداشەیەکی جاوەوە، سەرتاشراو، ئەکەوتە سەر شەقامەکانو خەڵکی تووڕەیان ئەکردو ئەویش بەردەبارانی ئەکردن .

بەهادینە شێت؛ برای مەلا فایەق، ئەمیش نەگبەتێکی تریان بوو. سەرووڕیش هاتوو، چلکن، بەردەوام پەڕە کاغەزو جەریدەی فڕێدراوی ئەچنییەوەو ئەیانوت خوێندەوارەو ئینگلیزیش ئەزانێ.

عەبە شەکەنەو بازەکانی و گریانەکانی؛ کە خەڵکی بەشوومیان ئەزانی و لێی ئەترسان. بەخۆی و فەقیانە چلکنەکانییەوە، بێدەنگو بێوەی. تا نۆزدەی قەڵب-یش کە لەشەستەکاندا بەردەوام لەسەر شەقامی مەولەوی بوو .

شەقامی مەولەوی؛ خۆشترین شەقامی ئەوسای شاربوو، کۆگا گەورەو دوکانە مۆدێرنەکان کەوتبوونە سەر ئەو شەقامە. لەخوار بەردەرکی سەراوە بەدەستە

راستدا، سەعاتچییەکەو، وەستا کەمالی خەیاتو لەولاترەوە، کتێبخانەی گەلاوێژی ڕەووف مارف، کە شوێنی گۆڤارو کتێب فرۆشتن بوو، هەندێ لەخوێندەوارو ڕووناکبیرەکانی سلەیمانیش لەوێ یان لەناوەوە یان لەدەرەوە ڕائەوەستان .

من؛ بۆ خۆم لەوێ مامۆستا برایم ئەحمەد و گۆران و هەردی و عەبدوللا جەوهەر و دیلان و کامەرانم ئەبینی، بەتیلەی چاو تەماشام ئەکردن .

دووکانە گەورەکەی شێخەی نوقل، وەستا عەبدوللای خەیات، بەوبەرەوە لەسووچەکەدا دوکانەکەی عەبدوللا زوهدی بۆ پێلاو فرۆشتنو دروستکردنیش، لەمبەرەوە، دووکانی کەریم ئاغای خەیات، کە خاڵی باوکیشم بوو. هەمیشەیش کۆمەڵێ بەڕێوەبەرو مامۆستای قوتابخانەو شەوکەت ئاغای خزمی باوکمو حەمە ئەمین ئاغای باوکی هونەرمەند کاک فوئادو عوسمان ئەفەندی و زۆری تریش لەوێ مەجلیسیان گەرم ئەکردو کەریم ئاغایش بەپێوە خەریکی ئیشکردن بوو .

ئینجا دوکانی ئیبراهیمی سنجەرو، کۆگاکەی حاجی عەبدولوەفاو، هەندێ واوەتر، دووکانەکەی بەهجەتی سەعاتچی، کە خۆی کەمانچەژەنیش بوو لەتیپی مۆسیقای مەولەویداو بەردەوامیش قادر دیلان و حاتەم و نەجاتی عەبدەو دوکتۆر ئومێد لەوبەردەمەدا ڕائەوەستان .

خوارتر؛ دووکانە گەورەو ڕازاوەکەی ئەوڕەحمانی باتە بوو، کە بۆ سلەیمانی ئەو سەردەمە شوێنێکی تازەو پێلاوی باشی تیا ئەفرۆشرا. لەبەردەمی باتەیشدا، زۆرجار ئەحمەدی حاجی ساڵحی قاسم و حسەینی مەلا حەکیم و ئەنوەر ئەدهەم و جەمیلی سەعی بەگو عومەری مچەو کەسانی تر ڕائەوەستان. بە بەری ئەو بەریشەوە دووکانەکەی کەسپەر بۆ مەی فرۆشتن، خۆشی پیاوێکی سورفلەی دەمو چاو گەورەبوو لەپشت مێزەکەوە دائەنیشت .

موحەڕەم محەمەد ئەمینی چیرۆکنووس؛ زۆرجار لەوێدا ئەوەستا. بەرامبەر دووکانەکەی کاک بەهجەت، کاک حەمەی پێلاوفرۆش کە بەحەمە قۆندەرە ناوزەد کرابوو، لەوێدا بوو. بەتەنیشت ئەوەوە، چایخانەکەی مام ساڵح بوو، لەولایەوە دووکانەکەی حسە ڕەشی خەیات بوو. ئەوەی لێرەدا پێویستە لەسەری ڕاوەستم، چایخانەکەی مام ساڵح-ە .

چایخانەیەکی بچکۆلە بوو، دوو قەنەفەی تەختەو دە دوانزە کورسی تاکی نزمی تێدابوو. مام ساڵح؛ چایچی ئەو دەوروبەرە بوو، یەکێک لەکوڕەکانیشی یارمەتی ئەدا. مام ساڵح پیاوێکی تووڕەوترۆ بوو. هەمیشە چاوەکانی سوورو خۆیشی گرژومۆن بوو، بەڵام بەو تەمەنەوە گورج و گۆڵ بوو. بەدرێژایی چەند ساڵێ من ئاموشۆی ئەم چایخانەیەم ئەکرد. کۆمەڵێ لە ڕووناکبیرانی ئەوکاتە ڕوویان تێئەکرد، بەتایبەتی مامۆستا عەبدوڵلا جەوهەر، هەمیشە لەدوای نیوەڕوانەوە لەوێ دائەنیشت، تا ئەچۆوە بۆماڵەوە. کامەران و دیلان و ناوبەناو ئەخۆل و هەردی و فەرەیدون عەلی ئەمین و سەلاح ئەحمەدی و قادری میرزا کەریمو زۆری تریش لەوێ دائەنیشتن .

من؛ هەر لەم چایخانەیەدا پێموایە دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز بوو، بۆ یەکەمجارو ئاخر جار شەهید موعینی-م بینی. کەزانی من کێم، کەوتە قسەکردن لەگەڵمدا، زۆر بەرز بێکەسی نرخاند. من ئەوسا لەژێر کاریگەری بیری نەتەوەییدا بووم، کەوتینە دەمەتەقێ. دیاربوو قسەکانی منی بەدڵ نەبوو. دووسێ کەسی تریشی لەگەڵدا بوو، بەڵام بیرم نەماوە کێ بوون. لەچایخانەکەی مام ساڵح-دا لەمامۆستا عەبدوڵلا جەوهەر نزیک کەوتمەوە. خۆی پیاوێکی هێمن و کەم دوو بوو. بەڵام من بەردەوام پرسیارم لێئەکرد. قسەکانی جەوهەر زۆر جیاوازبوون لەو قسانەی کۆمۆنیستەکان و پارتییەکان ئەیانکردن. ئەم گاڵتەی بەبرایەتی کورد و عەرەب و عێراق ئەکردو تەنانەت کەباسی یەکێتی سۆڤیەتی ئەوساو مافی گەلان ئەکرا، ئەم بە درۆودەلەسەی لەقەڵەم ئەداو هیچ بڕوایەکی پێ نەبوو. دیارە وەک دواتر باسی ئەکەم، من پێشتر لەڕێگەی فەرەیدون عەلی ئەمین-ی ئامۆزازای باوکمەوە، کەوتبوومە ژێر کاریگەری بیری نەتەوایەتییەوە .

شەقامی مەولەوی؛ وەک دڵی شاری سلەیمانی وابوو، هەموو هەواڵ و دەنگوباس و ڕووداوو قسەو باسێک لەوێوە دەرئەچوو. ڕۆژانی چوارشەممانیش ئەمبەرو ئەوبەری ئەم شەقامە گەنجەکان لێی ڕائەوەستان. چونکە لەعەسرەوە ئیتر باخچەی گشتی بۆ ژنان بوو .

ژنان و کچانیش دەستەدەستە بەم شەقامەدا شۆڕ ئەبوونەوە یان سەرئەکەوتنەوە. ئەو ڕۆژگارانە پەچە گرتنەوە کەمتر ببۆوە. تاکو تەرایش سفوور پەیدا بووبوون .

صاحبەی نوری بەگ و هەندێ لەکچانی بنەماڵەی قەفتانەکان، سەردەقشکێنی ئەم سفوور بوونە بوون. لەدوای کردنەوەی سینەمای "ڕەشید"یش ئازادییەکە تارادەیەک زۆرتر بوو. هەڵبەت سینەما، شەوێ بۆ ژنانو شەوێ بۆ پیاوان بوو. بانگەشەی سینەما و فیلمەکە بەشان بەشەقامەکاندا ئەگێڕدرا، فیلمەکە چییەو ئەوشەوە بۆ کێیە، من ناوی دوو کەسیانم لەبیرە. یەکێکیان پێیان ئەوت "بەکر قڕقێنە": گەنجێکی عەنتیکەو بزێوو زۆرزان بوو، لەپڕ قڕقێنەیەکی درێژی ئەدایەوە یان لە حاڵەتی سەیر سەیردا ئەتبینی. وەکو ئەوەی ئەچووە سەر لووتی قەمەرەیەک و ڕائەکشاو دەستێکی ئەخستە ژێر چەنەیی و پێئەکەنی یان لەپڕ پەلاماری لادێییەکی ئەداو ئەیدا بەکۆڵیا. ئەویتریشیان "تەڕەزان" یان پێئەوت، ئەشەلی و چاوێکیشی تانەی لەسەر بوو. دواتر خێزانیش لەگەڵ کەسانی تردا ئەچوون بۆ سینەماو لۆجیان بەکرێ ئەگرت .

سینەمای ڕەشید؛ لەو سەردەمەداو تا شەستەکانیش، فیلمی نایابی جیهانی نیشان ئەدا. من بۆ خۆم هەر لەم سینەمایەدا فیلمە شاکارەکانی وەک "ماڵئاوا ئەی چەک"و "تۆپەکانی ناڤارۆن"و "دیواری شووشەیی" و "کۆتایی هیتلەر"و فیلمەکانی "تەڕەزان"و "خوفاش" و زۆری ترم بینیوە .

یەکێک لەپیاوە قۆزەکانی شاری سلەیمانی ئەوکاتە، کە بەردەوام لەهەموو فیلمە باشەکاندا ئەمبینی، حەسەنی سەید ئەحمەد بوو. پیاوی قۆشمە و قسەخۆش و لە هەمانکاتدا خوێندەوار. لەسەرو دەمێکی تریشدا. ئەچوومە بەر دووکانەکەی "سەید هادی" پول فرۆش، ڕێک بەتەنیشت سینەمای ڕەشیدەوە. ناوبەناو قەرزیشم لێئەکرد. پیاوێکی سەر ڕاستو باش بوو. لەسەرەتای پاییزیشەوە پاڵتۆیەکی عەسکەری لەبەر ئەکرد تائەکەوتینە بەهار. بەرامبەر بەویش چایخانەی ئەوقاف بوو، تەقەتەقی دۆمینەو تاوڵە ئەگەیشتە ئەمبەر، لەم لایەوە دووکانەکەی "کیفام" بوو، کیفام باوکی "هایک"ی هاوڕێی قوتابخانەی فەیسەڵییەم بوو. برایەکی تریشی هەبوو لەئێمە گەورەتربوو ناوی "ئەلبێرت"بوو، ئەرمەنی بوون. کیفام؛ پیاوێکی سورفلی کورتە بالابوو. جگەرەو نوقڵ و ساردی و پسکویتو ئەو وردە بابەتانەی ئەفرۆشت. تاک تاکیش جگەرەی پێ ئەفرۆشتین. گرێڤن و کەمێلی ئەوسا، مژان خۆشو بۆن و بەرامەیان بەچواردەوردا بڵاوئەبۆوە. لەبەر دووکانەکەی سەی هادی-دا، یان ئەوانەی هامشۆکەری ئەوێ بوونو ئەمدین و لەوێدا ڕائەوەستان "فەرەیدون عەلی ئەمینو جەمشیدی فوئادە فەندی و کەریم باراوی و ئەنوەر فەخریو عەبدوڵلا مەجید بەگ" بوون .

هەر بەتەنیشت سەی هادییەوە، چایخانەکەی حاجی سالح بوو، ئێواران لەگەڵ هاوڕێکاندا لەوێش دائەنیشتین، بەتایبەتی لەزستاندا، زۆپاکە دائەخراو ژوورەوە گەرم گەرمو بەسەعات ئەماینەوە. لەم چایخانەیەدا 'قادر زەکی'مان ناسی، پیاوێکی دەمو چاو درێژی پەنجەکوڵ بوو. خۆی شۆفێر بوو لەدائیرەی ئیشغال، زەینێکی تیژو دەموپلێکی پاراوی پێوەبوو. بەحسابی خەڵک فشەکەر بوو، بەلام من ئێستا تێئەگەم ئەو پیاوە چ خەیاڵێکی فراوانی هەبوو. لە نەبوو حیکایەتی دروست ئەکرد. حیکایەتەکان سەرسامیان ئەکردی. بەجۆرێک ئەیچنی مەگەر هەر ئەوانەی چیرۆکی پۆلیسی ئەنووسن، بتوانن بەوجۆرە دایڕێژن‌و کەلێن‌و بۆشایی تێنەخەن. هەموو چیرۆکەکانیشی خۆی پاڵەوانی بوو !

بۆ نموونە ئەیوت: ئەم دەستە ئەبینن بۆ وا کوڵ بووە؟ ئەوە جێگەی گازی دەمەشێرە!. ئینجا با بۆتان بگێڕمەوە. ئیتر دەستی پێئەکردو ئەیبردیتە تاران و توورا‌ن و ناو دارستان‌و تۆیش بۆ ماوەی سەعات زیاتر گوێ قولاغ ئەبوویت و حەزت نەئەکرد دوایی بێت .

من هەرچەندە ئەم پیاوەم بیر ئەکەوێتەوە ئەڵێم: (ئەگەر ئەمە لەوڵاتێکی تردا بوایە، بەو خەیاڵە فراوانەوە، ئەشێ چیرۆک نووسێکی گەورەی لێ دەرچوایە).

دوای ئەوەی پۆلی شەشم تەواوکرد، چوومە قوتابخانەی ناوەندی سلەیمانی، هەوڵیشیان بۆدام لەبەشی ناوخۆ وەرگیرام. بەشی ناوخۆیی (داخلی)، ئەو خانووە بوو کە لەسەردەمی شەستەکاندا کرابوو بەئینزیبات خانە. هەشت نۆ ژوورێکی تێدابوو، هەر ژوورەو دوو قەرەوێڵە یان سێی تێدابوو. پیرە باوڵم برد، هاتمە هەواری تازەم.

یەکەمجار بوو لەچوار دیواری ماڵو لەکەسوکار دابیڕێمو دایکمو هەردوو خوشکەکەم لەبەغداو، ماڵی خاڵیش نەماو، بۆیە یەکەم شەوی بەشی داخلیم بەپەژارەو خەمێکی زۆرو گریانێکی بەکوڵەوە ڕۆژکردەوە .

ئەوساڵەی خوێندنم پچڕپچڕو باری دەروونیم هەر ئێجگار شپرزەو نائارام بوو. هەر لەو کاتەدا بوو لەبزووتنەوەی قوتابیان نزیک کەوتمەوە. هەر لەم بەشەدا کاک "عەباس ڕۆستەم"م ناسیی، ئەو لەمن گەورەتربوو، بەڵام بەڕاستی دڵنەوایی ئەکردمو خۆشی ئەویستم. ئیتر بەهۆی کاک عەباس و هەندێ قوتابی لەخۆم گەورەترەوە، کە سێ چوارێکیان وەک کاک محێدین و عەبدولخالق لەتەوێڵەو بیارەوە هاتبوونو لەبەشی ناوخۆ وەرگیرابوون، چوومە ناو ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە. بیرمە شەوێکیان سەتڵێ بۆیەو فڵچەیەکیان دامێ و وتیان برۆ لەسەر دیوارەکان دروشمی "بڕوخێ حیلفی تورکی- پاکستانی" بنووسە.

منیش چوومو هەر لەو نزیکانەی خۆمان کارەکەم جێبەجێکردو گەڕامەوەو ئەوانیش ئافەرینیان لێکردم. ئەو ساڵە خوێندنم بێ ئەنجام بوو..

دیسانەوە لە ڕیازیاتدا- ماتماتیک کەوتمەوە..! ڕیازیات بۆ من ببوو بە مۆتەکەی قوتابخانە! من خەتم خۆش بوو، لەبەر ئەوە گەلێجار بەیاننامەیان ئەدامێ و منیش کۆپیەم ئەخستە ژێرو بەچەند نوسخەیەک ئەمنووسینەوە .

لەنێوان ساڵانی (١٩٥٤-١٩٥٦)دا تێکەڵاویم لەگەڵ گەنجە سیاسییەکاندا زۆرتر بوو. چایخانەی بەهەشتیی حەمە ڕەق، کە لەجێگەی ئێستەی سینەمای سیرواندا بوو، چایخانەیەکی پان‌و پۆڕو فراوان بوو. لەناوەڕاستی چایخانەکەدا حەوزو فوارەیەکی تێدا بوو، هەمیشەیش تۆپێکی باغە بەسەر فیچقەی فوارەکەوە ئەسووڕایەوە. یاری دۆمینەو تاوڵەی تێدا ئەکرا، ئەبوو بەبانگە بانگو تەقەتەق. بەلام ئێمە کۆمەڵێک بووین، لەسووچی سەرەوەی چایخانەکە دائەنیشتین. ڕۆژنامەمان ئەخوێندەوەو لەسۆراخی هەواڵ و دەنگوباسی سیاسیدا بووین. هەر لەم پەنایەدا، بۆیەکەمجار فەرەج ئەحمەدو جەلال میرزا کەریم‌و حسەین عارف‌و سەلاح ئەحمەدو ئەورەحمانی حەکیم و ئەنوەر عوسمان‌و زۆری ترم ناسیی .

ئەم کۆمەڵە؛ هەموویان کۆمۆنیست بوون. لەوکاتەدا زۆربەی زۆری گەنجەکان لەشاری سلەیمانیدا لەڕێکخستنەکانی حزبی شیوعیدا کاریان ئەکرد. پارتییەکان کەمتر بوون. لەو سەردەمەدا، وەک پیاوی قارەمان باس هەر باسی بەهادین نووری و حەمید عوسمان و خۆڕاگری ئەوان ئەکرا لەزیندانەکانی ڕژێمدا.

پێش ئەم ڕۆژگارەیش، من بۆ خۆم وێنەی "کاکەی فەللاح"م بەدیوارەکانەوە ئەبینی، کە پۆلیس هەڵیواسیبوون‌و خەلاتیان دانابوو بۆ هەرکەسێ خەبەربداو شوێنەکەی بۆ میری ئاشکرا بکات..! ئەو دەمە عومەر عەلی موتەسەڕیفی سلەیمانی بوو. هەر لەو ساڵانەدا یەکێک لەو بیرەوەرییانەی هەرگیز بیرمناچێتەوە ئەوە بوو :

تازە چووبوومە ناوەندی سلەیمانی، ڕۆژێکیان لەیەکەم دەرسدا بووین، مامۆستاکە چووە دەرەوەو هاتەوەو، وتی "باهەمووومان بچین بۆ هۆڵەکە ."

هۆڵی ناوەندی سلەیمانی؛ تا ئەوکاتە گەورەترین هۆڵی شاری سلەیمانی بوو. هەموو قوتابیانی قوتابخانەکە کۆبوونەوە. چەند دەقیقەیەکی نەخایاند، بوو بەچرپەچرپ‌و مقۆمقۆو، لەپڕێکدا بێدەنگ بوونێکو، موتەسەڕیفی سلەیمانی عومەر عەلی‌و چەند قۆمیسەرێکو بەڕێوەبەری قوتابخانەیشیان لەگەڵدا بوو. عومەر عەلی چووە سەر شانۆکەو، دەستیکرد بەقسەکردن کە حکومەت چۆن ئەیەوێ خزمەتی ئەمشارە بکات‌و ئینجا هاتە سەر ئەوەی شیوعیەکان ئەیانەوێ گێرەشێوێنی بکەن‌و ولات تێکبدەن، ئیشارەتێکی کردوو، بەناوڕیزەکەدا. گەنجێکی کەلەپچە کراویان هێنایە پێشەوە، بۆ ئەوەی وەک نموونەی ئاژاوەچی نیشانی ئێمەی بداو چاوترسێنمان بکات .

گەنجەکەیش بێدەنگو سەربەرز ڕاوەستابوو. ئەم دیمەنی کەلەپچەو گرتنە، بۆ هەموومان مایەی بێزاری بوو، جگەلەوەی بەپێچەوانەوە ئەو گەنجە لای ئێمە بوو بەنموونەی ئازایەتی و بوێری و خۆشمان ویست، "عومەر عەلی"یشمان وەک تاوانبار هاتە بەرچاو .

دواتر زانیم ئەو لاوە "شێخ صدیقی شێخ مەحمود"بووە. ئیتر ئەو ڕۆژەو تاچەند ڕۆژێکی تریش بەدەیان پرسیار لای من دروستبوون (بۆچی گیراوە؟! چیکردووە؟! ئەبێ لە چ زیندانێکدا بێ؟! کەی بەرئەبێ؟) بەکورتی ئەو دیمەنە بۆ من مایەی ڕاچڵەکین و وریابوونەوە بوو. دڵنیانەبوون بوو لەدوارۆژ..! ئەو دیمەنە تێیگەیاندم ژیان بەژارو ژەنگو پڕ لەڕووداوە .

کێ ناڵێ ئێمەیش سبەینێ بەجۆرێکی تر کەلەپچە ناکەن.!

کۆڕو گردبوونەوەی ناو چایخانەی حەمە ڕەق بەردەوام بوو، ئەو ساڵانە بەدزییەوە یادی جەژنی نەورۆز ئەکرایەوە. پێموایە بۆ نەورۆزی (١٩٥٥) بوو، قوتابییەکان بڕیاریاندا بوو، بچینە دەرەوەی شار. لەخوار باخی شێخ لەتیف-ەوە کە ئەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شار، بەرەو ڕێگەی قەرەداخ .

بەیانییەکەی هەریەکەو بەپرپاسکەو خواردنی خۆیەوە، لەوێدا گردبووینەوە. لۆریەکی بەتاڵی گەچاوی هاتو هەمووومان چووینە ناوی و لێخوڕە بەرەو خوار. وتیان (ئەچین بۆ "چەقڵاوە"). چەقڵاوە؛ ئەکەوتە کەناری جۆگەی تانجەرۆ، شوێنێکی بەگژوگیاو پڕ لەگوڵە هێرۆ. لەوێ هەمووومان دابەزین. شوێن سەیرانی خۆمان خۆشکرد. ئاگرمان کردەوەو، دەستکرا بەگۆرانی و هەڵپەڕکێ .

فەرەج ئەحمەد؛ وتارێکی خوێندەوە، بەکۆمەڵ و پێکەوە سروودی نەورۆزمان وت. تەمسیلێکیشیان ئامادەکردبوو بۆ کاوەی ئاسنگەرو ئەژدەهاک، من لەو تەمسیلەدا یەکێک بووم لەکوڕەکانی کاوە. بەوجۆرە تادەمەو ئێوارە ماینەوەو ئینجا گەڕاینەوە بۆ سلێمانی .

دووجاری تریش دوای ئەوە لەبۆنەی جیاجیادا، ڕێم کەوتەوە چەقڵاوە، ئەم سەیرانانەی چەقڵاوە، هۆش‌و گۆشی گەشتر کردمەوە. پەیوەندیم بەرفراوانتر بوو. ئەمە جگەلەوەی هەستمکرد منیش ئەتوانم وەک کەسانی تر کاربکەم‌و جێ پەنجەم دیاربێ‌و دەرکەوم‌و قسەبکەم‌و گوێم لێبگیرێ .

لەو ڕۆژگارانەدا ڕۆژنامەی "ژین"، بۆ ئێمە تاقە پەنجەرەی ئەدەبو شیعرو ڕووناکبیری بوو. بۆیە بەشەوقەوە وەک تینووی ئاولەچاو چاوەڕوانی هاتنی هەموو پێنج شەممەیەکمان ئەکرد، بۆ ئەوەی بگاتە دەستمان و بیخوێنینەوە. زۆربەی هەرە زۆری قەڵەمە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی لە (ژین)دا ئەیاننوسی، گۆرانو دیلانو کامەرانو مەحەڕەم محەمەد ئەمینو جەمال بابانو مستەفا سالح کەریمو هەندێ لەتازە پێگیەشتووەکانیش .

هەر لەو سالانەدا سێ کوچکەیەک بەناوی شیعری ئازادەوە، بەرهەمەکانی خۆیان بڵاوئەکردەوە، کە بریتی بوون لە کامیل ژیرو نوری وەشتی و نەسرین فەخری، بەڵام وەک سەرئەنجام نەیانتوانی ئەو شیعرە ئازادە دروست بکەنو پووکانەوە .

مامۆستا "ف"یش یەکێک بوو لەقەڵەمە بەبڕشتەکانی ئەم ڕۆژنامەیە .

مامۆستا "ف" فەرەیدوون عەلی ئەمین؛ ئامۆزازای بێکەس بوو، مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو. گەنجێکی خوێندەوارو بەدەموپلو قسەکانی ئەچوونە دلمەوە. دوای ئەوە ئیتر پەیوەندیمان بەردەوام بوو، ئەچووم بۆ ماڵەوە بۆلای. هەمان ماڵە کۆنو حەوشە گەورەکەی حاجی مینەی کاکە حەمە، کە باوکمو مامیشم بەمنداڵی تیا ژیاون .

لەدوای درەگای حەوشە، دالانێکی دووردرێژ، کە هەردووبەری کرابوون بە سەکۆ بۆ دانیشتن. دوای بەدەستە چەپدا سەرئەکەوتیتە سەرەوە، بۆ ئەو بەشەی کە مەلا عەلیو خاوو خێزانی تیا ئەژیان. کاک فەرەیدوون ژوورێکی خۆی هەبوو، کتێبخانەیەکی بچووکیش. لەو ماوەیەدا هەموو هەفتەیەک سەرم ئەدا، ئەویش قسەی بۆ ئەکردم. ئەو قسانە بەقوڵیی کاریان کردبووە سەر بیرکردنەوەم، هەموو جارێکیش کتێبێکم لێوەرئەگرتو دوای خوێندنەوە لەسەردانێکی تازەدا بۆم ئەگێڕایەوە. بەوجۆرەو ئەویش بووە هۆی ئەوەی مێشکم باشتر بکرێتەوەو هوشیارتر ببمەوە .

لە هاویندا، ماڵی دایە خانم، ئاگاداریانکردم، کە دایکم زۆرم بیر ئەکاو حەز ئەکات بچم بۆ بەغدا بۆلی، لەڕاستیدا منیش هەر زۆرم بیرئەکرد. پێیان وتم چەند ڕۆژێکی تر کاک مەسعودی سەید ئەمین ئەگەڕێتەوە بۆ بەغداو لەگەڵ ئەودا ئەڕۆیت و لەوێ ئەتبەنە لای دایکت .

مەسعودی سەید ئەمین؛ خۆی پیاوێکی تورک پەرستو جلخواربوو. ئەو دەمەی لەسلێمانی بوون، هەر لە کولانەکەی مالی نەنکمداو لەو بینایەدا کە زووتر قوتابخانەی گۆیژەی کچان بوو. جار بەجارێ کە دایە خانم بەئیشێک ئەیناردم بۆلایان، ئەمبینی ئەم پیاوە بەردەوام میلی ڕادیۆکەی لەسەر ئێزگەی تورکی دانابوو. بەردەوام گوێی لەگۆرانیی تورکی ئەگرتو ڕۆژێ لەڕۆژانیش دلی بۆ هیچ کارەساتو کلۆلییەکی کورد نەجوولاوە .

ڕۆژی سەفەر هاتو شوێن کاک مەسعود کەوتمو لەگەراج سواری پاس قەمەرەیەک بووینو بەرەو بەغدا کەوتینە ڕێ. من تا ئەو کاتە تەنها جارێک سەفەری کەرکوکم کردبوو، ئەویش بەکۆمەل لەگەل دایکمو خالەکانم و کاک ڕوشدی عەزیزو کاک نیهادی شێخ نوریدا، لەبیرمە لەئوتێلێک دابەزین و بۆ بەیانی گەڕاینەوە، ئیتر نەمزانی ئەم سەفەرە چی بوو یان ئێمە بۆچی چووبووین بۆ کەرکوک .!

جگە لەوێ هیچ شارێکی تری کوردستانو عێراقم نەدیبوو، درەنگانێ کەوتینە ڕێ. ڕێگەیەکی دورو درێژو خۆلاویی، ئەوەندە ئەزانم ئێوارە درەنگ چووینە ناو بەغداوەو ئەوەی سەرنجی زۆر ڕاکێشام، شەقامی ڕەشید بوو. ئۆتۆمبێلی زۆری هەمەچەشنو قەرەبالغییەکی لەڕادەبەدەرو چراخانێکی ڕووناک، کۆگای جوان جوان، سەرم سوڕمابوو. چونکە سلەیمانی بچووک هێمنترو بەو جۆرە ڕووناکو ڕەنگاوڕەنگ نەبوو .

ئێستاش یەکێک لەو وێنانەی پێش ئوتێلی عەلەمەین-م لەبیرە، کە تابلۆیەکی گەورەبوو، پیاوێک بەجلی کوردییەوە، سمێل قیت، شیشێ کەبابی بەدەستەوەو ئەیخستە سەر وەجاخێ، لەسەر تابلۆکە نووسرابوو "كباب السليمانيه". بینینی ئەم وێنەیە دلی کردمەوە.

پاس قەمەرە بەرەو گەڕەکی (الاعظمية) ڕۆیشت و لەپاشماوەیەک لەبەردەمی مالی کاک مەسعود-دا ڕاوەستا. مالێکی خۆش بوو، حەوشەکەی گولو گولزاربوو، چوینە ژوورەوە. ئەبوو ئەو شەوە لەوێ بمێنمەوە، بەلام تابەیانی خەوم لێنەکەوت .

سەید ئەمین؛ خۆی سێ کوڕی هەبوو، جەنابو ئەکرەمو مەسعود، لەگەل تاقە کچێ کە ناوی پاکیزە بوو. بەتەمەن زۆر لەمن گەورەتر بوو، بەلام چەند سالێ بوو شێت بووبوو .

پاکیزە؛ جوان و نازدارو سپی پێست و دەمو چاوێکی پانو گەشی پێوەبوو. خستبوویانە ژوورێکەوەو دەرگایان لەسەر داخستبوو..! بەردەوام قاقای لێئەداو لەبەر خۆوە بەکوردی و عەرەبییەکی تێکەڵ قسەی ئەکردو بووکە شوشەیەکیشی بەدەستەوە بوو، ماچی ئەکرد. ئەم دیمەنە لەیەکەم ساتەوەختی بەغداوە منی ترساند، یان بابڵێم شڵەژاندمی .

من؛ لە ژوورەکەی تەنیشتی نووستم، بەڵام تابەیانی بیرم لەم ژنە کردەوە. ئەبێ لەبەرچی وای لێهاتبێ..؟! بەهەرحاڵ ڕۆژ بۆوەو دایکم ئاگادارکراو کاک عومەر خۆی هات بردمی. بەشی خوارەوەی خانوویەکیان لەگەڕەکی (فەزل) بەکرێ گرتبوو، گەڕەکێکی میللی بوو. کوڵانەکان پیسو پۆخڵ و لەناوەڕاستدا جۆگە ئاوێکی ڕەشی زێراب بەرەو خوار ئەبۆوە. بۆنی گەڕەک، ناخۆشو بەدەنگە دەنگو ئەتوت لەهەموو لایەکەوە شەڕە. بەدیداری دایکم و هەردوو خوشکەکەم شاد بوومەوە .

فریشتەو گەزیزە لەوێ خرابوونە مەکتەب، شتێ عەرەبی فێرببوون. بۆیانگێڕامەوە کە لەسلێمانیەوە ڕێواسیان بۆ ناردوون، ئەمانیش هەندێکیان بردووە بۆ مەکتەب و لەوێ بەناوی ئەوەوە کە ئەمە (مارە) کچە عەرەبیان پێ ترساندون، ئەوانیش بڕوایان کردووەو وتویانە کورد مار ئەخوات.

هەر لەو سەفەرەدا، دوای یەکدوو ڕۆژ، بۆیەکەمجار "محەمەد تۆفیق وردی"م ناسیی، وابزانم هەر لەهەمان حەوشەدا، ئەویش ژوورێکی بەکرێ گرتبوو، لەگەڵ خۆیدا بردمیە دەرەوە، چووین بۆ دوکانەکەی "بەشیر موشیر"و لەنزیکەوە بۆ یەکەمجار مامۆستا "ڕەفیق حیلمی"م ناسیی. زۆری پێخۆش بوو، کە منی بینی یەکسەر دەستیکرد بەگێڕانەوەی هەندێ لەقسەکانی باوکم. هەروەها لەگەڵ کاکە عومەردا چووین بۆلای "هەژار"ی شاعیر، کە لەسەر شەقامی غازی ستۆدیۆیەکی بچووکی وێنەگرتنی هەبوو. ئەوەش یەکەمجار بوو کە هەژاری موکریانی لەنزیکەوە ببینم.

لەساڵی تازەی خوێندنی (١٩٥٤-١٩٥٥)دا قوتابخانەی دواناوەندی پیشەسازی لەسلەیمانی کرایەوە. ئەگەرچی من حەزم لەم قوتابخانەیە نەئەکردو، پیشەسازی و خولیاکانی من زۆر لەیەکەوە دووربوون، بەڵام لەبەرئەوەی وەرگرتن لەبەشە ناوخۆییەکەی مسۆگەر بوو، منیش پەرەوازەو بێ ماڵ بووم. لەبەر ئەوە ئەوراقی ئاساییم پێشکەشکردوو وەرگیرام .

لەو سەردەمەدا، بیناکەی پیشەسازی دوا خانووی شاری سلەیمانی بوو، تائێستایش ئەو قوتابخانەیە هەر ناوەندی پیشەسازییە. من چوار ساڵی تەواوی ژیانم بەخوێندنو خواردنو نووستنەوە لەو ژوورانەدا بەسەربردووە. هاوینانیش ئەچوومەوەو لای دایکم یان ماڵی خاڵم. ژوورەکانی بەشی ناوخۆ، قەرەوێڵەی دوو قاتییان تێدا دانرابوو، یەکێ لەسەرەوە ئەنوستو ئەویتر لەخوارەوە. ژوورەکەی ئێمە گەورەبوو، لەبەر ئەوە بیست قوتابیەکی لەخۆگرتبوو. هۆڵی خواردنیش هەر لەهەمان بینادابوو، بە قۆنتەرات گیرابوو. هەر لەیەکەم ساڵەوە چەندین قوتابی ناوچە جیاجیاکانی سلەیمانی بوونە هاورێم .

شارباژێری و قەرەداغی و بەرزنجەیی و هەڵەبجەیی و زۆر شوێنی تریش. مامۆستاکانمان هەندێکیان کوردو چەند مامۆستایەکی عەرەبیشمان هەبوو، مامۆستای چاودێری بەشی ناوخۆ، کە هەر خۆیشی لەگەڵ ئێمەدا ئەژیاو ژوورێکی هەبوو، خەڵکی کەرکوکو تورکمان بوو. قوتابیەکان ناویان لێنابوو (عەلی مەڕی) .

بەڕێوەبەری قوتابخانەیش مامۆستا عەزیزی سەعیدی مەلا هەباس بوو. هەر لەو ساڵەدا مەلیک فەیسەڵی دووەم هات بۆ سلەیمانی و ئێمەیشیان بردە سەرجادەکە بۆ پێشوازیکردنی .

جیهانگیر؛ بەخۆیی و مایکرۆفۆنی سەر ئۆتۆمبێلە گەڕۆکەکەیەوە هاوار هاواری بوو، زوو زوو ڕایئەگەیاند کە "کەژاوەی مەلیک گەیشتە بازیانو تاسلووجەو کەندەکەوەو قلیاسان"و تا هاتە بەردەمی قوتابخانەکەی ئێمە، دوا بەدوای ئۆتۆمبێلەکەی مەلیک فەیسەڵ، ئۆتۆمبێلێکی تر هات. ئیتر خەڵکەکە کردیان بە هاوار هاوار و ئەیانوت "بژی مەلیکی کوردستان"، جەماوەرەکە سەرەو ژوور بوونەوەو منیش بەدوایاندا، ئۆتۆمبێلی فەیسەڵ خۆیکرد بەماڵی موتەسەڕیفدا (سەرۆکایەتی زانکۆی سلەیمانی ئیستا) ئۆتۆمبێلەکەی شێخیش بەجادەی ئەمین زەکیدا بەرەو کانێسکان هەڵکشا.. ئاڵەم ئاستەدا، خەڵکەکە ئۆتۆمبێلەکەیان لەئەرز بەرزکردەوە، من پێشتر وەک باسمکرد لەدەمی ئایشێ عەلانەوە، ئەو پیرێژنە پیرۆزەوە، گوێم لەبەیتو داستانی شێخ مەحمود ببوو. ئەمە جگە لەوەی زۆرجار پیاوانی بەساڵداچوو، شەڕەکانی ئاوباریک و بازیانو تاسڵوجەی شێخ مەحمودیان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ئەگێڕایەوە .

لێشاوەکە ڕوویکردە گەڕەکی شێخان، لەبەردەم ماڵێکی حەوشە گەورەدا شێخ دابەزیی‌و چووە ژووری‌و منیش بەدوای ئەواندا. یەکەمجار بوو ئاوا لەنزیکی چەند مەترێکەوە، شێخ مەحمود ببینم .

بەم بینینە خۆزگەیەکەم هاتەدی، لەسەر تاکێ کورسی تەختەی پشت بەرز دانیشتبوو، چاوی تەڕو غەمبار دیاربوو..! ئەوکاتە تەواو پرو لاوازو بێتاقەت بوو، مشکییەکی گەورەی بەستبوو، خەنجەرەکەی هەر بەقەدییەوە بوو، لەو دیمەنەدا من شێخم وەک شێرێکی بەساڵدا چوو ئەهاتە پێشچاو. شێرێک گوڕو تینی جارانی تیا نەمابێ و بەچاوی خەیاڵ و بیرەوەریی غەمگینانەوە بیر لەڕۆژانی ڕابوردووی نەڕە شێریی و کارە گەورەکانی خۆی بکاتەوە، هەتا ئێستەیش دیمەنی ئەو سومبولە گەورەیە لەو دانیشتنەدا لەبەرچاومەو ناڕەوێتەوە. ئەوە یەکەمجارو دواجار بوو کە شێخی نەمر بەزیندوویی ببینم..

عەلی سالّح یەکەم جگەرەی دامیٚ؛
کۆمۆنیستەکانیش ژیانێکی تالّ..

لەپۆلی شەشی سەرەتاییدا بوو، هەستمکرد من لەچاو زۆربەی زۆری هاورێکانمدا، لەداڕشتندا بەزمانی کوردی باشترم.

دلداری ئەو سەردەمە لە کاغەز ناردنەوە بۆ ئەو کچەی خۆشت ئەویست، یەکەم هەنگاوبوو. بیرمە هاورێکانم ئەهاتن بۆلام و تکایان لێئەکردم من نامەکانیان بۆ بنووسم. لەبەشی ناوخۆی قوتابخانەی پیشەسازیدا من هەر خەریکی خوێندنەوەی شیعری گۆران و هەردی بووم، ژمارە کۆنەکانی گۆڤاری گەلاوێژم ئەخوێندەوە. ئەمجارەیان لەشیعرو ئەدەبیاتەکەی ڕەفیق حیلمی باشتر ئەگەیشتم. بەشی هەرە زۆری پەندەکانی پیرەمێردم لەبەربوو، کەمتر شیعری کلاسیکیم ئەخوێندەوە. لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا ئێمە لەحوجرە نەمانخوێندبوو، لەبەشێکی زۆری ئەو وشە عەرەبیانە یان تورکیو فارسیانە نەئەگەیشتین کە شاعیرە گەورەکانی کورد، وەکو نالیو سالمو کوردیو مەحوی بەکاریان هێنابوون، لەبەر ئەوە زوو تاقەتم لێیان ئەچوو .

ئێمە لەگەل زمانی تازەی گەلاوێژو ژینو شەفەقو هیواو ڕۆژی نوێ-دا پێگەیشتین و بەوان ئاشناتر بووینو ئەوان لەڕۆحی ئێمەوە نزیکتر بوون. لەقوتابخانەدا خەیال و خولیای من ئەوەندەی بەدەوری شیعرو ئەدەبەوە بوون، ئەوەندە بەتەنگ دەرسو بەرنامەی خوێندنەوە نەبوون. بیرمنایە لەشەوانی

تاقیکردنەوەیشدا بەجیدی سەعیم کردبێ. گوێم نەئەدایە جلوبەرگی بەری خۆم. قژم هەمیشە بژو دانەهێنراو بوو. ئەو چاکەت‌و پانتۆڵەی بەتازەیی لەبەرم ئەکردن، کۆن‌و پەڕپووت ئەبوون‌و تافڕێم ئەدان ئوتویان بەخۆیانەوە نەئەدی.

لەو تەمەنەدا زۆریشم نەئەخوارد، پێش هەموو قوتابییەکان، دەستم هەڵئەگرت. یەکدوجارێ خۆم تاقیکردەوە، ببمە وەرزشکار، بەلام سەرکەوتوو نەبووم‌و بوومە جێی گاڵتەو قەشمەری هاوڕێکانم..! ئیتر منیش بەتەواوی وازملێهێناو نەچوومەوە بەلای وەرزشدا. بەلام هەتا ئەم تەمەنیش، هەمیشە حەز بەسەیرکردنی یاری باش ئەکەم، بەتایبەتی تۆپی پێ .

کەمال سەلیم؛ هاوڕێم بوو، یەکێکیش بوو لەوەرزشکارە هەڵکەوتووەکان، لەکۆتایی چلەکان‌و سەرەتای پەنجاکاندا لەمەکتەبی فەیسەڵییەیش چەند وەرزشکارێکی ناسراوی ئەو کاتە و دیار هەبوون. وەکو: کەمال عیزەت‌و ئەلبێرت و فایەق‌و عەبدوڵلا سەبری، ئەمان زیاتر یاری بالەو گۆڕەپان و مەیدانیان ئەکرد. لە حەوشەکەی مەکتەبیشدا، زۆجار یاری باسکەی نێوان تیپەکان ئەکرا، تەختەیەکی ڕەش دائەنرا و یەکێک بە تەباشیر خاڵەکانی تۆمار ئەکرد. نازانم لە چ تیپێکدا بوون، بەلام من عەبدوڵلای کەریم چاوشین و مومتازی نوری عەلی-م بینیوە کە لەوێدا یارییان کردووە. دیارە وەرزشکارە دیارەکانیشم ئەناسی و مەرحەبام لەگەڵ یاسین و حەمە بۆرو قالە ڕەش‌و هەندێکی تریاندا هەبوو. دواتریش دۆستایەتیم لەگەڵ جەمالی عەلی باپیردا پەیداکرد، چونکە ماڵی ئەوانیش هەر لە ئیسکان بوو. لەمامۆستا وەرزشکارەکانیشدا لەمەکتەبی فەیسەڵییە داودە فەندی کە خۆی خەڵکی موسڵ و مەسیحیش بوو، ئەو مامۆستای وەرزش بوو. هەروەها مامۆستا عەزیز و قالەی خەلیل‌و لەپێش هەموویشیانەوە مامۆستای گەورە ساڵح عەلی بوو. بەڕاستی ئەم پیاوە ئەهێنێ قسەی زۆری لەسەر بکرێ و ئەهێنێ پەیکەرێکی بۆ دروستبکرێ. ئاخر بەر لەنیو سەدەو زیاتر لەم شارەدا ئەو لەپێشەنگەکانی کاروانی وەرزش بووەو چەندین نەوەی بەڕۆحی پاکی وەرزش پەروەردە کردووەو ئێستە ئەزانین، کە لەوەختی خۆیدا نرخی ئەم پیاوەمان نەئەزانی و تەنانەت گاڵتەیشی پێئەکرا. کاتی ئەوە هاتووە لەئێستەدا یان لەداهاتوویەکی نزیکدا جوانترین هۆڵی وەرزشی بەناوەوە ناوبنرێ.

لەبەشی ناوخۆدا فێری جگەرەکێشان بووم. یەکەم جگەرەیش هاوڕێم عەلی ساڵح سەعید دایمێ، جگەرەکەیش لەجگەرەی پاکەتی "تورکییە" بوو کە

کارگەکەی لەبەغدا بوو، خاوەنەکەیشی عەبدوڵلا لوتفی بوو. جگە لەتورکییە لەو جگەرە بێ فلتەرانە غازی و موختاریش هەبوون، هەڵبەت گرێڤن و کەمێل و ڕۆسمان بەئێمە نەئەکرِدران .

مامۆستای زمانی عەرەبیمان کورتە بالایەکی قژ لوولی دەمو چاو پان بوو، نیشانەی کانی خورمایەکی گەورە بەڕوومەتییەوە بوو، خۆی عەرەبو خەڵکی نەجەف بوو. لەپۆلی دوو سێدا مامۆستامان بوو، منی خۆشئەویست، چونکە لە "ئینشادا" زۆر باش بوومو هەمیشە هانی ئەدامو ئەیکردم بەنموونە بۆ قوتابیەکان. ئەو قوتابیانەی لەم قۆناغەدا هاوڕێی نزیکم بوون، چ لەقوتابخانەداو چ لەدەرەوەیش، جەمال شاربازێڕی و جەلال دەروێش قادر و عەتا سوڵتان و لەتیف عەلی و هەروەها لەتیف حەمدی و سەعید عەبدوڵلا بوون. هەر لەیەکەم ڕۆژی قوتابخانەی پیشەسازییەوە شاربازێڕی بوو بەهاوڕێم، لەپۆلیشدا هەر لەلای یەکەوە دائەنیشتین. شاربازێڕی لە چوارتاوە هاتبوو، گەنجێکی بالا بەرزی لاواز، بێدەنگ و کەمدوو، سەرما بردەڵە. لەو سەرەتایەدا، شیعرەکانی شاربازێڕی زۆر پاراوترو جوانتربوون لەشیعرەکانی من .

چەندین هەنگاو لەپێش منەوە بوو، کوردییەکی جوانو هەناسەیەکی درێژی هەبوو، وێنەکانی ڕۆمانسییانەو پڕ لەسۆزو خۆشەویستیی بوون. ئەویش هەر لەهەفتەنامەی (ژین)دا شیعرەکانی بڵاوئەبۆوە .

وەکوو بۆیان گێڕاومەتەوە، لەناو هەموومناندا، گۆران "شاربازێڕی" ی پەسەند کردبوو. بەدرێژایی سێ ساڵو زیاتر ئێمە هەر هاوڕێ و نزیکی یەکبووین. کە ماڵیان هاتە سلەیمانی، ناوبەناو هاموشۆی ماڵیانم ئەکرد. شاربازێڕی بەشێوە چووبۆوە سەر باوکی، دایکی شاربازێڕی، ژنێکی ئێسک سووکی بالابەرزبوو. بۆیەکەمجاریش لەڕێی شاربازێڕییەوە کاکەی فەللاحی شاعیرم ناسی. جەمال بەتەنها پشتی بەبەهرە زگماکییەکەی خۆی بەستبوو، کەم ئەیخوێندەوە. هەوڵینەئەدا زمانی عەرەبی بەباشی فێربێ و لەو ڕێیەوە ئاگای لەشیعرو ئەدەبیاتی دنیا بێ. هەردووکمان عاشقی شیعرەکانی گۆران و هەردی بووین. خۆزگەیشمان بەو ڕۆژە ئەخواست لەنزیکەوە هەردووکیان ببینین.

لەو قۆناغەوە تاکۆچی دوایی، جەلال دەروێش قادر یەکێک بوو لەهاوڕێ نزیکەکانم. لەخێزانێکی هەژار بوو، سێ برای هەبوو لەگەڵ تاقە خوشکێ، دایکیان زوو مردبوو. ناوبەناو ئەچوومە ماڵیان، خوشکە بچکۆلەکەی ئیشی

ناومالّی ئەکرد. جەلال کوڕێکی قسەخۆش و ڕەفیق دۆست بوو، ئازاو بوێربوو. کوردێکی بێ غەلّو غەش بوو، هەتا مردنیش هەروامایەوە.

دوای کارەساتی کوشتنی عوسمانی برای لەشەڕێکی ناوخۆدا، ئیتر جەلال تووشی نەخۆشی دلّ بوو. وردەوردە ئەپووکایەوە، تا لەزمان کەوت. دوای ژن هێنانیشم وەک خێزان هەر تێکەلاوبووین. ئەو کاتەی من (١٩٨٤-١٩٨٦) لەدەرەوە بوومو بەناوی جوامێرەوە شیعرەکانم ئەنووسی، ئەو کوڕێکی بووبوو، ناوی نابوو جوامێر. لەگەلّ دایکمدا بەینیان ئێجگار خۆش بوو، دوای خۆی، لەو سالانەی دواییدا ڕێکەوتو بەخت وایهێنا، جوانەی کچی، شوو بکات بەکامەرانی برامو بەمجۆرە تێکەلاوییەکە زیاترو گەورەتربوو. لەناو ئەو هاوڕێیانەدا، لەتیف عەلی، گەنجێکی سپیی قژ کالّی کورتە بالابوو، بۆ کوردایەتی هەموو گیانی پڕبوو لەحەماس، ڕۆژانە بەیەکەوە بووین .

نەخۆشکەوتو هەرچۆنێ بوو گەیشتە دەرەوە (ئەلّەمانیا)، تامابوو، زوو زوو نامەی بۆ ئەناردم. نەشتەرگەرییەکیان بۆکرد بەلام لەژێریدا دەرنەچوو. لەدووەم دیوانمدا، واتە لە(کەژاوەی گریان)دا شیعرێکی دوورو درێژی چیرۆکئامێزم بۆ نووسیی. لەکۆتایی پەنجاکانەوە تاناوەڕاستی شەستەکان، من و عەتا سولّتان و لەتیف حەمدی بەردەوام بەیەکەوە بووین. عەتا سولّتان بەهرەی نواندنی تێدابوو، وابزانم لەسەرەتای حەفتاکاندا بوو بەشداریی لەچەند نواندنێکدا کرد. کە باشترینیان بەلای منەوە تەمسیلی پێنج پیاو لەئوتێلێکدا بوو .

لەتیف حەمدی جگە لەوەی خۆشنوسێکی باشبوو، لەهەمانکاتدا شەیدای ئاوازو گۆرانی بوو. لەو وەختەدا ئەو یەکێک بوو لەوانەی گۆرانییەکانی (عبدالحلیم حافظ)ی ئەوتەوەو کوتومت وەک خۆی ئەدای ئەکرد. بێ مانەوە چوار سالّی ناوەندیی پیشەسازیم لەسلەیمانی تەواوکردوو بۆ پێنجەم سالّ (١٩٥٨-١٩٥٩) بردیانین بۆ بەغدا، کە چواردەی تەممووزی (١٩٥٨) هات و کۆتایی بەحوکمی مەلیکی هات، من لەسلەیمانی و لەمالّی خالّە عومەرم بووم. ئەو ڕۆژە چواردەی تەمموز ڕەشەبابوو، دیارە لەڕێگەی ڕادیۆوە هەوالّەکە بلاوبۆوە. هاتمە بەر دەرکی سەراو تەماشامکرد خەلّک لەخۆشیاندا هەلّئەپەڕین، بارودۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی هەمووی سەر لەبەر گۆڕدرا. کۆمۆنیستەکان لەعێراقداو لەسێ سالّی یەکەمدا، بالادەست بوون. لەسلەیمانیش هەروا بوو، وەختێ چوومەوە مەکتەب و بەشی ناوخۆ، زۆربەی هەرە زۆری قوتابییەکان چووبوونە پالّ کۆمۆنیستەکان. لەو کاتەدا ڕێکخراوە پیشەییەکان دروستبوون. پارتییەکان و

ئەوانەی کوردایەتیان ئەکرد چووبوونە پاڵ ڕێکخراوی یەکێتی لاوانی کوردستان و کۆمۆنیست و هەوادارەکانیشیان چووبوونە ناو "گەنجانی عێراق"ەوە، هەڵبەت بەژمارەو ئاپوورە ئەمان زۆرتر بوون. لەو ڕۆژەوە ناوی "کوردستانی" و "عێراقی" هاتە ناوناوانەوە. کوردستانییەکان لەقوتابخانەدا، بەپەنجەی دەست ئەژمێردران. کۆمۆنیستەکان، یان عێراقییەکان، لەقوتابخانەدا، لەپۆلدا، لەبەشی ناوخۆدا، ژیانیان لێتاڵکردبووین. بەردەوام تەعلیقیان لێئەداین..! کردبوویانین بەنۆکەری ئیمپریالیزم و ئەمریکاو بەکورتی نەیان ئەهێشت سەر لەکون بێنینە دەرەوە .

ئەوکاتەیش، کە مەلا مستەفای بارزان سەردانی سلەیمانی کردو خەڵکەکە لەبەردەکی سەرا کۆبوونەوە، ئێمە دروشمی کوردستانییانەی خۆمان بەرزکردبۆوە، بەڵام کۆمۆنیستەکان دەرفەتیان نەئەداین بچینە پێشەوە، یەکدو شەڕی بچووکیش لەوناوەدا ڕوویدا! هەر لەو ماوەیەدا کۆبوونەوەیەک لەهۆڵی بەڕێوەبەرێتی مەعاریف کرا (بەرامبەر مزگەوتی گەورە) لەو کۆبوونەوەیەدا حەسەن عەلی غالب قسەی کردو کێشەکە لەجوگرافیای کوردستانەوە هات و ئەو وتی: (جوگرافیای کوردستان نییەو جوگرافیا یەک جوگرافیایە، کە ئەویش هی عێراقە!). ئەم قسەیە کۆمەڵێ لاوی کوردستانی جەربەزەی جولان، یەکێک لەوانە کەمال سەلیم بوو، وەک پڵنگ پەلاماری حەسەن و فەرهادی میرزا ئەحمەدی-داو ئیتر کۆبوونەکەیش تێکچوو.

ئەبوو دوا ساڵ لەبەغدا بخوێنین، ڕۆژێک چەند پاسێکیان هێناو هەریەکەو جانتای خۆی هەڵگرتو سواربووین و کەوتینەڕێ بەرەو پایتەخت. نزیکی خالص لافاوێکی گەورە گەمارۆی داین، پاسێکمان لێشاو بردیو سەرئەنجام قوتابیەکی هاوڕێمان کە ناوی "ئەبوبەکر کوێرەکانی" بوو، لافاوەکە بردی و خنکا !..

ئەو ساڵەی بەغدا، ساڵێکی پڕ لەڕووداوی سیاسی و ململانێی نێوان کۆمۆنیستەکان و بەعس و قەومییە عەرەبەکان بوو. چووینە مەکتەب و بەشی ناوخۆ، من و جەمال شاربازێڕی و چەند قوتابیەکی تری کورد کەوتبووینە یەک هۆڵەوە. کۆمۆنیستی کوردو عەرەب، لەوێش نەیان ئەهێشت بحەوێینەوە..! ئێوارەیەکیان من و شاربازێڕی چووبووینە دەرەوە، وەختێ گەڕاینەوە لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە شڕوشیتاڵ و کتێب و دەفتەرمان فڕێدرابووە دەرەوە. بەکورتی ئەوەندە سووکایەتیان پێئەکردین و شەڕیان پێ ئەفرۆشتین،

ناچاربووین پەنا بەرینە بەر قەومییە عەرەبەکانو ئەوان بکەینە دۆستی خۆمان.
هەرچۆنێک بوو دوا ساڵمان لەبەغدا تەواوکردو دەرچووین و بەپەلە گەڕاینەوە بۆ سلەیمانی. ئەو ساڵەی بەغدا قازانجێکی لەبەرچاوی ئەوەبوو زمانی عەرەبیمان کۆکتر و باشتر بوو، ئەو چەند کتێبەی بۆ یەکەمجار لە "سوق السرای" کڕیمن، بریتی بوون لە "النبی" و "الاجنحة المتکسرە" و "المجنون"ی جوبران خەلیل جبران و ئیتر لەو پەنجەرە ڕووناکانەوە چووینە ناو دنیای خوێندنەوە بەزمانی عەرەبی.

هەردی؛
هۆش و گۆشی گەشتر کردمەوە..

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری کتێبو خوێندنەوەو دەستپێکی یەکەمجاری شیعرنووسینو چۆنیەتی گەشەکردنی بەرهەم، ناچارم دیسانەوە بگەڕێمەوە بۆ دواوە، بۆ پۆلی شەشی سەرەتاییو ساڵەکانی دواتر لەقوتابخانەی ناوەندی پیشەسازی سلەیمانی، هەروەها بۆ باسکردنی ئەڵقەیەکی کرنگ لە ژیانی خۆمدا.

یەکەم ساڵی پۆلی شەش، مامەوە. بۆ ساڵی تازە قوتابیەکانی پۆلی پینجەم منیان گرتەوە. یەکێک لەو قوتابیانەی کەبووە هاوڕێیەکی گیانی بەگیانیم "حەمە عەلی عەزیز" بوو. لەقوتابییە زیرەکەکان بوو، لەخێزانێکی هەژار بوو. مام عەزیزی باوکی کۆپاندروو بوو، پیاوێکی هێمن و بێدەنگ بوو. دەست و پلە زبرو توێخ هەڵدراوەکەی کە لەئەنجامی کارکردنەوە ڕەق و زەرد بووبوون، سەرنجی منیان ڕائەکێشا. "گوڵین خان"ی دایکی کەتا ئەو ساڵانەی دواییش مابوو، لەوکاتەدا ژنێکی ڕەش ئەسمەری کەڵەگەتو بەخۆو چوست و چاڵک و سەلار بوو. حەمە عەلی یەک برای هەیە "جەمال" لەژیاندایەو مامۆستایە. سێ خوشکیشی هەیە "سەبری‌و بەدری و ئەڵوەن".

"سەبری خان"یان لەدوای دایکی و لەو ساڵانەی پێشوودا، ئەویش کۆچی دواییکرد. "بەدری خان" لەژیاندایە، "ئەڵوەن" هەر بەزگماکی مەنگوڵ دەرچووەو قسەکردن و ڕۆیشتنی ناتەواوەو هەر لەکونی ژوورەوەیەو پرچی سپیشی هۆنیوەتەوە. مام عەزیز دەمێکە کۆچی دوایی کردووە. گوڵچین خان؛ لەنەوەد ساڵیش زیاتر ژیاو دووسێ ساڵێکە کۆچی دواییکردووە.

ئەم نزیکێتییە وایکرد ئیتر منیش ببم بەکوڕی ماڵ و ئەوانیش هەر هەموویان وەک برایەکی حەمە عەلی تەماشایان ئەکردم. گوڵچین خان ئەوەندەی بەتەنگ حەمە عەلی-یەوە بوو، بۆ منیش هەروەها. جلیان بۆ ئەشتم، زۆربەی ئێواران لەگەڵیانداو لەسەر خوانێک نانم ئەخوارد. تەنانەت مام عەزیز هەندێجار خەرجیشی ئەدامێ. ئەوەی ئەو ماڵە بۆمنیان کردووە کەس بۆی نەکردووم، بۆیە تاماوم خۆم بەقەرزاری ئەو خێزانە ئەزانم. حەمە عەلی خۆیشی کوڕێکی زیرەکو لێهاتووبوو. لەو کاتەداو لەو تەمەنەداو لەڕێی زنجیرەی "کتابی"یەوە، خەریکی خوێندنەوەی شاکارە ئەدەبییەکانی دنیا بوو، لەماڵیشەوە کتێبخانەیەکی

بچکۆلەی هەبوو. هەر بەهۆی ئەویشەوە کەوتمە هاموشۆی کتێبخانەی گشتی سلەیمانی، پێکەوە کتێبمان وەرئەگرتو دوای خوێندنەوە، باسی ناوەڕۆکی کتێبەکەنمان بۆ یەکتری ئەکرد. من پەلەپەلکەر، بەلام ئەو هێمن بوو. ئەو نەیئەنووسی، بەلام دلنیابووم ئەگەر بینووسیایە لەمن باشتری ئەنووسی. زۆری لەگەلدا خەریکبووم بۆ ئەوەی بنووسێت، پێموایە لەسالی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بەناوێکی ترەوە دوو کورتە چیرۆکی لە(ژین)دا بلاوکردەوەو ئیتر نەچووە سەری. دوای ئەوەی پۆلی پێنجی ئامادەیی بەشی زانستی بەچاکی و بەنمرەی هەرەباش بڕی، لەسەر بودجەی میریی و بۆ خوێندنی هەندەسەی کیمیا نێردرا بۆ چیکۆسلۆفاکیا. لەوێش بەچاکی خوێندنی بالای تەواوکردو ژنێکی چیکی هێنا. دواتر هەر بەهۆی کارەکەیەوە چوو بۆ ئەلەمانیا. ئێستا لەگەل کچەکەیدا لەشاری "فرانکفۆرت" ئەژین .

حەمە عەلی، تائێستە دووجار سەردانی کوردستانی کردۆتەوە، دواجاریان لەهاوینی (٢٠٠٤)دا بوو.

هەر لەو سەردەمانەدا لەگەل حەمە عەلی-دا، هاوڕێیەکی خۆشەویستی ترمان هەبوو، ئەویش جیهانی حەمە سەعیدی خەیات بوو. دایکی جیهان "ئافتاو خان" خزمێکی نزیکی باوکم بوو. دووکانە فراوانەکەی حەمە سەعیدی خەیات؛ کە بەرامبەر مەکتەبی فەیسەلییە بوو، بەشێکی بووبووە میوانخانەو جێی ڕووناکبیرانو شاعیرانو پیاوە ناسراوەکانی شار .

بێکەس؛ یەکێک بوو لەوانەی زۆرجار لەوێ دائەنیشت. جیهان شیعر دۆستێکی شارەزابوو، ئەویش هەر وەک ئێمە حەزی لەخوێندنەوەی شیعری تازەی ئەوکاتە ئەکرد. لەناو شاعیرانی عەرەبدا حەزی لەشیعرەکانی "نزار قەببانی" بوو. بەپێچەوانەی منەوە، ئەو هەمیشە ڕێکو پێک و شیک بوو، تائێستەیش ئەو پەیوەندی و دۆستایەتییەم لەگەلیدا بەردەوامەو هاموشۆی مالیان ئەکەم .

ئەحمەد هەردی؛ خزمی دایکی حەمە عەلی بوو، یەکەمجار لەمالی ئەوان دیم، دواتر ئەو دەرفەتەم بۆ هەلکەوت کە لەگەل حەمە عەلی-دا سەردانی بکەین. تاوایلێهات هەموو هەفتەیەک دووسێ جارێ ئەمبینی. ئەم پەیوەندییە گەرمو گوڕە، بووە هۆی ئەوەی بەبیروباوەڕی سیاسی خۆیم بناسێنێ .

هەردی؛ لەسەرەتای کارکردنی سیاسیدا، وەختێ خۆی لەگەل کۆمۆنیستەکاندا بووە، بەلام دواتر وازی لێهێنابوون .

لەسەردەمی هەرزەکاریدا وەک خۆی ئەیگێڕایەوە وەرزشکاربووە، لەو دیدەنیانەدا هەموو جارێ بیرەوەرییەکانی خۆی، بیرەوەری سەردەمی بەغداو "دار المعلمین ریفی" بۆ ئەگێڕاینەوە. بۆ یەکەمجار ئەو دنیای شیعری مەهجەرو شاعیرانی وەک "میخائیل نعیمە"و "جبران" و "شالی" و "بدوی الجبل" و مەعلوفەکانی سوریای پێناساندم. باسی هونەری شیعری ڕۆمانسی و شاکارەکانی بۆ ئەکردم. هەر لەدەمی ئەوەوە بۆ یەکەمجار ناوی دەیان کەڵە شاعیرو ئەدیبی دنیا، وەک گۆتەو بایرۆن و شیللی و ئەلیۆت و مۆیلەرو موپاسان و چیخۆف‌و پۆشکین-م بیست .

هەر ئەویش بوو بەباسکردن‌و شەرحکردن و گێڕانەوەی مێژووی دێرینەی کورد، ئەمارەتە کوردییەکان و شۆڕشەکانی کوردستانی تورکیا و ئێران‌و هەروەها کۆماری مەهابادو ڕاپەڕینە خوێناوییەکانی سەدەی بیستی کورد، گیانی کوردایەتی و هەستی نەتەوەیی تیا بزواندم و هۆش‌و گۆشی گەشتر کردمەوە .

مامۆستا هەردی؛ قەت حەزی نەئەکرد باسی شیعرەکانی بکەن. لەشاعیرانی هاوچەرخی کورددا بەزۆری باسی پیرەمێردو گۆرانی ئەکرد. شاعیرانەو بەقوڵی هونەری شیعری گۆرانی بۆ لێکئەدایەوە. ئەو هەر زۆر زوو ئەوەی تێگەیاندین کە حزبایەتی و ئایدیۆلۆژیای سیاسی، شاعیر دروست ناکات. ئەوانەیش کە لەبەر هەوییەیەکی حزبی تەماشای شاعیری گۆران ئەکەن، لەگۆران نەگەیشتوون‌و هونەرەکەی ناناسن !..

هەر لەماڵی مامۆستا هەردی؛ یەکدوجار چاوم بەشێخ نوری شێخ سالح کەوتەوەو هەر لەوێش فانی شاعیرم ناسی. هەر ئەویش بوو بۆ یەکەمجار شەرحی هەندێ لەقەسیدەکانی نالی و کوردی و سالم‌و مەحوی بۆ کردم. هەردی لەدوای "ڕازی تەنیایی" ئیتر شیعری نەنووسی. چونکە وەک خۆی ئەیوت (ئەرکی لەپێشترو گرنگتر هەیە)، بۆ ئەوەی خۆی بۆ تەرخانبکات. بایەخدان بەمەسەلە فیکری و فەلسەفییەکان، بەلێکۆڵینەوەی مێژوویی، چوونە خانەی یەکەمی گرنگی ژیانی ڕۆژانەی ئەوەوە. هەردی بەکۆمەڵە شیعرێکی کەم، توانی ڕەفەیەکی گەورەی داهێنان بۆ خۆی بگرێ. وەک مرۆڤیش، هەردی پیاوێکی نەفسبەرز بوو، ڕاستگۆو سادەبوو، قسەلەڕوو، بەڵام هەتا بڵێی وەسواس‌و لەهەموو بڕیاردانێکدا دوودڵ و شپرزە. بەکورتی لەو قۆناغە ناسکەی ژیانی مندا، لەڕووی کاریگەری فیکری و سیاسی و ئەدەبییەوە سێ کەس ڕۆڵی هەرە گەورەیان هەبوو، هەردی و جەوهەر و فەرەیدون .

جەوهەر؛ لەنووووسەرە ناسراوەکانی گەلاوێژ بوو، وتارەکانی خۆی بەناوی (ع. چالاک) بلاوئەکردەوە، بەلام ئەگەر باسی ئەو نووسینانەت لەگەڵدا بکردایە، نکووڵی لێئەکردن‌و ئەیوت "ئینجا من چیم نووسیوە تائەدیب بم"..! دوای تێکەلاوبوونێکی زۆری بەردەوامی ڕۆژانە، لەچایخانەکەی مام ساڵح، یان لەپیاسەی دوورو درێژی ئێوارانذا بەرەو تووی مەلیکو بناری گۆیژە، دوای سەرکردنە سەر، هەندێ نووسینی کۆنی خۆی نیشاندام، کۆمەڵێ پەخشان بوون. بەڕاستی نموونەی کوردی پوختو پەتی و زمان ڕەوانی و داڕشتنی هونەر کارانەبوون. بەلام جوانترینیان ئەو پارچەیەیان بوو کە بۆ مردنی دایکی نووسیبوو، سۆزێکی بێئەندازەی لێ ئەتکاو بەزمانێکی ئەوەندە جوان‌و شیریین نووسرابوو، ئەوەندە بێ گرێ و گۆڵ بوو، ڕەنگە دەیان جار خوێندبێتمەوە، بەلام تینوێتیم لێی نەئەشکا .

مامۆستا جەوهەر؛ نموونەی ڕەوشت بەرزی و پاکی و دڵسۆزیی بوو، تاخۆی لەژیاندا بوو، کتێبخانەکەی پێشکەشی کتێبخانەی گشتی سلێمانی کرد. لەناو نووسەرانی کورددا هۆگری نووسینەکانی مامۆستا برایم ئەحمەد بوو. من بۆ خۆم چەند جارم لێبیستووە کە ئەیوت: "پیاو ئەگەر وەکو برایم نەنووسێ بۆ بنوسێ ."

ئەم پیاوەیش لەڕێنومایی کردن و هوشیارکردنەوەو تەنانەت لەیارمەتیدانی مادديشدا، لەو ڕۆژگارە سەختانەی ژیانی مندا، پەنایەکی ڕووناکیی بوو. تامردنیش پەیوەندی و دۆستایەتیمان هەر وەکوو جاری جاران وابوو. بەرهەمە دواییەکانی منی پێخۆش‌و پەسەند بوو، بەتایبەتی "داستانی مامەیارە ."

لەمانگی پێنجی (١٩٨٢)دا نەخۆش کەوت‌و لەخەستەخانە کەوت‌و سەردانمانکرد، لە(١٩٨٢/٦/١)دا کۆچی دواییکردو منیش هەر لەو مانگەدا وەک وەفایەکی بچووکی قوتابییەک بەرامبەر مامۆستاکەی، لەڕۆژنامەی هاوکاریداو بەناویشانی "گۆمێکی مەنگ" پەخشانێکم بۆ نووسیی.

لە(١٩٥٨-١٩٥٩)دا کۆمەڵەی ژیانەوەو ئازادی کورد "کاژیک" لەسلێمانی دروستبوو، دوای ئەوەی "پارتی گەل"یش چووە ناوی، من ئەوکاتە تەمەنم (١٨-١٩) ساڵ بوو، بەپێی ئەو زانیاریانەی لەدامەزرێنەرە سەرەکییەکانەوە بیستوومە، هێڵە بنەڕەتی و گرنگەکانی سیاسەتی ئەم حزبە و تەنانەت بڕگە جەوهەرییەکانی "کاژیکنامە"یش هی ئەحمەد هەردی بووەو دواتر لەلایەن جەوهەرەوە داڕێژراوەو ئەشێ لەلایەن کەسانی تریشەوە دەستکاری کرابێ، بەڵام ئەم دامەزراندنە زۆر درەنگتر ئیعلان کرا .

وەک بێتەوە بیرم، یەکەم بەیاننامەی ئاشکرای کاژیک، دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بڵوبۆوە، ئەگینا بەشی هەرە زۆری نووسینەکانی تر، تەنها بۆ ناوخۆی کاژیک خۆی بوو. کاژیکنامەیش نەئەبوو بدرێ بەخەڵکی، مەگەر یەکێک زۆر جێگەی بڕوا بوایە.

کاژیک؛ بەدەستی خۆی قفڵی لەبیروباوەڕی خۆیدابوو، حزبێکی جەماوەری نەبوو، نهێنی بوو لەناو نهێنیدا..! تا یەکێک ئەگەیشتە ناو ڕیزەکانی قیر سپی ئەبوو. سەرکردایەتی کاژیک، کۆمەڵێ ڕووناکبیر بوون، زیاتر پیاوی قەڵەم بوون وەک لەوەی پیاوی نێو مەیدانی کارو کردەوەو سیاسەتبن. قەدەغە بوو کەس بڵێ من کاژیکم..! ئێمەی گەنج و خوێنگەرم، بەردەوام داوای ئەوەمان ئەکرد "کاژیک" کارێکی لەبەرچاو ئەنجامبدا، بەڵام بێهودەبوو. ئەیانوت وەختی نەهاتووە، ئەو وەختەیش هەرگیز نەهات !..

منو کۆمەڵێ لەو لاوە دڵسۆزو خەمخۆرانەی ماوەی چەند ساڵێک، بەیەکەوە ڕامان ئەکردو ئەندام بووین، لەشوێنی خۆماندا چەقی بووین و زیادمان نەئەکرد. کاژیک لەمرۆڤێ ئەچوو لەپلەیەکی تەمەندا لەنەشونما بکەوێ، ئیتر بوەستێ و بالانەکا. هەموو شتێ لەئەڵقەیەکی سڕیدا کۆتایی ئەهات. ئەمە جگە لەوەی بۆت

نەبوو بەهیچ جۆرێ ڕای خۆت هەبێ، چیت پێبوترایە ئەوەبوو..! ئێمە بۆ ماوەی دووساڵێ لەدانیشتنەکانی خۆماندا هەر کاژێکنامەمان ئەخوێندەوە. ناوبەناویش هەندێ ڕێنومایی دەرئەچوو، چەند جارێکیش لەبۆنە نەتەوەییەکاندا، بەیاننامە بڵاوئەکرایەوە .

بیروباوەڕی سیاسی کاژیک، لەسەر بنەمای بەرژەوەندی قەومی کوردو سەربەخۆیی کوردستان داڕێژرابوو. لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە لەژێر کاریگەری بیریارە عەرەبە قەومییەکاندا بوو، بەتایەبتی کتێب و نووسینەکانی "ساطع الحصری" و تەفسیرەکانی ئەو بۆ نەتەوەو مەسەلەی قەومی "جەمال عەبدولناسر" و دروشم و بۆچوونەکانی ڕۆڵیان هەبوو لەخەملێنی بیری نەتەوەییدا لای ڕووناکبیرە کوردە قەومییەکان و دوورکەوتنەوەیان لەکۆمۆنیست و پارتییەکان. کرانەوەو ئازادی بیروڕاو دیالۆگ و ڕەخنەگرتن لەناو کاژیکدا نەبوو، من بۆ خۆم پێموایە ئەگەر قیادەی کاژیک، قیادەیەکی کاراو مەیدانی و چاو نەترس بوایە، ئەیتوانی بەشێکی زۆری گەنجی کورد لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو بیانجولێنێ و ساڵ لەدوای ساڵ گەشە بکاتو ببێتە حزبێکی جەماوەری بەهێز .

قیادەی کاژیک، بەردەوام لەکونی ژوورەوە بوون، تێکەڵ بەخەڵکی نەئەبوون، ئێ ئیتر چۆن گەورەبن و بگەنە هەموو کوردستانیش؟ !

من؛ لەم بیرەوەرییەدا نامەوێ بچمە ناو هەموو وردەکارییەکانی "کاژیک"ەوە، لەبەرئەوەی من لەدەستەی پلە دووی ئەم حیزبەدا بوومو ئاگام لەبڕیارو بەرنامەی کاری ئەوان نەبووە، ئاگام لەپەیوەندییەکانیان نەبووە، ئێمە وەک کۆمەڵێ سەرباز وابووین، بەڵام کۆمەڵە سەربازێ کە هەرگیز تەقە نەکەنو نەچنە نێو هیچ شەڕێکەوە .!

لەلایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیەکم لەبەر دەستدا نییە، حەزناکەم قسەیەک بکەم لەسەرم بکەوێ، تەنها لە ئەزموونەکەی خۆم ئەدوێم و بەس .

من؛ پەشیمان نیم لەوەی لەکاژیکدا کارمکردووە، بەڵام ڕێبەرەکان بەرپرسن لەوەی کە کۆمەڵێ گەنجی وەکوو ئێمەیان تووشی نائومێدیکرد و خۆشیان هیچیان بەهیچ نەکرد. بەڕاستی ئەو سەرکردانە ئەشێ پیاوی ڕووناکبیرو ئەدیبو شاعیر و نووسەرو زانای باش بووبن و، لەبوارەکانی خۆیاندا دەستڕەنگین بن، بەڵام ئەوانە پیاوی بڕیاری سیاسی ئازاو لەخۆبوردو کارکردن

نەبوون. لەناوەڕاستی شەستەکاندا و لەململانێی نێوان مەکتەبی سیاسی پارتی و قیادەی بارزانی-دا، کاژیک چووە ژێر ڕکێفی بارزانییەوە، بەمەیش یەکەم بێلایەنی خۆی لەدەستداو دووەم نەیشیتوانی هیچ گۆڕانێکی جەوهەری لەبونیادی قیادەی تازەی پارتی و بارزانیدا بگۆڕێ. ئەمە هەڵەیەکی مێژوویی بوو، ئەبوو کاژیک سەربەخۆو بێلایەن بێت و نەبێتە تەرەفێک لەشەڕی ناوخۆی کوردستاندا. بەدرێژایی چەندین ساڵ، کاژیک یەک ڕەخنەی لەخۆی نەگرت..! یەک کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ خەڵک ڕێکنەخست، خۆپیشاندانێکی نەکرد. چەند کەسێک و کۆمەڵە کتێبێک و تەواوی هاوڕێکانی خۆیشم لەکاژیکدا، نموونەی پیاوی لەخۆبوردوو و دڵسۆزو ئامادەی هەموو گیانبازییەک بوون. هەر زوویش لەسەرەتای دامەزراندنی کاژیکدا، تاک وتەرا لەو بەناو سەرکردانە کوردستانیان بەجێهێشتو ڕوویانکردە دەرەوەی وڵات. ڕەنگە ئەمە مافی سروشتی هەموو مرۆڤێ بێ، کە خۆی چی بڕیار ئەدا بۆ ژیانی خۆی، بەڵام ئاخر هەرکەسێک خۆی بەڕێبەری قەومی لەقەڵەمبداو، موزایەدە بەسەر کەسانی ترەوە بکاتو هەموو حزبەکانی کوردستان بەهیچ بزانێ و، بەڵام بۆ خۆیشی بەدرێژایی هەموو ئەو کارەساتانەی لەماوەی نزیک نیو سەدەدا لەم وڵاتە ڕوویانداوە، ئەو لێی دووربووبێو ساردی و گەرمییەکی ئەم وڵاتەی نەچێشتبێو تەنانەت لەکاتە هەرە گونجاوەکاندا، سەرێکیشی لەوڵات و شارەکەی خۆی نەدابێتەوە، ئیتر قەومی چی و موزایەدەی چیو سەربەخۆیی کوردستانی چی؟!. لەناو وڵاتیشدا هەر لەوانە هەبوون، بەدرێژایی حوکمی بەعس و سەردەمەکانی چەوسانەوەو کوشتنو بڕینو کورد قڕان، ئەوان هەر لەجێو ڕێی خۆیاندا بوونو کارمەندی گەورەی میری بوونو سەرۆکی کۆمپانیا بوون، بەڵام هەر قەومی بوون و کەچی پەنجەیشیان بۆ نەبراوە! چۆن؟ !.

لەسەرەتای پەیوەندداریدا و لەناو کاژیکدا، بەکوڵ و دڵەوە چووبوومە پێشێ و کارم ئەکرد. بەڵام ساڵ لەدوای ساڵ سارد ئەبوومەوە، تاگەیشتمە ئەو ئەنجامەی کەمنیش بەکەڵکی حزبایەتی نایەمو پێویستە بکشێمەوە. هەستمکرد ئەوەندەی بۆ شیعر دروستبووم، بۆ حزبایەتی کردن دروست نەبووم. هەستمکرد خەریکە ئازادی خۆم وەک مرۆڤ لەدەست ئەدەم، خەریکم ئەبم بەبورغوی ناو مەکینەیەک. هەستمکرد بۆ من، شیعر لەحزب گەورەترەو پیرۆزتریشە. تەنانەت کار گەیشتە ڕادەیەک ڕۆژێک هەر لەبەردەم کتێبخانەی گەلاوێژدا یەکێک لەو بەرپرسانەی کە من ئەمزانی لەکاژیکدا کارئەکاو پلەیشی

زۆر لەسەروو منەوەیە، هاتو سلاویکردو بردمییە ئەولاوەو پێی وتم: (هاوبیرا لەو ڕۆژانەدا شیعرێکتم خوێندەوە، بەگیڤارا-تدا هەڵداوە، چۆن کوردی نەتەوەیی شتی وا ئەکات؟!) .

ئیتر من دنیام لەبەرچاو تاریکبوو، ئێوە ئەو عەقڵە بهێننە بەرچاوی خۆتان، چ عەقڵێکی تاریک و نائینسانییە، دوای ئەم قسەیە بەڕۆژێک، نامەی خۆکشانەوەم نووسیی و وازم هێنا. ئەزموونی کاژیک یەکەم ئەزموون و دوا ئەزموونی حزبایەتیکردنم بوو. من لەحزبی شیوعیدا کارم نەکردووە، لە پارتیدا کارم نەکردووە، لەدوای کاژیکەوە نەچوومەتە ناو ڕێکخستنەکانی هیچ حزبێکەوە، بەلام لەشۆڕشی ئەیلولیششدا بوومو لەشۆڕشی نوێشدا .

دۆستی نزیکی خەتەکەی بارزانی بوومو دوای هەرەسیش دۆستی نزیکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەلام حزبی نەبووم، چونکە من بۆ کاری حزبایەتی و تەنزیم دروست نەبووم. دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، ئەوکاتەی بەماڵو منداڵەوە، بۆ ماوەی شەش مانگێ لەمەریوان ئەژیام. کۆمەڵێ لاوی نەتەوەیی، 'پاسۆک'یان لەسەر کەلاوەکەی کاژیک دروستکردەوەو هاتن بۆلام و داوایان لێکردم کاریان لەگەڵدا بکەم. بەلام وەلامی من ئەوەبوو کە بۆ حزبایەتی دروست نەبووم. لەسەرەتای هەشتاکانیشدا دیسانەوە جارێکی تر لەناوچە ئازادکراوەکانەوە، بەتایبەتی ئەندامێکی خۆیان ناردبوو بۆ سلەیمانی و داوای کارکردنیان لێکردم، بەلام من هەر هەمان وەلامم دانەوە، کە من کاری حزبی ناکەم!

لەسەردەمی مێردمنداڵیدا تووشی نەخۆشی حەساسیەت بووم، جاری واهەبوو لەهەفتەیەکدا دووجار لچ و لێوو پێڵووی چاوم ئەئاوسان و لەشم لیری ئەکرد، ناچاربووم نەچمە دەرەوە، ئەم نەخۆشییە لەباری دەروونیشەوە ئاڵۆزی کردم. چونکە واڕێکئەکەوت لەبۆنە خۆشەکاندا، جەژن‌و سەیران‌و سەفەرکردندا وام لێ ئەهات، تا تەمەنی بیست ساڵ و بەرەو ژووریش ئەم نەخۆشییە درێژەی هەبوو، تەنها حەبێکیشی هەبوو، کە هەندێ زووتر ئاوساوییەکانی ئەنیشاندەوە. بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە، بەر لەشۆڕشی چواردەی تەممووز، چەند جارێک ڕێمکەوتە بەغدا، خاڵە ئەنوەرم لەکۆلێجی پزیشکی ئەیخوێند، لەگەڵ چەند خوێندکارێکی تردا، ماڵێکیان بەکرێ گرتبوو، ئەچوومە لای ئەوان. خاڵە ئەنوەرم منی خۆشئەویست و بەتەنگمەوە بوو، دیارە ئەوکاتە من عەرەبیم نەئەزانی، کە لەبەرچاوی خوێندکارە عەرەبەکان پێمئەوت "خاڵە"، ئەوان پێئەکەنین و سەریان ئەکردە سەری .

ماڵی نوری حاجی ئەمینی کاکە حەمەی ئامۆزای باوکیشم؛ لە بەغدا بوو، لەگەڕەکی ئەعزەمییە بوون، ماڵەکەیان خۆش‌و حەوشەکەیان دووسێ دارخورمای گەورەی تێدا بوو. کوکوختییەکان هێلانەیان لەسەر کردبوون‌و زوو زوو ئەیانخوێند. سالار؛ کوڕە گەورەی مامە نوری لەتەمەنی خۆمدا بوو.

دایکیشی ڕوقیه خانی کچی ڕەفعەته فەندی خوشکی حەسەن ڕەفعەت؛ ژنێکی هێمن و دەم بەپێکەنین بوو، یەکەمجار بوو لەتەمەنێکی هەڵکشاودا ببینم، یەکسەر پێیوتم: (تۆ باوکت مامۆستام بووەو من قەرزاری ئەوم). ئەوان لەدەمێکەوە چووبوون بۆ بەغدا .

مامە نوری بازرگان بوو، لەگەڵ سالاردا ئەچووین بۆ محەلەکەی کە لەخانێکی گەورەدا بوو، نزیک ساحەی ئەمین، جاربەجاریش یارمەتی ئەدام. سالار کوڕێکی زیتو وریابوو، لەبەغدا گەورەبووبوو. لەو تەمەنەدا وەختێ بەیەکەوە ئەچووینە دەرەوە. لەپڕێکدا ئاوڕم ئەدایەوە سالار دیار نەماوە...! منیش نەشارەزاو زمان نەزان، ناچاربووم لەشوێنی خۆمدا بچەقم. بۆ گاڵتە خۆی لێ ئەشاردمەوە. بۆ یەکەمجاریش لەگەڵ ئەودا بوو لەبەغدا چووین بۆ سینەمایەکی هاوینەو لەفیلمەکەدا دیمەنێکی سێکسیم بینی. ساڵان ڕۆیشتن و هاتن و سالار لەبەغدا ئامادەیی تەواوکردوو چووە کۆلێجی ئەندازیاری و دواتر چوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت. لەوێ ژنێکی ڕووسی هێناو مایەوە .

پێموایە لەناوەڕاستی حەفتاکاندا گەڕایەوە بۆ بەغداو نووسینگەی هەندەسی بۆ کاروباری مقاوەڵت دانا. ئەو کاتەی دوورخرابوومەوە بۆ ناحیەی بەغدادی، یەکدوجارێ لەبەغدا یەکترمان بینییەوە. لەساڵی (١٩٨٢)دا، مێردەزمەکانی ئەمنی عێراق چووبوونە سەری‌و گرتبوویان و بردبوویان. ئیتر هەر ئەو بردنە بوو، کەس‌وکاری هەرچەندیان کرد نەیانتوانی شوێنەواری ببیننەوە. لەساڵی (١٩٨٤)دا هەندێ لەزیندانە سیاسییە کوردەکان بەربوون، یەکدوانێکیان بەڕێکەوت سالاریان دیبوو، نیشانەکانیان هەڵداو ڕاست بوو کە سالار-یان دیوە. ئەوانە گێڕابوویانەوە، ئازارێکی وەحشیانە درابوو، بەڵام سالار زۆر خۆڕاگربووبوو، نەچووبووە ژێر هیچ شتێ، ئەوەندەیش ورە بەرزو قایم بووبوو، بە زیندانی و تەنانەت بەوەردیانەکانیشەوە ناویان لێنابوو قارەمان..! ئەو تۆمەتەی بەعس بۆ سالاری دروستکردبوو، جاسووسی ببوو. کە هیچ لێبوردنێ نەیئەگرتەوە، لەدوای ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری، خەسرەوی برای کەوتە سۆراخکردن و دواجار لە لیستی شەهیدکراوەکاندا ناوی دۆزییەوە.

هەر لەیەکێک لەو سەردانانەی بەغدادا بوو، ڕۆژێک سواری پاسی مەسلەحە بووبووم، ئەچووم بۆ ماڵی سالار لە ئەعزەمییە، من پێشتر ناوی سەیابو وێنەیم بینبوو، لەپاسەکەدا بەپێوە وەستابووم، کە تەماشای بەردەمی خۆم کرد، خۆ ئەوە "بەدر شاکیر سەیاب"ەو دانیشتووە. لاوازو بێ هەناو، دۆسیەیەکیشی لەسەر ڕانی دانابوو، زۆرم پێخۆش بوو، کە ئەو شاعیرە گەورەیەم لەنیزکەوە بینی. تائێستەیش ئەو دیمەنی ناو پاسەم لەبەرچاوە.

قوتابخانەی پیشەسازیم لەبەغدا تەواوکردبوو، هاتبوومەوە سلەیمانی، هەر لەو سەردەمەدا بوو گۆڤاری "رۆژی نوێ" لەسلەیمانی دەرئەچوو .

رۆژی نوێ؛ لەگۆڤارە سەنگینەکانی ئەوکاتە بوو، قەڵەمە ناسراوەکان لەو گۆڤارەدا ئەیاننوسی. ئێمەی لاوانی عاشقی شیعرو ئەدەبیش یەکێک لەخۆزگەکانمان ئەوەبوو، کە ئەم گۆڤارە شیعرێکمان بۆ بڵاوبکاتەوە. مامۆستایان "جەمال شالی و کامەران موکری"، بڕبڕەی پشتی ئەم گۆڤارە بوون . کاک عەبدوڵلا ئەژدەر-یشیان لەگەڵدا بوو. لەو رۆژگارانەدا کامەران موکری شاعیرێکی دیارو ناسراوبوو، پارچە شیعرەکانی لەسەر زاری خەڵکیی بوون، هەموو بەرهەمێکیان بڵاونەئەکردەوە. کامەران ئەیناسیم بەڵام هیچ جۆرە تێکەڵاوییەکمان نەبوو، ئەو پڕکێشییەم کردو وشیعرێکم بۆ ناردن. دوای چاوەڕوانی، یەکەم شیعرم لەرۆژی نوێ-دا بڵاوکرایەوە. ئەو رۆژەی گۆڤارەکەم بینی. ئەو رۆژە بەیەکێک لەهەرە رۆژە خۆشەکانی ژیانم لەقەڵەم ئەدەم. دوای ئەوەیش لەیەکدوو ژمارەی تردا بەرهەمم بڵاوکرایەوە. ئەم دەرگاکردنەوەیەی رۆژی نوێ، تەکانێکی بەگوڕبوو بۆ شیعرەکانم، بڕوام بە بەهرەی خۆم زیاتر بوو، رۆژی نوێ بۆ من پەیژەبوو، چەند پلەیەک بەرەو سەرەوەی بردم.

دایکم؛ لەگەڵ کاک عومەردا جیابووبوونەوە، دوای ماوەیەک کاک عومەر بەرەو ئەمریکا ڕۆیشت، وا ئەمجارەیش دایکم بەسێ منداڵی ترەوە بەرەو سلەیمانی بۆوە. من هەموو خەمێکم ئەوەبوو بەزووترین کات لەشوێنێک دابمەزرێم و بتوانم یارمەتی دایکم و ئەو مندالانە بدەم. ساڵێک لەوەوبەر وەک مامۆستای کاتیی لەگوندی قرگەی نزیک سلەیمانی دامەزرام، کاک حەمە قادرو کاک جەمال عومەر ملۆزم و کاک "نەجاح"یش هەر لەوێ بوون. ڕۆژانە هاتو چۆم ئەکرد. وانەی مێژووم بەپۆلی شەش ئەوتەوە. کە ساڵی خوێندن تەواو بوو، ئیشەکەیشم تەواو بوو. کارگەی جگەرەی سلەیمانی کرایەوەو، لەوێش دامەزرام .

بەڵام ژیانی ناو گرمەگرمی مەکینە بێزاریانکردم، کۆمەڵێ لەقوتابیانی پیشەسازیش هەر لەوێ دامەزرابوون. "جەلال دەروێش قادرو جەمال شارباژێڕی-ش" هەر لەوێ بوون. هەوڵمدا وەزیفەکەم بگوێزمەوە بۆ جێگایەکی تر. یان سەرلەنوێ لەدایرەیەکی تر دابمەزرێمەوە .

سەردەم هەر سەردەمی عەبدولکەریم قاسم بوو. "حەسەن ڕەفعەت"ی وەزیری ئیشغال و ئیسکان، خاڵی سالار، یارمەتیدام و بەوەزیفەی (م. رسام) لەئیشغالی سلەیمانی دایمەزراندم. پێموایە لەبەهاری (١٩٦٢)دا بوو، لەئیشغال جێگیربووم. هەر لەم شوێنەدا کۆمەڵێ فەرمانبەری تر کاریان ئەکرد. "مەحمود ئەحمەدی موهەندیس" بەڕێوەبەر بوو، "شێخ مستەفا خاڵ"ی برای "شێخ محەمەدی خاڵ" ژمێریارمان" بوو. پیاوێکی قسەخۆش و بەئەزموون بوو. هەر لەوێش بۆ یەکەمجار "بارام بەگی ئەحمەد بەگی ڕیشین"م ناسی. پیاوێکی هەمیشە پۆشتەی قۆزو شیک. دوای تێکەڵاوبوون زۆر لەیەک نزیک کەوتینەوەو ئەدەبیاتی کاژیکی لەڕێگەی منەوە وەرئەگرت. بارام بەگ؛ شارەزای مێژووی کوردستانیش بوو، خاوەن نەفسێکی بەرز بوو، هەندێ بەگزادەی جافی خزمی خۆی خۆش نەئەویست، ئەی وت: (ئەوانە پیاوی پارەو پولن)، دەستوودڵی زۆر جوان بوو، بەڵام لەمووچەکەی زیاتری نەبوو. ئێجگار دەستی بلاوبوو، ئەگەر نیو دیناری پێبوایە، ڕوبعێکی ئەدا بەتەکسی. جگەرەی ڕۆسمانی ئەکێشا. تاسەر ئێسقان کورد پەروەربوو. یەکدوو جارێکیش پێکەوە چووینەتەوە ماڵی خۆیان .

هەر لەهەمان دایرەدا، کاک "سەلاحی حەمەی شێخەلی"مان لەگەڵدا بوو، پیاوێکی قسە خۆش و نوکتەباز بوو، پارتی بوو، لەهەمان ژووردا منو ئەو و حەسەنی تابیعە بەیەکەوە بووین. حەسەن مووچەیەکی کەمی هەبوو بۆیە بەردەوام قەرزاربوو. هەموو شەوێکیش ئەیخواردەوەو سەلاح سەری ئەکردە سەر.

سەری مانگ بوو مووچەمان وەرگرتبوو، هەندێ لەقەرزدەرەکانی حەسەنیش بەردەرگای دایرەیان گرتبوو، ئەو بەیانییەیش کەهات زۆر غەمگین بوو، ریشی نەتاشیبوو وتی: (ئاوی گەرم بەسەر قاچی منداڵەکەیدا ڕژاوەو لەگەڵ ژنەکەیشیدا هەرای بووەو تۆراوە). ئەمانە هەمووی بەسەریەکەوە هاتبوون، سەلاحیش دەمانچەیەکی پێبوو، لەقەدی کردەوەو خستییە بەردەمی حەسەن و پێی وت: (ئاخر ئەگەر ئێستە ئینتیحار نەکەیت کەی ئەیکەیت!).

درەنگ درەنگ مامم ئەبینی، دوو ساڵی پێش ئەم دامەزراندنەم، ئێوارەیەک تێکچووین و ئیتر لەیەکتر دابڕاین .

بیرمە لەدوای بینای مەحکەمەی ئێستاوە، هەمووی دەشت بوو. هەردووقوڵی بووین، قسەمانکردو بەکورتی داوای یەکێک لەکچەکانیمکرد، هەر ئەوە نەبوو سواری سەرم نەبێت. وەک دڕندەیەک هاتە بەرچاوم..! تاماوەیەکی درێژ هاموشۆم نەکرد. مامم سروشتێکی تووڕەی هەبوو، لەماڵیشەوە لەگەڵ کچەکانیدا باش نەبوو. نەیان ئەوێرا سەر لەکون بێننە دەرەوە. بەکورتی زۆردار بوو. هەندێجار کەسەردانیم ئەکرد ئەمبینی بەدەرپێیەکی کورتەوە دانیشتووەو، پەڕەکاغەزی بەدەوری خۆیدا بڵاوکردۆتەوە، گوایە شیعر ئەنووسێ .!

قسەکانی 'بێکەس'م بیر ئەکەوتەوە، وەختێ مەست بوایە ئیتر پەتی قسەی بەرەڵڵا ئەکردو بەڕاست و چەپدا گاڵەی خۆی ئەکرد. مامە تایەرم قسەی خۆش بوو، لەگەڵ دیلانی شاعیردا دۆستایەتییان هەبوو، جارێکیان مامم ئەیبینێ و گلەیی لێئەکات، کە دیوانەکەی خۆی نەداوەتێ، 'دیلان'یش بۆ ئەوەی تووڕەی بکا، پێی ئەڵێ: (ئینجا پیاوی نەخوێندەوار دیوانی بۆ چییە؟!)، مامیشم پێی ئەڵێ: (باوابێ، بەلام من پەلەم نییە کە هاوین هات و پاقلە فرۆش پەیدا بوون، پاقلەم لەپەڕەپەڕی دیوانەکەی تۆدا ئەدەنێو ئەوسا شیعرەکانت ئەخوێنمەوە .(!

لەساڵی (١٩٦٢-١٩٦٣)دا ماڵی مامم لەخانوویەکی کرێدا بوون، نزیک مزگەوتی بن تەبەق، زوو زوو سەرم لەکچەکانی ئامۆزام ئەدا، هەر لەوێ لەگەڵ دەستە خوشکێکیاندا، پەیوەندییەکی دڵدارانەم پێکهێنا، بەڵام لەبەرئەوەی کچەکە داوایکرد بیهێنمو ئینجا چەندین داواکاری سەیر سەیری هەبوو، کە نەئەچوونە عەقڵی منەوەو لەلێکدانەوەی منەوە دووربوون، وازملێهێنا.

هەر لەو دووساڵەدا، پەرەم بەخوێندنەوەی خۆمدا، وردە وردە کەوتمە رۆمان خوێندنەوە. ئەوکاتە خانووی "ئیسکان"مان وەرگرتبوو، بەو مووچەیە ئەژیاین کەمن وەرمئەگرت. کاوەو کامەران و ژیان منداڵ بوون، بەڵام دواتر کاک عومەر هەڵمەت، مانگانە، لەرێی کاک نامیق قەزازەوە یارمەتی بۆ منداڵەکانی خۆی ئەنارد، بژێویمان باشتر بوو. بەهۆی بارودۆخی سیاسیی کوردستانەوە، دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولو دوای ئەوەی حکومەت هەموو دەرگایەکی ئازادی چاپ و چاپەمەنی و رۆژنامەو گۆڤاری بەست، شیعر و ئەدەبی کوردی بەگشتی سست و سڕبووبوو. هیچ جۆرە چالاکییەک لە ئارادانەبوو، هەفتەنامەکەی "ژین"یش نەمابوو. "رۆژی نوێ"یش داخرا. ئیتر سەردەم بوو بەسەردەمی هاتنە کایەی "پ. م"و دەنگوباسەکان، هەر دەنگوباسی شەڕو موقاوەمەت بوون. لەکۆڕو کۆبوونەوەی ماڵان و چایخانەکاندا، هەواڵەکان هەواڵی چەند پۆلیس کوژراوەو وچەندی تر چۆتە پاڵ (پ. م) و کام مەخفەر خۆی داوە بەدەستەوەو لەچەمی ڕێزان چی ئەکرێ و مەلا مستەفا چی وتووەو ئینجا مانگرتنی گشتی، بەو جۆرە ئێمە کەوتینە دۆڵێکەوە لەهەموولایەکەوە زریان ئەیگرتەوە. ئەم سەردەمەی ئێمە، لەسەردەمی بەر لەبیست ساڵی شاعیرانی تر نەئەچوون. دنیاکەی ئەوان تاڕادەیەک هێورو ئارامتر بوو. بەهرەی تازە ڕسکاوی ئێمە ئەو خونچەیە بوو، کە لەرۆژگاری تۆفـو کڕێوەدا چاوی کردەوە. قەدەری شیعری ئێمەیش خۆیدا بەدەم ئەو چارەنووسەوە .

هەر لەسەرەتای شەستەکاندا بوو، ئێوارەیەک لەماڵەوە هاتمە دەرەوەو ڕوومکردە بەردەرکی سەراو شەقامی مەولەوی، بەڵام بەسەر دیمەنێکی ئەوەندە تراژیدی و خەماویدا کەوتم، کە لەناخەوە منی هەڵتەکاند، لە شەڕێکی نێوان (پ. م)و هێزی میریدا، دوو (پ. م) شەهید بووبوونو حکومەتیش لاشەی هەر یەکێکیانی کردبوو بەپشتی زیلێکی عەسکەرییەوەو بەجادەکانی شاردا رایانئەکێشان..! لەدواییدا لەبەردەرکی سەرادا فڕێیدان .

شاعیرانی تازەی سەر لەهێلکە جوقاوی ئەوکاتە، بەپەنجەی دەست ئەژمێردران، جەمال شارباژێڕی لەهەموومان گەشتر بوو، جەلالی میرزا کەریمو هەروەها عوسمان شارباژێڕیش، هەندێ شیعری بلاوکردەوەو لەدواییدا چووە ناو دنیای ئاوازو گۆرانییەوە. هەر لەسەردەمی ئێمەدا "عوسمان عوزێری"یش ئەینووسی و شیعری بلاوئەکردەوە، بەلام بەرهەمەکانی گەلێ ساکارو بێ نموود بوون.

من یەکەمجار کە "عەبدوللا گۆران"م بینی تەمەنم شانزەوحەڤدە سالان بوو، شیعرێکم نووسیبوو، پێموانییە لەشیعریش چووبێ، بەلام پرکێشی ئەوەمکرد مامۆستا گۆران بدۆزمەوەو شیعرەکەی نیشانبدەم .

گۆران؛ ئەوکاتە لەبەشی ژمێریاری دایرەیەکی میری فەرمانبەر بوو، هەر ئەو رۆژگارەیش بوو کەخۆی سەرپەرشتی هەفتە نامەی (ژین)ی ئەکرد. دایرەکە لەناو سەرادا بوو، چوومو بینیم. پێموایە لەهەستاندا بوو، ئەیویست بچێ بۆ شوێنێکی تر. پێموت من فلانم، پێیخۆش بوو. دەستێکی بەسەرمدا هێنا، بەکورتی شیعرەکەم دایە دەست، ئەویش عەینەکەکەی لەچاوکردو کەوتە خوێندنەوەیی و پاندانەکەی دەرهێناو هەر لەسەر هەمان لاپەڕە چەند ژمارەیەکی نووسی (٤ + ٤) یان (٢ + ٢) من دواتر تێگەیشتم کە برگەو ئاهەنگی ناو شیعرەکەی راستکردۆتەوە .

جارێکیتریش، دوای شۆڕشی تەمووز بوو لەچایخانە گەورەکەی بەردەرکی سەرا، رێکەوت، دانیشتنێکی دەگمەن دروست بوو. گۆرانو هەردیو حەمە عەلی هاورێمو من. ئێوارەیەکی درەنگوەخت بوو، تاکوتەرا خەلک بەسەر جادەوە بوون، گفتوگۆکە لەنێوان گۆرانو هەردی-دا بوو. وەک بێتەوە بیرم باسەکە لەبارەی شیعر بۆ سروشتو جوانی و ژن و شیعر وتن بۆ سیاسەت بوو، هەردی ئەیویست ئەوە بلێت ئەو شیعرانەی شاعیر بۆ خۆی ئەلێ، هەمیشە جوانتر دەرئەچن لەو شیعرانەی بۆ دەرەوەی خۆی ئەلێ .

گۆران؛ باسی ڕێژەیی ئەم مەسەلەیەی ئەکردو لەهەمانکاتدا هەردوولا لەسەر ئەوە رێکبوون کە ئیتر شیعر شیعرە. گۆران پیاوێکی هێمنو لەسەرخۆو کەمدووبوو، لەشی لاوازو ناوچەوانێکی پانی پێوەبوو، ناوبەناو نوکتەیەکیشی ئەگێڕایەوە .

هەر لەسەردەمی قاسمدا بوو، دەستەیەک لەکوردە فەیلییەکان لەبەغداوە هاتبوون بۆ سلەیمانی، لەهۆڵی ناوەندی سلەیمانی کوڕان، ئاهەنگێکیان بۆ گێڕان. منیش چووبووم. لەو بۆنەیەدا، گۆران شیعرێکی خۆی خوێندەوە (بای فێنکی زەردەخەنە/ بەسەر کوڵما کەوتە شنە) ئەوە یەکەمجار بوو گۆران ببینم شیعر بخوێنێتەوە. عەینەکەکەی هێنابووە سەر لووتیو بەهەردوو دەست پەڕەکاغەزەکەی گرتبوو. زۆر ساردو سڕو بەدەنگێکی نزم ئەیخوێندەوە. خوێندنەوەیەکی باش نەبوو، سێ جاری تریش دوای ئەوە لەشوێنی جیاجیادا "گۆران"م بینییەوە. لەپاسێکی مەسلەحەدا و هەر خێرا بیتاقەکەم بۆ بڕیو دامە دەستی و ناسیمییەوەو لەئەحواڵی خۆمو دایکمی پرسی.

دووەمجاریش ئەوکاتەی سەرەتای نەخۆشییەکەی بوو، شێرپەنجەی گەدە، لەشووقەیەکدا ئەژیا لەمەیدانی ئازادی، چووم بۆلای و لەو سەردانەدا کاکە حەمەی مەلا کەریم-یشم دی لەوێ بوو .

جاری سێیەم و دواجاریش لەسلەیمانی لەگەڕەکی ئیسکان، دوای ئەوەی لەباکۆ گەڕابۆوەو لەماڵی هۆگری کوڕی کەوتبوو، لەگەڵ مامۆستا کاکەی فەللاحو شارباژێڕی-دا سەردانمانکرد. کە چووینە ژوورەوە بۆلای، لەسەر قەرەوێڵەکەی هاتبووە خوارەوەو خەریکی دەرمانخواردن بوو. گەلێکی پێخۆش بوو کە ئێمەی بینی. شێخ محەمەدی مەحوی-ش لەوێ بوو. باس باسی شیعرەکانی مەحوی بوو، دەربارەی تەندروستی و نەخۆشییەکەی بیرمە وتی: (پیاو چۆن دڵ بەمەعیدەیەک خۆشبکات نیوەی جەلاتین بێ). دوای ئەوە باسی شیعرێکی هەردی کرد کە لەیەکێتی سۆڤیەت بڵاوکراوەتەوە.. بەتەرجومەکراوی یان زمانێکی تر ئەوەم نەزانی. لێرەدا بوو وتی: (من ویستم بنووسن شاعیرێکی کوردی عێراق، بەڵام ئەوان رازینەبوون و نووسییان: شاعیرێکی عێراقی). دەربارەی قوتابییە عێراقییەکان کە بۆ خوێندن لەو وڵاتە بوون دەقاودەق و راستەوخۆ وتی (کردبوویانن بەجاسوس بەسەر منەوە). لەناوەندی قسەیشدا ئاماژەی بۆ شۆڕشی ئەیلول کرد و وتی: (ئاگاتان لەم شۆڕشە بێ) بەڵام ئیتر من لێمنەبیست دژی فیکرو بیروباوەڕی رابوردووی خۆی وەک ئەڵێی قسە بکات یان پەشیمانی نیشانبدات. لەمەسەلەی بەتەنگەوە هاتنی نەخۆشیەکەیدا لەوێ، ستایشێکی زۆری خزمەتگوازری و پەرۆشی ئەوانی کرد. ئەمە دوا بینین و

دواجار بوو کە بەدیداری ئەم شاعیرە گەورەیە شادبم. پێموایە ئیتر دوای ئەم سەردانە ئەوەندەی نەخایاند کە لەرۆژی (١٩٦٢/١١/١٨)دا بەئێجگاری ماڵئاوایی لەشیعرو دنیاکرد .

وەختێ هەواڵەکە بڵاوبۆوە، خەڵکێکی زۆر لەگەڕەکی ئیسکان کۆبوونەوەو ئیتر هەر لەوێوە تەرمەکەی بەرەو گردی سەیوان بەڕێکرا، بیرمە پێبەپێی خەڵکەکەیش پیکابێکی چەکداری پۆلیس بۆ چاودێری لەگەڵماندا بوو.

سەلامێ لەم بکە، تفێ لەو بکە!..

ئەوەی ڕاستیبێ "پیرەمێرد" لەپوختکردنەوەی زمانی کوردیدا، ڕۆڵی ڕێبەری گەورەی بینیوە، بەڵام ئەوەی گۆران کردی، گۆڕان بوو لەبنەما بنچینەکانی شیعری نوێدا، گۆڕان بوو لەبینیندا بۆ دنیاو بۆ شیعر. چاوێکی تازەبوو نەک چاوێکی تەقلیدی، هزرێکی نوێ بوو نەک کۆن. سروشت و جوانیی لای گۆران، وێنای نەبینراو نەبیستراویان لەگەڵ خۆیاندا هێنا، کە هەر تەواو پێچەوانەی دیدو بۆچوونی شاعیرانی لەوەوبەربوون. پاشخانی ڕووناکبیریی تازەی گۆران گەنجینەیەک بوو بۆ ئەم تازەکردنەوەیە، بۆ هەڵشێلانەوەی کەلەپوور. سادەو ڕوون، بەڵام گران. زمانیش هەر زمانی خەلکەکە بوو، بەڵام لەداڕشتن و دەربڕینێکی هونەریدا. زمانی بەر لەپیرەمێردو گۆران، زمانی دوور لەخەڵک بوون و بەتەنها بۆ هەڵبژاردەی سەردەمی خۆیان بوون. ئەفراندنی گۆران لەوێوە دەست پێناکات کە چووەوە سەر کێشی کوردی و وازی لەعەروزی عەرەبی هێنا، ئەمە گۆڕانێکی شکڵییە. بەلکوو لەوێوە دەست پێئەکات، کە دیدو بۆچوون و هزری گۆران لەسنوورە تەقلیدیەکان تێپەڕیکرد. کە ئەم تێپەڕکردن و گۆڕانی فیکرو عەقڵە بۆ ژیان و شیعر بەگشتی پەیدابوو. ئەوا بەسروشتیش گۆڕان لەفۆڕمی شیعر و مۆسیقاو ئاهەنگی زماندا ئەبێت .

گۆرانە ناوەکییەکە یەکەمەو ئەویش بەدوای خۆیدا ئەبێ هەر شکڵی تازەبێنێ. هەرچۆنێک قسە بکەین، شیعر واتە زمان، ئەوەی لە زماندا بگۆڕدرێت شیعریشی لەگەڵدا دێتە گۆڕین. لەبەر ئەوە گۆران سەری پردێکی گەورەی شیعری تازەی ئێمەیەو لەنەخشەی تازەکردنەوەدا یەکێکە لەشارێییەکانو یەکسەر دێتە پێش چاومان. هەر لەسەرەتای شەستەکاندا و بەرلەوەی کودەتای رەشی هەشتی شوبات ڕوویدات، لەسابونکەرانو بەرامبەر گومەزەکەی حەمامی موفتی، کەشتییە نوحەکەی مامۆستا نەجمەدین مەلابوو، دوکانێکی تاڕادەیەک فراوان، چەند قەنەفەیەکی تەختەو چەند کورسییەک و تەختەیەکی رەش، لەملایشەوە هەندێ قاپو مەنجەڵ و پێداویستی بژێویی هەژارانەی ژیانێکی کولەمەرگی، قوتابخانە نەبوو، ماڵیش بوو .

مامۆستا نەجمەدین مەلا، لەدەمێ ساڵەوە یەکێک بوو، لەو مامۆستایانەی، کە خەڵکی کاسبو ناوبازاڕی فێری خوێندەواری، نووسینو خوێندنەوە ئەکرد. وەک بێتەوە بیرم، واتە بەیادەوەری من، لەپێشدا لەباڵەخانەکەی سەرەتای شەقامی سابونکەراندابوو، لەکۆڵانە باریکەکەی تەنیشت دوکانی حەمە سەعیدی خەیاتیشەوە ئەچوویتەوە سەری. من لەو شوێنەدا هاوینێک لام خوێندووە، لەوەکاتەدا ژنی هەبوو، ژنەکەی ناوی "فاتم" بوو، بەڵام لەدواییدا لێکجیابوونەوە. هەڵبەت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش لە "ژین"دا هەموو هەفتەیەک گۆشەیەکی خۆی هەبوو. زۆربەی زۆری دیوانی شاعیرە ناودارەکانی کوردی بەدەستوخەتە خۆشەکەی خۆی نوسیبێوە. لەکۆتایی پەنجاکانو سەرەتای شەستەکانداو تامردنە تراژیدییەکەی، ناوبەناو سەرم ئەدا، هەر لەوکاتەدا بوو، هەندێ مامۆستای وەک فەرەیدون عەلی ئەمینو کەریم باراوی و عەبدوڵلای مەجیدبەگی فێری زمانی فارسی ئەکرد. منیش، کە ئەچووم ئیتر هەر باس باسی فایەق بێکەس بوو، شیعرەکانی لەبەر ئەخوێندەوە .

نەجمەدین مەلا: پیاوێکی بەباڵا مام ناوەندی و دەمو چاوی ئاڵ ئاڵ و وردە دەماری شین بەلووتی و رووومەتە سوورەکانیدا بڵاوبووبوونەوە، دەنگێکی توزێ گڕی هەبوو. بەردەوام مەست بوو، بەتاقی تەنیا ئەژیا. تا سەرئێسقان کوردپەروەر بوو. لەوکاتەوە پاقلە پێئەگەیشت، تا نەئەما، ئەم بەردەوام مەنجەڵێکی لەسەر ئاگربوو، بەردەوامیش پاڵتۆیەکی عەسکەری یەخەپانی لەبەردابوو، گاڵەی بەحاجی و مەلاو سۆفی و شێخ ئەکردو دایئەشۆرین.

پشیلەیەکی گورپەی هەبوو، ناوبەناو ئەیخستە کۆشییەوەو دەستی بەسەردا ئەهێنا. هەموو جارێکیش لەسەر تەختە ڕەشەکەی پەندێکی کوردی ئەنووسی .

وەسیێتی کردبوو ئەگەر مرد لە ئەزمڕ بینێژن. دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، بێ ترس و سڵەمینەوە، بۆ ماوەیەک دوو وێنەی لەبەردەم کەشتی نوحدا دانابوو. یەکێکیان وێنەی مەلا مستەفا و ئەویتر هی عەبدولکەریم قاسم. هەر ڕێبوارێک بەوێدا تێپەڕبوایە بانگی ئەکردن سەلامێ بۆ ئەمیان بکەن و تفێکیش لەویتریان بکەن. دوای کودەتا ڕەشەکەی هەشتی شوبات، لەڕۆژانی قەدەغەی هاتوچۆدا، هەر لەناو کەشتییەکەی نوحداو لەدوکانەکەیدا، مردبوو یان کوژرابوو، پاشماوەیەک بەمە زانراو، من یەکێ بووم لەوانەی لەڕێ و ڕەسمی ناشتنەکەیدا بووم. لەبەر بارودۆخی ئەمنی ئەوکاتە، بەشێوەیەکی کاتی لەگردی سەیوان نێژرا. بەڵام دوای دەرچوونی بەیاننامەی (١١)ی ئاداری (١٩٧٠) کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی لەسلەیمانی، لەڕێوەڕەسمێکی گەورەدا، ئێسکو پروسکیان گواستەوە بۆ ئەزمڕو لەوێ بەخاک سپێردرایەوە. ئەو ڕۆژە من یەکێک بووم لەوکەسانەی بەسواری پیکابەکەوەو و لەڕێی مایکرۆفۆنێکەوە قسەم ئەکرد.

لەنۆی حوزەیرانی (١٩٦٣)دا، لەرۆژی قەدەغەی هاتوچۆو ڕەش بگیری و قەتڵو عامێکی تری کورددا لەسلێمانی، ئەوکاتە من تەمەنم (٢٣) ساڵ بوو، ماڵمان لەئیسکان بوو. یەکێک لەهاوڕێ نزیکەکانی ئەو کاتەم "کەمال قەرەداخی" بوو، ئەوانیش هەر کۆلانێک لەسەروو ئێمەوە بوون. کەمال لەتەمەنی مندابوو، یەکێک بوو لەئەکتەرە باشەکانی ئەوسای شانۆی کوردی، دواتر چوو بۆ ئەمریکاو نەگەڕایەوە. ساڵی (١٩٩٠) لەلۆسئەنجلۆس چوومە ماڵیانو بینیمەوە.

بەیانی نۆی حوزەیران؛ چووم بۆ ماڵی کەمالو ئەو رۆژەو شەوەکەی بەیەکەوە، چاوەڕێی ئەوەبووین کەی سەربازەکانی سوپا ئەگەنە سەرمانو ئێمەیش ڕاپێچ ئەکەن، بەلام خۆشبەختانە بەر لەوەی پشکنینەکە بگاتە ئەو کۆلانەی ئێمە، کۆتایی بەقەدەغەی هاتوچۆهاتو ڕزگارمان بوو. ڕۆژگاری تاریکو تاڵی (زەعیم سدیق)ی جەللادو نۆی حوزەیرانی (١٩٦٣) چەندین برینی قوڵیانکردە جەستەی کوردەوە، بەدەیان لاوی ئەم شارە بوونە قوربانیی، هەبوون هەر لەماڵەکانی خۆیاندا نێژرانو بەشێکی تریشیان لەحامیەی سلەیمانی بەر دەستڕێژ درابوون..! خەڵکێکی زۆر لە خوێندکاران و مامۆستایانو کاسبکاران گیرانو خرانە بەنگەڵەکانی حامیەی سلەیمانییەوە.

زەعیم سدیق؛ بەر لەم تاوانانەیش، کۆمەڵێک هاوولاتی کوردی تری لەگوندی سیارە کوشتبوو، عەسکەرتارێکی فاشی عەرەب بوو. لەناو قوربانییەکانی سلەیمانیدا چەندین کەسایەتی دیاری کۆمەلایەتیو مامۆستاو کاسبکاری تێدابوو، چەند وەرزشکارێکی ئەم شارەیش بوونە قوربانیی، وەکوو یاسینو حەمەبۆرو عەزیز و هەروەها باقی ئەفەندی مامۆستاو کەسایەتی ناوسراو نامیق ئاغاو ئیماعیل ئیبراهیم و ئەنوەر دارتاش و زۆری تر. لەناو ئەم شەهیدانەدا (کەمالی حەمەی حاجی فەرەجە فەندی) هاوتەمەنو هاوڕێی قوتابخانەم بوو، لەیەک پۆلدا بووین.

بیرمە لەپۆلی دووسێی سەرەتاییدا چەند جارێکیش پێکەوە چووین بۆ ماڵی خۆیان تا پۆلی شەشیشمان تەواوکرد لەیەکتر جیانەبووینەوە.

ئەگەرچی نۆی حوزەیرانی (١٩٦٣) ئەم شارە(سلێمانی)ی خوێناویکرد، بەلام لەهەمانکاتیشدا ڕاپەڵەکانو ئەوەندەی تر بەرامبەر بەداگیرکەرە فاشییەکانی عەرەب، سووربوونی لەسەر ئازادیو ڕزگاری لادروستکرد.

شیعر خولیای شەوو ڕۆژم بوو، بەلام تا ئەوکاتەیش هێشتا کەرەستەی هونەریم لانەخەملی بوو. خوێندنەوەم بەعەرەبی باشتر بووبوو. من بۆ خۆم سەرزەنشتێکی توندی ئەو کاتەی خۆم ئەکەم، کەنەمتوانی بیقۆزمەوەو تەنانەت لەشوێنێکی وەکوو سلەیمانیشدا خۆم فێری زمانی ئینگلیزی بکەم. وەک چەندین کەس توانییان بیکەن، من تەمەلو سستو کەمتەرخەم بووم..! هەر بۆ ئەو ڕۆژە ئەژیام کە تیابووم، کاتی دەستبەتالی خۆم لەچایخانەکاندا بەسەر ئەبرد، ئەمە جگەلەوەی بەکال فامی و هەرزەییەوە چوومە ناو سیاسەتەوە .

ئێمە، هوشیار نەبووینو بەعاتیفەیەکی ڕووتەوە شوێن دروشمە بریقەدارەکان ئەکەوتین، بریتی بووین لە تۆپەلێ حەماسەتو هیچی تر. من ئێستا لەم تەمەنەدا کە شەستو پێنج سالم، وەختێ ئاوڕ لەبەهەدەردانی سەردەمی لاوێتی خۆم ئەدەمەوە، تێئەگەم چ غەدرێکم لەخۆمو بەهرەی خۆم کردووە..! ئێستا ئەزانم ئەگەر چەند زمانێکی ترم بزانیایە، ئەشیا کاری باشترم ئەنجامبدایە لەوەی، کە تا ئێستا کردوومە .

من نەوەعز ئەدەمو نەمەبەستیشم لەئامۆژگاری وشکو ڕەقو تەقی باوکانەیە، بەلام لێرەدا ئەگەر قسەیەکم بۆ نەوەی تازەو بەهرەدارانی نێو بوارەکانی ئەدەبو هونەر هەبێت، هەر ئەوەیە بلێم: "یەک سەعات کاتی خۆتان بەفیڕۆ مەدەن، بەرلەوەی بلاوبکەنەوە، چەندە ئەتوانن لەڕێی خوێندنو خوێندنەوەو فێربوونی زمانە زیندووەکانی دنیاوە، خۆتان کۆکو تەیار بکەن. بۆ ئەوەی دواتر پەشیمان بوونەوەتان نەبێت، یان کەمتر بێت. من وامنەکرد و هەلەبوومو بەلام لەم تەمەنەدا تازە پەشیمان بوونەوە هیچ دادێ نادات."

شەستەکان بۆ ئەدەبو هونەری کوردی بەستەلەک بوو، زۆربەی زۆری ئەو شیعرانەی تائەوکاتە بلاومکردبوونەوە، کالوکرچو نەگەیو بوونو پەلەکردنو حەزی زەقی خۆدەرخستنی هەرزەکارییان پێوە دیاربوو. لەگەل خوێندنەوەی هەر بەرهەمێکی جوانی ئەدەبیدا، ئەم قەناعەتەم لاجێگیرتر ئەبوو، زمانی شیعرم لەفەزای شیعری گۆرانو هەردی-دا ئەسووڕایەوە. چۆن ببم بەخاوەن شێوازی خۆم؟! ئەمە ئەو پرسیارە بوو، لەم تەمەنە بەولاوە هۆشو گۆشی داگیرکردبووم، لەکۆتایی سالی (١٩٦٤)داو لەسەردەمی حوکمی فاشییەکی تری عەرەبدا کە "عەبدولسەلام عارف"بوو، وەرچەرخانێکی گەورە بەسەر ژیانمدا هات .

ئەو وەختەی هێشتا تەمەنی شۆڕش پێنج ساڵی تەواو نەکردبوو، بڕیارمدا شار بەجێبێڵم‌و بچمە دەرەوە. تا ئەوکاتە لەدایرەی ئیشغال بووم، بەیانییەک دوای ئەوەی چووم بۆ دەوام، لەپڕ نازانم چۆن بوو، بەئیشێک چوومە دەرەوە. هەردوا بەدوای ئەم چوونە دەرەوەیەم، مەفرەزەیەکی ئەمن خۆی ئەکات بەدایرەدا تابمگرن !..

بەڵام خۆشبەختانە لەوێ نەبووم. بەردەستێکمان هەبوو کاک حەمە ساڵح، دێتە دەرەوەو لەسەر قەراغی شەقامەکە ڕائەوەستێ، وەختێ من گەڕامەوە، خێرا بەرەو ڕووم هات‌و هەواڵەکەی پێڕاگەیاندم، بەهەرحاڵ دەربازبووم‌و برادەرانی 'کاژیک'م ئاگادارکرد. ماوەی هەفتەیەک زیاتر لەماڵی خاڵە ڕەووف، خاڵی دایکم نزیک حەمامی سوورەت خۆم حەشاردا، دەستێ جلی کوردییان بۆ کڕیم‌و ئیتر ئێوارەیەک بەتاریکیی، کاک حەمە عەلی فەرەج کە یەکێک بوو لە(پ.م)ەکانی ناوشار، لای کاک مەحمودی حاجی کاری ئەکرد، هلت و لەگەڵ ئەودا چووینە ئابلاخ و لەوێشەوە بەلاڕێدا گەیشتینە دەرەوەی سلەیمانی .

لەوێ چەند (پ.م)ێکمان تووش بوو، کاک حەمە عەلی فەرەج، منی تەسلیمی ئەوانکردو ئینجا ڕۆیشت. ئینجا ڕوومانکردە سەرگەڵوو. لەبەر ئەوەی من شلەشاری بووم‌و شاخ‌و داخم کەمتر دیبوو، ڕۆیشتنم خراپ بوو، بەدابان-دا

سەرکەوتین‌و چووینە ناو سەرگەڵووەوە. ئەوکاتە، کاک نەوشیروانی فوئاد مەستی؛ بەرپرسی ئەو ناوچەیە بوو، دیارە ئەیناسیم‌و شەوێک لەوێ مامەوە، دوای ئەوەی نامەیەکی بۆ نووسیم، ئینجا لەوێوە رووم‌کردە ماوەت، لقی چواری (پ. د. ک) لەماوەت بوو، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم کاک عەبدولی سوران؛ بەرپرسی لقی چوار بوو، کاک فوئاد جەلال و کاک شەوکەتی حاجی عەلی ئەندامانی لقی چوار بوون .

کاک عەلی ئیبراهیم دەرویش؛ بەڕێوەبەری بەندیخانەکەی ماوەت بوو، لەپێشدا کاک عەبدولم بینی، هەروەها کاک عەلی، بەڵام هەستمکرد زۆرساردو سڕبوون، ئەوەندە گوێیان نەدامێ و وتیان ئەبێ بچی بۆ مەکتەبی تەنفیزی لەگەڵی بەدرانی نزیک گەلاڵەو نامەیەکیان بۆ ئەوێ بۆ نووسیم. من یەکسەرزانیم ئەو ساردو سڕییەی ئەوان بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە زانیویانە یان بیستوویانە کە من کاژیکم و پارتی نیم !..

کەسیان خولقی ماڵی خۆیان نەکردم، تا خۆم وتم: "ئەی من لەکوێ بم؟!" پێیان وتم: "بچۆرە مەکتەبەکە". لەمەکتەبەکەی ماوەتدا دوو ژووریێکیان کردبوو بەمیوانخانە، پەڕپووت‌و پیس و پۆخڵ و ناخۆش. ئەو دووسێ شەوەی لەماوەت مامەوە کەوتمە ناو کۆمەڵێ سەرسەری و شەللاتی سلەیمانیەوە، کە نازانم بۆچی بانگیان کردبوون بۆ ماوەت. هەر لەو دووسێ رۆژەی ئەوێدا، پیاوێکی خەڵکی رۆژهەلاتی کوردستانم ناسی کە ناوی "مەجید گورگ"بوو، دوا بەدوای شەڕەکانی نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و بارزانی‌و هەلاتنی ئەو بەشەیان بۆ ئێران، بەفەرمانی بارزانی ئەمیش گیرابوو. دواتر بەردرابوو، ئەوکاتەی من دیم هەر لەناو ماوەتدا دەستبەسەربوو. بەڵام ئەم پیاوە کێیەو کێ نییەو لەگەڵ کێدا بووەو بۆچی وای بەسەرهاتووە؟ نەچوومە بنج و بناوانی و نەیشمزانی دواتر چی بەسەرهات .!

لەگەڵ یەکدوکەسی تردا، کە ئەوانیش بەرەو گەلاڵە ئەڕۆیشتن کەوتینەڕێ، ڕێیەکی ئێجگار دووروودرێژ، ئەوە یەکەمجارو ئاخر جاریشم بوو ڕێگەی وا ناخۆش‌و دژوار بەپێ ببڕم. لەپردە داڕوخاوەکەی (تەیەت) پەڕینەوە، ئەمجارەیان چووینە بەشەکەی تری کوردستانەوە. ئەو دیمەنە سیحراویانەی بەدرێژایی ڕێگە ئەمبینین هەر لەدارستانی چڕو ڕووباری بەخوڕو گۆمی ڕوون‌و دەشتی بەگیاوگوڵ و بژوێنەوە، تا ئەگاتە سەر هەورازی سەخت‌و چیای سەر بەبەفرو بناری بەبژوێن‌و کانیاوی ساردو فێنکەوە، سەرسامیان ئەکردم .

مرۆڤ؛ تابەپێ بەناو سروشتی کوردستاندا نەڕوات، هەموو جوانییەکان نابینێ و هەست بەنهێنی و ئەفسونیان ناکات. تائێستەیش دیمەنی ئەو ئێوارەیەم بیرنەچۆتەوە .

دوای ئەوەی نیوەڕۆژێک بەڕێوەبووین، خۆرنشین چووینە گوندێکەوە ئێجگار هیلاکو ماندوو برسی بووین. تاکە ماڵێ لەقەراغی گوندەکەدا بوو، ژنێک نانی ساجی ئەکرد، سلاومانکردو ژنە هەستاو چوو کاسەیەک دۆو هەندێ تەڕەپیازیشی هێناو نانی تازەو گەرمی سەرساجیشی دائەگرتو ئەیخستە بەردەممان. تامی ئەو نانی ساج و تەڕەپیازو دۆیە، تائێستەیش لەژێر ددانمدایە!. هەر لەو ڕێ پێوانەدابوو، وابزانم هەر لەکوردستانی ئەودیودا بووین، بەنێو دارستانێکدا ڕەت ئەبووین، لەپڕکەوتین بەسەر دیمەنێکی ئێجگار سەیرو نەبینراودا، کۆمەڵێ ژن بەڕووتی، ڕووتو قووت، ئاویان ئەکرد بەخۆیاندا، دووسێیەکیان هەر بەپێوە بوون، ئێمە سێ گەنج بووین، یەکسەر لەشوێنی خۆمان چەقین. بەلام یەکێک لەژنە ڕووتەکان، بەدەم زەردەخەنەوە، ئاماژەی بۆ کردین تا تێپەڕینو گوێنەدەینێ، وەک لەدواییدا زانیم ئەم ناوچەیە، کە لەباڵەکایەتییەوە درێژ ئەبێتەوە تا موکریان. دیاردەی ڕەدووکەوتنی ژنی تێدا ئاساییەو بەمانایەکی تر گەلێ دابو نەریتو پەیوەندی کۆمەلایەتییان لەگەڵ شوێنەکانی تردا تەواو جیاوازن.

تێپەڕین؛ بەلام هەرسێکمان بەلاچاو هەر تەماشای ئەو لەش‌ولارە جوانانەی ئەوانمان ئەکرد. ئەم ڕێپێوانە بەرەو گەلی بەدران، هەفتەیەکی خایاند، دەمەو عەسرێک، گەیشتینە بەردەمی گەلی بەدران، دوو هاوڕێکەی تر خواحافیزییان لێکردمو چوون بۆ گەلالە .

ئەوکاتە هەر لەبەردەم گەلییەکەدا، کاک حەمەی عەزیزی خەڵکی سلەیمانی، ژوورێکی دروستکردبوو، توولە سەگێکی هەبوو بەردەوام بەدوایەوە بوو، من کاکە حەمەم ئەناسی، لەکاتی خۆیدا بەر لەدامەزراندنی کاژێک، حزبی گەلیان دروستکردبوو، دواتر خۆیان هەڵوەشاندەوەو هاتنە ناو کاژیکەوە. کاکە حەمە لەم شوێنەدا چاودێری گەلییەکەی ئەکرد، هەرکەسێ بچوایە بۆ سەرەوە، ئەبوو لەپێشدا کاکە حەمە ببینێ و بزانێ ئیشی چییەو چی ئەوێ.

گەلی بەدران؛ لەناوچەی باڵەکایەتییە، ئەکەوێتە ناوەندی ئەو ڕیزە چیایەوە کە لەمامە ڕووتەوە درێژ ئەبێتەوە، نزیکترین شارۆچکە لەگەلی بەدرانەوە،

مەرکەزی ناحییەی گەلالە بوو، نزیکترین گوندیش لەم دەربەندەوە "بۆکریکان"ە، کە ئەکەویتە پیش دەمی گەلییەکەوە .

ئەم گەلییە دیمەنیکی سامناکی هەیە، شوینیکی سەختو قایمە، بۆ خۆحەشاردان بەدەیان ئەشکەوتو کەویلی تیدایە. کاکە حەمە کەمنی بینی زۆری پیخۆش بوو، ریزی لیگرتم و لەژوورەکەیدا پیکەوە دانیشتین و چی هەوال و دەنگوباسیک هەبوو بۆمگیرایەوە، نامەیەکیشم لەکاژیکەوە بۆ هینابوو دامێ و دوای پشوودان بەرەو ناوگەلییەکەو سەرەوە هەلکشام. لەناوەراستی دەربەندەکەداو لەو ئاستەدا کە گەرووەکەی تەواو تەنگ ئەبیتەوە، بەدەستە چەپدا، لەئەشکەوتیکی قایمو گەورەدا "مەکتەبی تەنفیزی" جیی بۆ خۆی چاککردبوو، ئەوکاتە "د. مەحمود عەلی عوسمان" سەرپەرشتی کارەکانی مەکتەبی ئەکرد.

من لەوەوبەر چەندینجار د.مەحمودم بینیبوو، واتە ئەو سەردەمەی، کە یەکیتی لاوانی کوردستانو قوتابیانی کوردستان، دوای شۆرشی تەمووز، بەرەسمی مۆلەتیان لەحکومەتی قاسم وەرگرتبوو، بارەگای یەکیتی لاوانی کوردستانیش لەخانووە دیرینەکەی باوکی "شازاد جەمیل سائب"دا بوون لەسلەیمانی .

ئەوکاتە د. مەحمود زوو زوو لەبەغداوە بۆ سەرپەرشتی کاروباری لاوان و قوتابیان ئەهاتەوە بۆ سلەیمانی و کۆبوونەوەی لەگەلدا ئەکردین، من ئەوکاتە ئەندامی لیژنەی شاری یەکیتی قوتابیانی کوردستان بووم لەسلیمانی. وائەمجارەیش لەسەردەمو بارودۆخیکی تردا ئەیبینمەوە. کەچوومە ناو ئەشکەوتەکەوە، د.مەحمود لەوێ بوو، لەپشت میزیکی ئاساییەوە دانیشتبوو. تۆمارە دەفتەریکی گەورەو بەرگ ئەستووری لەبەردەمدا بوو، شوینیکی نسرم و شیدار، لەبنەوە چەند ژووریکیان تیا دروستکردبوو، ژووری بیسیمەکەی مەکتەبی تەنفیزیش، هەر لەویدابوو، (پ.م)ی سەر بیسیمەکە زوو زوو ئەهاتو بروسکە تازەکانی ئەدایە دەست دکتۆر .

دوای قسەکردن، پیی وتم: "تۆ جارێ ماوەیەک لیرە بمینەرەوە، بابزانین بۆ دوایی چۆن ئەبێ". ئیتر منیش لەوێ مامەوەو لەبەرئەوەی جارێ هیچ کاریکم نەبوو، خەریکی خویندنەوەی خۆم بووم. وەک بیتەوە بیرم لەوکاتەداو لەهەمان گەلیدا حەمە ئەمین بەگو شیخ رەزای گولانی و هەروەها چەند ئەفسەریکی عەرەب کە هاتبوونە ناو شۆرشەوە، لەوانە، "غضبان السعد" لەم گەلییەدا ئەژیان .

لەو ڕۆژانەدا فڕۆکەی جەنگی عێراق، میک و هەنتەر بەخەستی کەوتبوونە بۆردومانکردنی ناوچەی باڵەکایەتی، دووسێ ڕۆژیش لەسەریەک دوو فڕۆکەی تویۆلیفی ڕووسی گەورە، دەورو خولی گەلی بەدرانیان ئەدا، تا ڕۆژێک سەرلەبەیانی کەوتنە بۆردومانکردنمان.

لەبۆردومانەکەدا (پ.م)ێکی هاوڕێمان کەخەڵکی کەرکوک بوو، هەر ئەو ڕۆژەیش مۆڵەتی وەرگرتبوو بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ناوچەی گەرمیان، پارچەیەکی بچووکی ناپاڵم دابووی لەدڵیو شەهیدی کرد. ڕۆژێکی خەماوی و دڵتەزێن بوو، بۆ ئێوارە لەگەڵ د.مەحمود و کۆمەڵێ پ. م دا تەرمەکەیمان بردوو لەوبەر، لەگۆڕستانە بچکۆلەکەی "بۆکرێکان" بەخاکمان سپارد.

(لەشیعرە دراماییەکەی "سروودە بەردینەکان"دا کە، تا نووسینی ئەم دێڕانە (٢٠٠٥/١/٦) تازەترین بەرهەممە، گەڕاومەتەوە بۆ ئەو سەردەمەو گەلی بەدران و وێنەگرتنی ئەو ڕووداوانەو شەهیدبوونی ئەو هاوڕێیەمان لەگەلییەکەدا).

ڕۆژانی دوای ئەو کارەساتە، ئیتر هەموو بەیانییەک شەبەقی لەبەر بۆردوومان هەڵئەسایینو لەدەربەندەکە دوور ئەکەوتینەوەو لەپەنایەکدا خۆمان حەشارئەداو دەمەو ئێوارە ئەگەڕاینەوە بۆ شوێنەکانی خۆمان .

بەمجۆرە نزیکەی مانگێک لەگەلی بەدران مامەوە. بێ تاقەت بووبووم، چونکە هیچ کارێکم نەبوو. ئەمجارە د.مەحمودم بینی و داوای کارملێکرد، ئەویش وای بەباشزانی لە"دەنگی پێشمەرگە"دا لای مامۆستا هەژار موکریانی کاربکەم، کە ئەوکاتە لەگوندی "لێوژە" ئەژیا .

دکتۆر نامەیەکی بۆ نووسیمو ڕۆیشتم، گوندی لێوژە لەگەلی بەدرانەوە ئەوەندە دوورنەبوو. لەگوندە هەرە جوانو خۆشەکانی ناوچەی باڵەکایەتییە. وەختێ گەیشتمە نزیکی گوندەکە بەدەیان لاکی ئێسترو بارگیرو گوێدرێژ لەئەنجامی بۆردومانکردنەوە لەو ناوەدا کەوتبوونو قەلو داڵ تێیان ئالابوون. هەواڵی شوێنی مامۆستا هەژار-م لەپیاوێکی گوندی پرسیی و ئەویش هەر بەپەنجە نیشانیدام .

لەپێشدا نەیناسیمەوە، کە پێموت من کێم، ئەوکات بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم. ئەمە دووەمجار بوو هەژاری موکریانی ببینم.

جاری یەکەم لەبەغدا، ئەوسا تەمەنم (١٣-١٤) سالان بوو، وەختێ کاک عومەر هەڵمەت منی پێناساند، ئەو وەختە هەژار لەسەر شەقامی غازی لەبەغدا ستودیۆیەکی وێنەگرتنی هەبوو. ئەمماڵەی لێوژەی، تەنها ژوورێک بوو، دوو قەرەوێڵەی تێدابوو، لەولایشەوە پریمزێک و هەندێ قاپو قاچاغ .

لەسەر قەرەوێڵەکەی تر، گەنجێکی باریکەلەی قژرەش، خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو. لەگەڵ هەژاردا لەو ژوورەدا پێکەوە ئەژیان، ئەویش کاک سامی محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان بوو .

کاک سامی، ئەوەندە نەبوو لە لەندەنەوە گەڕابۆوە بۆ کوردستانو ناو شۆڕش و سەرپەرشتی چاپخانە گەورەکەی شۆڕشی ئەکردو هەروەها بەرپرسی یەکەمی ڕۆژنامەی (خەبات)یش بوو. "دەنگی پێشمەرگە"یش مانگی یان دوو مانگ جارێ هەر لەوێ دەرئەچوو، هەژار موکریانی، سەرپەرشتی بوو .

مامۆستا هەژار نامەکەی د.مەحمودی خوێندەوە، لای خۆی جێگە نەبوو. لەبەرئەوە نامەیەکی بۆ "مەلا گچکە" نووسیی، کە ئەویش لەهەمان گونددا ئەژیا. چووم بۆ ماڵی مەلا گچکە، ڕێزێکی زۆری لێگرتم. خەڵکی شەقڵاوە بوو. شاعیرێکی میللیش بوو، لەهەمانکاتیشدا بەپیشە برینپێچ بوو، لەبەشی تەندروستیدا کاری ئەکرد. ماڵەکەی ئەم گەورەتر بوو .

مەلا گچکە؛ پیاوێکی بەوێڵ و قسە خۆش بوو. سەرگوزشتەی سەیرو قسەی نەستەقی لابوو. ئەوکاتەی من لەلای بووم، هەر خۆی بوو، چونکە هیچ ژن و منداڵێکم نەبینی. شەوانە تادرەنگ لەبەر فانۆزەکەدا دائەنیشتین و قسەمان ئەکرد. لەو ماوەیەدا کە لە لێوژە بووم، هەندێ نووسینو شیعرم بەناوی "کاوە"وە لەدەنگی پێشمەرگەدا بڵاوبوونەوە .

هەژار موکریانی؛ بەرلەوەی بێت بۆ لێوژە، سەرپەرشتی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراقی کردبوو، کە ئەوەندە نەبوو دامەزرابوو. پەخشەکەیشی ئەگەیشتە هەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستان. بەدیواری ژوورەکەی مەلا گچکەوە، هەندێ وێنە هەڵواسرابوون. یەکێک لەوانە وێنەیەکی شێخ مەحمودی حەفید بوو، تەماشاکردنی ئەم وێنەیە گێڕامییەوە بۆ ڕۆژی (١٩٥٦/١٠/٩) ڕۆژی هێنانەوەی تەرمی شێخ لە بەغداوە بۆ سلەیمانی.

ئەوکاتە لەپۆلی سێی ناوەندی پیشەسازی بووم لەسلێمانی، قوتابخانەکەمان لەبینای ڕۆژئاوای شاری سلەیمانی بوو. لەبزووتنەوەی قوتابیاندا کارم ئەکرد،

پێش نیوەڕۆی (١٩٥٦/١٠/٩) شڵەژانێ کەوتە نێو بازاڕو شارو شەقامەکانەوە، هەواڵەکە بەخێرایی ماڵ بەماڵ بڵاوبۆوە، شێخ مەحمودی حەفید، سەرلەبەیانی هەمانڕۆژ لەخەستەخانەی حەیدەرییە لەبەغدا کۆچی دواییکردووە .

ئیتر ئەو ڕۆژە، دەقیقە لەدوای دەقیقە، بەیەکدا هاتنی خەڵکو خرۆشان، تێکەڵ بەگریانی بێدەنگ ئەبوون. ئۆتومبیلێکی زۆر ڕوویانکردە کەرکوک، ئێمەیش خۆمان ئامادەکردبوو لەگەڵ گەیشتنەوەی تەرمەکەدا، بیکەینە خۆنیشاندان .

سلێمانی لەچاوەڕوانیەکی غەمگیندا ئەژیا. سەرلەئێوارەیەکی درەنگ، بەرایی ئۆتومبیلی ڕێچکە بەستوو گەیشتنە بەردەمی قوتابخانەکەمان، لەو ئاستەدا خەڵکی پەلاماری تابوتەکەی شێخیان داو هێنایانە خوارەوەو خستیانە سەرشانیان و ئیتر ئاپوورەی جەماوەرەکە، ڕوویانکردە بەردەرکی سەرا .

ئێمەی کوڕوکاڵانی ئەوکاتە، وەک مەلیکێکی کۆچکردووی کوردستان چووبووین بەپیر تەرمەکەوە. واتە بەهەستی کوردایەتییەوە لەگەڵیدا بووین. بەڵام دیاربوو کۆمۆنیستەکان ئەیانویست ئەم خرۆشانی خەڵکە بۆ دروشمەکانی خۆیان بقۆزنەوە. ئەگینا هوتافکێشان لەوێدا "بڕوخێ حیلفی تورکی پاکستانی" چی مانایەکی هەیە .!

بەهەرحاڵ ئاپوورەی خەڵک تائەهات زیادی ئەکرد، دەنگێ زاڵ بوو، بەدەنگی "مەلیکی کوردستان"، بەرلەوەی تەرمەکە بگاتە بەردەرکی سەرا، بەوبەری بیناکەی تۆفیق قەزازەوە، حەمامی شێخ غەنی هەبوو، لاشەی شێخیان برد بۆ ئەوێ و لەوێ شۆراو کفن کرا .

ئەم چاوەڕوانییە زۆری خایاند، دنیا تاریکی کرد، دارەمەیتەکە هاتەوە ناو خەڵکەکەو ڕوومانکردە بەردەرکی سەرا .

بیرمە ئەوانەی لەخرۆشانی خەڵکو جۆشدانیاندا دەوریان هەبوو، فەرەج ئەحمەد و جەلالی میرزا کەریمو ئەنوەر عوسمانو حەمە چاوشینو ئێمە بووین، واتە هاوڕێ نزیکەکانی خۆم. ئەو کەسەی لەپێشی پێشەوە بەدو دەست تابووتەکەی بەرزکردبۆوەو هاواری ئەکرد "ڕەووفی عەرەبانچی، ڕووفی عەلی فایز" بوو، خەڵکەکە دارەمەیتیان بردە ناو حەوشەکەی سەراو، ئیتر لەوێوە، تەقە دەستیپێکرد، دیسانەوە هێنایانەوە دەرەوەو ئەمجارە ڕوویانکردە بەندیخانەی سەرەوە، خەڵکە ئەیانوت "بۆلای شێخ لەتیف، بۆلای شێخ لەتیف" چونکە شێخ

لەتیف لەوکاتەدا لەبەندیخانەی سلەیمانی زیندانی بوو. بەتەقەکان تاڕادەیەک خەڵک پەرش‌و بڵاوبوونەوە، بەلام ئاپوورەکە هەر ڕوویکردە سەرەوە .

لەبەردەمی بەندیخانەکەداو تابووتیش هەر بەسەرشانەوە. داوای بەربوونی شێخ لەتیف-یان ئەکرد. ئەم وەستانەیش لەوێدا، درێژەی کێشا، بەلام هیچ ئەنجامێکی نەبوو، دیسانەوە سەربەرەو خوار گەڕاینەوە بۆ بەردەرکی سەرا. هەر لەبەردەمی سەرادا، لەسەر تەختەیەک لاشەی ژنێکی جوان دانرابوو. لەدواییدا زانیمان ئەوە (ئەختەر)ی ژنی ڕەشۆلەو شەهید کراوە .

من بۆ خۆم سێ چوار کوژراوی تریشم بینی، من‌و حەمە عەلی هاوڕێم، چووینە کۆلانە باریکەکەی تەنیشت دوکانی حەمە سەعیدی خەیات-ەوە، لەوێدا گەنجێکمان بینی، خوێن لەلاقی ئەچۆڕایەوە، دیاربوو خەڵکی دەرەوەی شار بوو، چووینە ژێر باڵی، ماڵی برین پێچێ لەوێوە نزیک بوو، ناوەکەیم لەبیرچۆتەوە. لەدەرگاماندا بەپەلە برینەکەی بپێچێ، تائەبرێتە خەستەخانە. بەلام ئەو زۆر نامەردانە بێ ئەوەی وەلام بداتەوە، دەرگاکەی بەڕووماندا داخستەوەو چۆوە ژووری .

بەهەرحال هاتینەوە سەری کۆلانەکەو ئوتومبیلێ پەیدا بوو لەگەڵ یەکدو برینداری تردا بردیانێ بۆ خەستەخانە. ئێمەیش هەر بەکۆلانەکاندا بەرەو ژووربووینەوە بۆ ماڵی حەمە عەلی‌و ئەو شەوە لەوێ مامەوە.

لەگوندی لیوژێ-یش کارەکانم ئەوەندە نەبوون، چونکە جاری واهەبوو "دەنگی پێشمەرگە" بەدوومانگ جارێک دەرئەچوو، هەموویشی هەر مامۆستا هەژار خۆی کارەکانی مەیسەر ئەکردو سەرپەرشتی لەچاپدانیشی ئەکرد .

پێمخۆش بوو کارەکەم بگوێزمەوە بۆ ڕادیۆی "دەنگی کوردستانی عێراق"، بەمام هەژارم وتو ئەویش بەلایەوە پەسەند بوو. دوای چەند ڕۆژێ هەموو لایەک ڕازیبوونو منیش هەگبەکەم دا بەشانمداو بەرەو ڕادیۆی شۆڕش کەوتمەڕێ.

ڕادیۆکە و ستافەکەی لە"ئەشکەوتی سەردیمان" بوون بەگردێکەوە، بەرامبەر چیای مامەڕووتە، خوارووی ڕۆژهەلاتی گەلالە، لەچاو بەرزاییەکانی مامە ڕووتەو شاخەکانی دەوروبەر ئەشکەوتی سەردێمان لەشوێنێکی نزمدا بوو. کەس خەیالی بۆ ئەوە نەچوو ڕادیۆکە لەشوێنێکی وائاساییدا بێ .

دەمەو عەسر گەیشتمە سەرگردەکە، پرسیارمکرد، وتیان ئەوە ژوورەکەی مامۆستا سالح یوسفی-یە، لەوکاتەدا ئەو بەڕێوەبەری ڕادیۆ بوو. دوای ئەوەی چوومە ژوورەوەو سلاومکردو نامەکەی مام هەژارم دایە دەست، خوێندییەوەو زانی من کوڕی فایەق بێکەسم، ڕێزێکی ئێجگار زۆری گرتم. کەوتە باسکردنی باوکمو شیعرەکانی و چۆن بەرامبەر بەئەدمۆنس (٢٧) سالەکەی خوێندۆتەوە. بەقسەکانیدا زانیم بێکەسی دیوەو لەگەلیدا دانیشتووە .

یوسفی؛ پیاوێکی لاوازی کەڵەگەت بوو، هێمن و لەسەرخۆو پاک و بێ غەلوغەش بوو. قسەی زمانو دڵی یەک شت بوون، ئێجگار سادە بوو. تارادەیەکیش خۆش بڕوا بوو. لەکاتی خۆیشیدا شیعری نووسیوەو لەگۆڤاری "گەلاوێژ"دا بڵاوکراونەتەوە. ئەوەی لەبیرکردنەوەی ئەم پیاوەدا نەبوو، ڕقو تۆڵەکردنەوە بوو. ئەندامی لیژنەی ناوەندی (پ. د. ک) بوو، لەدایکبووی زاخۆ بوو. لەسەردەمی هەرزەکارییەوە تێکەڵ بەبزووتنەوەی سیاسی بووبوو. دەربەدەری و زیندانو هەژاری زۆر دیبوو. لەدوای ئەوەی ماوەیەک لای دانیشتم، (پ. م)ێکی بانگکردو پێیوت "بچۆ بەعوسمان بڵێ بابێ بۆ ئێرە". پاش تۆزێ کاک "عوسمان سەعید" خۆی کرد بەژووردا. منی ئەناسی و ئەیزانی کێم .

عوسمان سەعید؛ بەپیشە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو لەسلێمانی، لەوکاتەشدا بێژەری یەکەمی کوردی بوو لەڕادیۆو بەتەمەن نزیکەی دە ساڵێ لەمن گەورەتر بوو .

سەیدا یوسفی پێی وت: "کاک عوسمان شێرکۆ بابێتە ژوورەکەی ئێوە". هەگبەکەم هەلگرتو شوێنی کەوتم. کارمەندانی ڕادیۆ، دوو دوو سێ سێ لە ژوورێکدا بوون، ژوورەکان بەلاپاڵ و سەر گردەکەوە بڵاوبڵاو دروستکرابوون، زۆرپای داریان تێدا بوو. ڕادیۆکە بەسێ زمان، کوردی و عەرەبیو ئینگلیزی بەرنامەکانی خۆی بڵاوئەکردەوەو ئامێرەکانی لەنێو ئەشکەوتە گەورەکەی سەردێماندا دانرابوون .

ئەشکەوتێکی قایم و قوڵ. ستافی ڕادیۆکە بەهەموو بەشەکانی و بەتێکڕای نووسەرانو بێژەران و پ. م و فەنییەکانەوە، نەئەگەیشتنە سی کەس. بەگردەکەدا کەمێکی تر سەرکەوتینو کاک عوسمان خۆیکرد بەژوورێکی سێ بەچواردا.. ئەوسا لەجیاتی قەرەوێڵە، چوارتەنەکەی پڕ لەبەردو خۆڵ دائەنراو تەختە یان داری ئەخرایە سەرو دۆشەکەکەی لەسەر ڕائەخرا، یان هەر لەعەردا جێگاکان ڕائەخران. کە چووینە ژوورەوە پیاوێکی گردەڵەی لێبوو، لەسەر جێگاکەی خۆی خەریکی نووسین بوو. خۆی پێناساندم کاک "جەلال عەبدولڕەحمان"بوو، ئەندامی یەدەگی لیژنەی مەرکەزی پارتی لەدەورەی پێشووترداو سەر بەباڵی مەکتەبی سیاسی بوو، وەک نیمچە دەست بەسەرێک ڕەوانەی ڕادیۆ کرابوو. جێگایەکی تریش لەولاوە ڕاخرابوو کەسی لەسەر نەبوو. عوسمان سەعید زۆرگەرم نەبوو لەگەڵم، فیز زل و لووت بەرز هاتە بەرچاوم. ئەو ڕووەی نەدامێ کە پێویست بوو بمداتێ .

بەپێچەوانەوە کاک جەلال عەبدولڕەحمان کە لەوەوبەر نەمئەناسیو خەڵکی سلەیمانیش نەبوو، ڕووی خۆشترو گەشتر بوو لەگەڵم، دوای ماوەیەکی زۆریش ئەوەمزانی کە کاک جەلال ژن برای خالید دلێری شاعیرە، بەهەرحاڵ چوومە سەر جێگە چۆڵەکە، وتیان ئەمە جێگەی دڵشاد مەسرەفەو ئێستا سەفەری کردووەو بەو زوانەیش ناگەڕێتەوە .

دڵشاد مەسرەف؛ یەکێک بوو لەبێژەرەکانی ڕادیۆ بەزمانی کوردی، ئیتر من لەو ژوورەدا جێگیر بووم. عوسمان سەعید لەسەری سەرەوەو، دوای ئەو جێگەکەی کاک جەلال و ئینجا ئەوەی دڵشاد کە بووبوو بەهی من. ئیتر بۆ ڕۆژی دوایی یەکە یەکە هاوڕێیەکانی ترم ناسی .

کاک عەبدولخالق مەعروف، دانەری بەردی بناغەی ڕادیۆو لەگەڵ کاک ئەمجەد عەبدولواحیدی ئەندازیاردا لەژوورێکی ناو ئەشکەوتەکەدا پێکەوە ئەژیان. کاک عەبدولخالق مەعروف گەنجێکی خوێن گەرمو چاو مەیلەو سەوز بوو، هەموو گیانی وزەو ورە بوو .

هەمیشە دەم بەپێکەنین بوو، کە قاقای لێئەدا لەدوورەوە گوێت لێ ئەبوو، دەست ڕەنگین بوو. خۆی ئیمام تابووری عەسکەری بووبوو. جگە لەوەیش میکانیکو کارەبایی بوو. شارەزایی هونەری شیعرو عەرووزی عەرەبی بوو. لەسەرەتای جیابوونەوەی نێوان (م. س) و بارزانیدا، ئەم لەگەڵ (م. س)دا بووبوو. چووبووە هەمەدانیش، دواتر گەڕابۆوە. ئەوە یەکەمجار بوو ببینمو بیناسم. دواتر بوو بەیەکێک لە هەرە هاوڕێ نزیکو خۆشەویستەکانم و تا شەهیدکردنیشی لەساڵی (١٩٨٤)دا لەهەولێر پەیوەندیمان هەر مابوو .

هەر لەو ڕۆژگارەدا و لەوێ، کاک (عوسمان عوزێری)م بینییەوەو لەوەوبەر لەسلەیمانی یەکترمان بینیبوو، بەڵام هاوڕێی نزیکی یەک نەبووین. لەئەشکەوتی سەردێمان باشتر ناسیم. لەڕادیۆ بەرنامەی "ئێمەو گوێگرەکان"ی پێشکەش ئەکردو ناوبەناویش وتاری ئەنووسی. کاک نوری ئاکرێ-یی لەوێ بوو، بێژەری بەشی کرمانجی و هەروەها بەشی عەرەبی بوو. مامۆستا "سەعید ناکام"یش ژوورەکەی بەتەنیشت ژوورەکەی ئێمەوە بوو، بەردەوام خەریکی نووسین بوو، ئەو کاتە سەرقاڵی نووسینی ڕۆمانی "ئاگری بن کا"بوو. سەرم لێ ئەداو بەینی لەگەڵمدا خۆش بوو. کاک "غالب"ی موهەندیس-یش خەڵکی سلێمانی و ئەوکاتە ئەو بەرنامەی بەزمانی ئینگلیزی پێشکەش ئەکرد، بەینمان لەگەڵ یەکدا خۆش نەبوو. پیاوێکی تاڵێی توورەو تۆسن بوو، زۆر گێژو وڕبوو. زۆربەی کات تەنیا

بوو، تێکەڵاوی لەگەڵ هەمووواندا کەم بوو. من هیچ بەرنامەیەکم نەبوو، بەڵام هەندێجار ئەگەر شیعرێ یان وتارێکم هەبووایە، بەدەنگی خۆم ئەمخوێندنەوە. ئەوکاتە نەریتەکە وابوو هەرکەسێ وتار یان هەرشتێکی بنووسیایە، ئەبوایە بچێ بۆلای سەیدا یوسفی و بۆی بخوێنێتەوە، ئەویش لەدواییدا ئەگەر پەسەندی بکردایە لەسەری ئەنووسی باش و ئیمزایەکی ئەکرد. دواتر ئەو کەسە ئەچوو بۆ ئەشکەوتەکە بۆلای کاک عەبدولخالق و کاک ئەمجەدو ئەوانیش لەسەر ڕیکۆردێکی گەورە تۆماریان ئەکردو سەر لەئێوارە بڵاوئەکرایەوە. بەرنامەی ڕاستەوخۆ نەبوو، هەموو شتێ پێشتر تۆمار ئەکرا. هەر لەو ماوەیەدا بوو، کاک جەلیل فەیلی لەبەغداوە هات‌و ئەویش لای ئێمە جێگیر بوو، بەرنامەیەکی هەبوو، بەزمانی عەرەبی شێوەی محەلی قسەی بۆ سەربازەکانی سوپای عێراق ئەکردو هانی ئەدان سوپا بەجێبهێڵن‌و بێنە ناو شۆڕشی کوردستانەوە .

کاک جەلیل خزمێکی نزیکی کاک حەبیب محەمەد کەریم بوو. ئەمە جگە لەچەندین کارگێڕی فەننی کە پێداویستی ئامێرەکانی ڕادیۆیان دابین ئەکرد .

گردەکەی ئەشکەوتی سەردێمان وشک‌و بێ ئاوبوو، لەبەرئەوە خێزانێکی خەڵکی باڵەکایەتی ژن‌و مێردێک کە دوو منداڵیان هەبوو، مووچەیەکیان ئەدرایەو ژنەکە ڕۆژە نارۆژێ نانی بۆ ئەکردین‌و خواردنی نیوەڕوانی بۆ دروستدەکردین و مێردەکەیشی لەکانییەکی خوارەوە بەتەنەکە ئاوی بۆ ئەکێشاین .

گردی سەردێمان، نیشتمانی مارو دووپشک بوو، ڕۆژ نەبوو مارێ نەکوژرێ و یان زوو زوو دوپشکێ بەیەکێکەوە نەدات، جارێکیان دووپشکێ دای بەپەنجەی کاک عەبدولخالق-ەوە، گوندییەکان یەکسەر مریشکێکیان هێناو پەنجەکەیان خستە ناو کۆمی مریشکەوەو لەپاشماوەیەک مریشکەکە مردار بۆوەو پەنجەی کاک عەبدولخالق-یش ئازارەکەی شکاو چاک بۆوە .

کە من چووم بۆ ئەوێ باسی "ڕاوە دووپشکیان ئەکرد" زۆرم لاسەیر بوو. عوسمان عوزێری وتی: "سبەینێ بەیەکەوە ئەو ڕاوە ئەکەین"، ڕاوەکە چیبوو؟! پەلکە گیایەکی تایبەت هەبوو، بۆنێکی تۆزێ تیژی لێوە ئەهات، کونە دووپشکیش، دوای تاقیکردنەوەی زۆر، ئەناسرایەوە، کونێکی خڕی لێوار شکاوبوو. پەلکە گیاکە ئەبرایە ناو کونەکەوە، دووپشکەکە ئەیگرت‌و تۆیش لەملاوە وردەوردە بەرەو دەرەوە ڕاتئەکێشاو ئەوسا پێت پیا ئەنا. جاری واهەبوو لەماوەیەکی کەمدا بەدەیان دووپشکمان ئەکوشت. لەترسی مارو دووپشک هەموو کون و کەلەبەرێکمان گرتبوو، دەرمانێکی زۆرمان کردبوو

بەقەراغو دەوران دەوری ژوورەکاندا لەناوەوەو لەدەرەوە. لەهەموویان زیاتر من لەگەڵ کاک عەبدولخالقو عوزێری-دا ڕێکبووم. هەموویشمان شەوانە سەردانی یەکترمان ئەکرد. زۆربەی وەختمان بەقسەی خۆشو گاڵتەوگەپ بەسەر ئەبرد.

کاک عوسمان سەعید پیاوێکی دڵتەڕبوو، لەدوایشدا هەر لەباڵەکایەتی ژنی دووەمی هێنا. دەنگوباسو چالاکی (پ. م)و شەڕەکان، ئەو ئەیخوێندەوە. هەفتەی جارێکیش بەرنامەیەکی دروستکردبوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لەهاوولاتیانەوە بۆمان ئەهات. کاک عەبدولخالق حەزی لەگاڵتەو قسەی خۆشو نوکتە بوو. بیرۆکەکە هی ئەو بوو. ئەو نامانەی ئەگەیشتنە لای ئێمە، بەتایبەتی لەشارو شارۆچکەکانی ژێر دەسەڵاتی میرییەوە، لەڕێگەی ڕێکخستنەکانی (پ.د.ک)ەوە ئەهاتن، هەموویشی لەشێوەی نوشتەدا پێچرابوونەوە .

خەتی خۆمان گۆڕی و نامەیەکمان بەناوی (خوشکە شیرین لەشەقلاوەوە) بۆ بەرنامەکەی کاک عوسمان نارد! نامەکەمان وەک ئەوانی تر پێچایەوەو تێکەڵی پۆستمان کرد. یەکەم نامە هەر ئەوەندەمان نووسیبوو کە "خوشکە شیرین بەردەوام گوێ لەو بەرنامەیە ئەگرێتو بەدەنگی زوڵاڵی بێژەر گەلێ سەرسامە". شەوانە کاک عوسمان لەژوورەوە خەریکی ڕێکخستنی بەرنامەکەی ئەبوو. چاودێریم ئەکرد، نامەکانی ئەکردەوەو تەماشای ئەکردن، لەبەرنامەی داهاتوودا یەکەم نامە نامەکەی خوشکە شیرینی خوێندەوە. ئیتر بەوجۆرە دوو هەفتەجارێ نامەیەکمان ئەنوسی. کارگەیشتە ئەوەی خوشکە شیرین بکەوێتە موغازەلەکردن. هەموو جارێکیش چەند دەقیقەیەکی بۆ خوشکە شیرین و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی تەرخان ئەکرد. ئەم زنجیرە نوکتەیە چەند مانگێکی خایاند، بەبێ ئەوەی کاک عوسمان هەست بەهیچ بکات. لەدووسێ نامەی کۆتاییدا، کار گەیشتە ئەوەی کە خوشکە شیرین ئاوات بەوڕۆژە بخوازێ کە لەشەقلاوە بەدیداری شیرینی کاک عوسمان شاد بێت .

هەر لەو نامانەی دواییدا، من بۆ خۆم پارچە شیعرێکم بەناوی خوشکە شیرینەوە نووسی و بەهەمانشێوە گەیشتە کاک عوسمان، ئەمە جگەلەوەی لەنامەکەدا شیرین ئەڵێت: "من لەڕێی ئەو دەنگە زوڵاڵەتەوە شەیدای خۆیشت بوومو نایشارمەوە کەشەو نییە خەوتان پێوە نەبینم، بەڵام سەد داخ ئەم ڕۆژە ڕەشە کۆتایی نایە، ئەگەرچی سەرکەوتن هەر بۆ خۆمانە ".

کاک عوسمان لەسەر دۆشەکەکەی خۆی چوارمشقی دائەنیشت و نامەکانی دەرئەهێناو ئەیخوێندنەوەو ئەیخستنەوە ژێر دۆشەکەکە، لەپڕێکدا، دیسانەوە دەریئەهێنایەوەو سەرلەنوێ پیایاندا ئەچۆوە. منیش هەمووجارێ بەوردی ئەمانەم بۆ شەهید عەبدولخالق ئەگێڕایەوەو ئەویش قاقاکانی خۆی لێئەدا. جارێکیان دوای شیعرەکە، هەمووومان دانیشتبووین کاک عوسمان ڕوویکردە من و وتی گوێت لەو شیعرە بوو کە خوشکە شیرین لەشەقلاوەوە ناردبووی؟

وتم بەڵێ. وتی: باشە توخوا ئیتر تۆ هەقە بەخۆت بڵێی شاعیر .!

وتم: نەوەڵلا!. دوا زنجیرەی ئەم گاڵتەو بەزمە بەم جۆرە بوو :

سەرەتای دەستپێکردنی گفتوگۆبوو لەنێوان شۆڕش و حکومەتی عەبدولڕەحمان عارف-دا، ڕۆژێ هالیکۆپتەرێک هات بۆ گەلالە، تانوێنەرانی شۆڕش بچن بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ، سەید سالح یوسفی سەرۆکی وەفدەکە بوو، بەر لەوەی بچن بۆ گەلالە هەمووومان لەگەڵیدا دانیشتبووین، هەریەکەو قسەیەکی کرد. دڵیشمان خۆشبوو، کاک عوسمان ڕوویکردە سەیدا سالحو وتی: "سەیدا بامنیش لەگەڵتا بێمو هەر ئەوەندە لەشەقلاوە دامبەزێنەو سوپاست ئەکەم".

سەیدا یوسفی زۆری بەلاوە سەیربوو، ئێمەش پێکەنین گرتبووینی. سەیدا وتی: کوڕە عوسمان! ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ شەقلاوەی چی؟ .!

کاک عوسمان وتی: وەڵلا سەیدا سەرێک لەماڵی خزمێکمان ئەدەم. لێرەدا شەهید عەبدولخالق وتی: "کاک عوسمان ئەو ماڵەی تۆ بۆی ئەچی ئێستە لەوێ نەماونو گەڕاونەتەوە بۆ هەولێر ."!

هەر لەو ساڵەدا، ڕۆژێ چووبووین بۆ گەلاڵە، لەپڕێکدا چاومان بە د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ کەوت، ڕێکەوتێکی خۆش بوو. دوای ئەو هەموو ساڵە چاوت بەدۆستو نزیکێکی خۆت بکەوێتەوە .

دکتۆر لەدەرەوەی وڵاتەوە هاتبووەوە، هەواڵی یەکە بەیەکەی برایانی دوور وڵاتی پێبوو. د.عیزەدین خاڵی شیریمە، جگە لەوەی هەر لەکۆنەوە لەگەڕەکی دەرگەزێنەوە، ئەو وەختەی من تەمەنم دە دوانزە ساڵان بوو، ئەوم لەبەردووکانەکەی حاجی سالح-دا ئەبینی، دوکانەکەیش هەر بەتەنیشت مزگەوتەکەی خۆیانەوەبوو، ئێستەیش بیرمە جارێکیان ڕۆژنامەی "ژین"ی پێبوو، پێی وتم: "ئەم وتارە لەسەر باوکت نوسراوە، ئەتوانی بیخوێنیتەوە؟."!

دوای ئەو بینینەی گەلاڵە دووسێ جارێ هات بۆ لامان بۆ ئەشکەوتەکەی سەردێمان، ماوەیەکیش لامان مایەوە، هەندێ وتاریشی بەزمانی عەرەبی نووسیو لەڕادیۆوە بڵاوبوونەوە. دوای دەرچوونی بەیاننامەی (٢٩)ی حوزەیران، وەختێ لەبەغدا یەکترمان بینییەوە، ئەوکاتە هەندێ شیعری تازەم بڵاوبووبوونەوە، یەکێکیان هەر بەناوی "ئەشکەوتەکەی سەردێمان"ەوە بوو، پێی وتم: "بەلای منەوە لەئێستەوە بووی بەشاعیر و شیعر ئەنووسی!". بۆ خۆیشم لەدڵدا هەروام ئەزانی .

یەکێکی تریش لەو ڕووناکبیرانەی لەدەرەوە گەڕابۆوەو بۆ ماوەیەک هاتە لامانو لەگەڵماندا ئەژیاو ئەینووسی، شەوکەت عەقراوی بوو.

کاک جەلیل فەیلی؛ هاوڕێمان، بەردەوام بوو لەسەر بەرنامەکەی خۆی، بەڵام هەموو جارێ کە دائەنیشتین و قسەمان ئەکردو ناوی مەلا مستەفا ئەهات. ئەو ئەیوت: مامۆستا! ئێمەیش پێمان ئەوت کاکە جەلیل مەڵێ مامۆستا: "چونکە مەلا مستەفا بەناوهێنانی وشەی مامۆستا تووڕە ئەبێو پێیناخۆشە ."

ئەویش ئەیوت ئینجا من لەکوێ مەلا مستەفا ئەبینم تا تووڕەبێ. ئێمەش ئەمانوت: ئەمە دنیایە بەشکوو بیبینیت. بەڵام ئەو تازە نەی ئەتوانی نەڵێت مامۆستاو ئیتر دەمی وا ڕاهاتبوو. بەهەفتەیەک دوای کەوتنە خوارەوەی هالیکۆپتەرەکەی عەبدولسەلام عارف لەخوارووی عێراق. دەمەو عەسرێکی درەنگ، لەپڕێکدا دەنگە دەنگێ پەیدابوو، وتیان لەوە ئەچێ جەنابی مەلا مستەفا بەرەو لای ئێمە بێت. وتمان چۆن؟! وتیان ئەوەتا لەنێو ئەو دارو بارانەوە (پ. م)ی جامانە سووری حیمایەی تایبەتی دەرکەوتن .

هەر وایشبوو، مەلا مستەفا خۆی بوو. کاک "ئەحمەد شاڵی"شی لەگەڵ بوو، کە بەڕێوەبەری ناحییەی گەلاڵە بوو. لەبیرمە ئێمە هەندێ کورسی نایلۆنمان هەبوو، خستمانە سەر شانمانو بەرەو لای مەلا مستەفا بەڕێکەوتین، بەڵام ئەو لە دوورەوە بەدەست ئیشارەتی ئەوەی بۆ کردین کە کورسی ناوێت. ئێمەیش لەجێگەی خۆمان چەقین و کورسییەکانمان دانایەوە. لەبیرمە سەیدا ساڵح یوسفی، بەشڵەژاوی، لەژوورەکەی خۆی هاتەدەرەوە، باش خۆی کۆنەکردبۆوە، پشتێنەکەی شلو جامانەکەی سەری چاک نەبەستبوو. هەموومان ڕوومانکردە ئەو ژێر دارەی، کە مەلا مستەفاو ئەحمەد شاڵی لێی وەستابوونو سەیدا یوسفی لەپێشمانەوە .

دوای گەیشتن، ئەوسا یوسفی یەکەیەکە هەموومانی بە مەلا مستەفا ناساند. دیارە لە کاک عوسمان سەعیدو کاک جەلال عەبدولڕەحمانو عەبدولخالق-ەوە دەستیپێکرد، من و کاک جەلیل لەدوای دواوە بووین، ئەو وەختەی ڕیز گەیشتە سەر من، سەیدا منی پێناساند کە کوڕی فایەق بێکەس-م. زۆری پێخۆشبوو .

وتی: "وەتەنی ڕاست فایەق بێکەس بوو". هەر لەوێدا بەشێک لەشیعری "ئەی وەتەن"ی خوێندەوە، دیاربوو لەبەری کردبوو. هەروەها وتی: "من حیکایەتێکیشم

لەگەڵ فایەق بێکەسدا هەیە، دوایی بۆتان ئەگێڕمەوە". دوای من نۆرە هاتە سەر کاک جەلیل فەیلی و وتی: "یاخوا بەخێربێی مامۆستا"، کەوای وت، مەلا مستەفا زۆر تووڕەبوو وتی: "یاخوا بەخێر نەیەم! من مامۆستا نیم، یاخوا بەخێر نەیەم و بەملی شکاو بێم".

ئیتر بەجۆرێک تووڕەبوو لەدڵی خۆماندا وتمان ئێستە ئەگەڕێتەوە. ئیتر بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگی و خامۆشییەک دروست بوو لەپڕێکدا جەلیل فەیلی سەری بردەوە پێشەوەو وتی: عەفومکە مامۆستا!

ئەوسا ئیتر هەڵوێستەکە وایلێهات کە ئەبوو هەر پێبکەنن. تەنانەت مەلا مستەفا خۆیشی زەردەخەنەیەک گرتیو سەرێکی باداو جەلیل فەیلی-یان دور خستەوەو ئەوسا هەر لەجێگەی خۆمان لەشێوەی ئەڵقەیەکدا ڕوو لە مەلا مستەفا کە قەڵەمبڕێکی بەدەستەوە بوو، پارچە دارێکی پێ دائەتاشی. زوو زوویش سیغارەکەی ئەپێچایەوە.

لەسەر هەڵبڕینێکدا کەچاوی بەچاوم کەوتەوە. وتی: "ئا، ئەو وەختە من دوورخرابوومەوە بۆ سلەیمانی و زۆربەی ئێواران ئەچووم بۆ ئەجزاخانەکەی ئەسکەندەرو لەوێ دائەنیشتم. ئێوارەیەکیان وەختێکم زانی یەکێک دەستی خستۆتە سەرشانم، کە ئاوڕم دایەوە، پیاوێکی گردەڵە، دەموچاوی کونج کونج بوو. وتی: تۆ مەلا مستەفا نیت؟!

وتم: بەڵێ. وتی: ئەی تۆمن ئەناسی؟!. وتم: نەخێر. وتی: من شاعیرم و ناوم فایەق بێکەسە ئەزانی بۆ هاتووم بۆلات. لەبەر ئەوەی تۆ دژی حکومەتی لەبەر ئەوە چاوی منی. گوێ مەدەرێ دنیا هەروانابێ لەدواییدا هەر خۆمان سەرئەکەوین. هەروەها وتی: بەڵام مەلا مستەفا تۆ قەرزاری!. منیش بەسەرسوڕمانەوە وتم: من قەرزاری چیم؟! وتی: چۆن ئەو کەسەی عەرەق بۆ من نەکڕێ قەرزارە!. وتم: باشە هەر لەوێدا شاگردی ئەجزاخانەکەم ناردوو چوو لەوبەرەوە ئارەقی بۆ فایەقە فەندی هێنا.

دیسانەوە وتییەوە: مەلا مستەفا تۆ لەم بەزمە نازانی ئەمە دەعوەتێکی نوقسانە!. عەرەق چۆن بەبێ مەزە ئەخورێتەوەو مەلا مستەفا لەگەڵ گێڕانەوەی ئەم قسانەدا پێئەکەنی و ئەیوت: بەڕاستی ئەوە پیاوێکی وەتەنی بوو".

لەم مەسەلەیە خۆش نابم،
بەسەد دیناران نەبێت!..

لەو ڕۆژانەدا فڕۆکەکان زۆر بەنزمی لەپشکنیندا بوون، پێیان ڕاگەیاندین، ئاگامان لەخۆمان بێ و ئاگر نەکەینەوە، نەبادا لەڕێی دووکەڵەوە شوێنەکەمان ئاشکرا بێت. بەیانییەک کاک "غالب"ی موهەندیس هەستابوو، بۆ بەرچایی خۆی ئاگرێکی کردبۆوە، فڕۆکەیش هەر لەگەڕاندا بوو. فڕۆکەکان لەجۆری هەنتەر بوون، دەوروخولیان بوو، ئەو ڕۆژە هیچ شتێ ڕوویندەدا، بەڵام ئێمە دوو هەفتە زیاتر بوو، بەیانیان شەبەقی هەڵئەساین و ژوورەکانی خۆمان بەجێئەهێشت و ئەچووینە ناو ئەشکەوتە قایمەکەوە، بۆ بەیانی دوایی بەر لەسەعات دە، ئەوەندەمان زانی سێ فڕۆکە لەوانە، نزمبوونەوەو کەوتنە دەستڕێژو ساروخ پێوەنانمان، سیان ئەڕۆیشتن و سیانی تر ئەهاتن و بەو جۆرە بۆردومانکردن ڕەوینەوەی بۆ نەبوو. ئێمەیش لە ئەشکەوتەکەدا بووین. شوێنمان باشبوو کاک "عەبدولخالق"یش لەگێڕانەوەی نوکتەی خۆی نەئەکەوت. چەند سات‌ێکی کەم هات و فڕۆکە نەبوو. منیش لەئەشکەوتەکە هاتمەدەرەوەو بەرەو خواربوومەوە، ئەو کاتەی لەناوەڕاستی ڕێگادابووم. هاتنی فڕۆکەو بۆردومانکردن دەستپێکردەوە. ئەوساتەوەختە یەکێک بووە لەساتەوەختە هەرە ترسناکەکانی ژیانم. خۆمدا بوو بەعەرداو دڵم بەخێرایی لێی ئەدا. هەرچۆنێک بوو قوتاربوومەو گەیشتمە نێو کەژەکەی ئەوبەر. لەناکاو، مامۆستا سەعید ناکام-م بینی، خوێن

بەناوچەوانیدا ئەهاتە خوار، تەڵزمێکی بچووک دابووی لەناوچەوانیو برینداری کردبوو. بەڵام برینەکە قوڵ نەبوو .

لەو ساڵەدا چەند جارێکی تر سەردانی ئەو گوندەمان کردبوو، شەش حەوت مانگ زیاتر بوو، عەلی عەبدوڵلاو نوری ئەحمەدی تەها و نوری شاوەیس، لەم گوندەدا ئەژیانو دەست بەسەرو لەژێر چاودێریدا بوون. ئەو ڕۆژە چووم بۆلای ئەوانو نزیک ئێوارە گەڕامەوە. وەختێ گەیشتمەوە سەردێمان، تەماشامکرد هەموو ژوورەکانمان هێشتا ئاگریان لێ هەڵئەسێ .

ناو ئەشکەوتەکەو ئامێرەکان نەبێ، ئیتر هەرچی لەدەرەوەی ئەوێ بوون سووتابوون. ناچار بووین بەشێوەیەکی کاتی بڵاوەی لێبکەینو هەریەکەی بڕوات جێگەیەک بۆ خۆی بدۆزێتەوە. هەندێکمان مۆڵەتمان وەرگرتو هەندێکی تریشمان چوونە بارەگاکانی تر .

من داوای مۆڵەتم کرد، بۆ ئەوەی بچم بۆ ناوچەی (ماوەت)و لای فەرەیدون عەلی ئەمین–ی ئامۆزازام بم، تائەو وەختەی لەشوێنێکی تر ڕادیۆ ئەکەوێتەوە گەڕ .

بیرمە سەیدا یوسفی لەسەر چیچکان و لەبەر ی ئاگری ژوورەکەمان ئەو نامەیەی بۆ نووسیم، کە لەدوای دووسێ ڕۆژ لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ ماوەت.

بەدرێژایی ئەو ساڵە، دووجار یان سێجار، "دڵشاد مەسرەف"م بینی. ئەهاتەوەو هەفتەیەک ئەمایەوەو دیسانەوە ئەڕۆیشت، هەرمانگ و دوومانگێ ئەچووە ناوچەیەکو لای بارەگایەک و بەوجۆرە من تابەیاننامەی (٢٩)ی حوزەیران و گەڕانەوەمان هەر لەجێگەکەی ئەودا بووم. ژیانی ئەشکەوتی سەردێمان، مەمرەومەژی بوو. دوو هەفتە جارێک ئەگەر گۆشتێکمان بخواردایە، بەردەوام برنجێکی سپی وشک و شلەی فاسۆلیایەکی روون بوو. ئێوارانیش هێلکەی کولاو، یان نانو ماستو چا، یان پەتاتە و ئیتر ئەمە بەردەوام دووبارە ئەبوونەوە .

پارەتی مانگانەی ئەوکاتەمان (٢٥٠) فلس بوو، هەندێکی تر ئەوپەڕی (٥٠٠) فلسیان وەربگرتایە. کە ئەم مووچەیەمان وەرئەگرت، یەکسەر ئەچووین بۆ گەلالەو ئەماندا بەتووتنو ئاغزە جگەرەو سابوونو نوقڵ و ئەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان. زۆر درەنگ درەنگ نامەو هەواڵی کەسوکارمان پێئەگەیشت،

حەمام نەبوو، ئاو گەرم ئەکراو لە تەشتداو لەناو ژوورەکاندا خۆمان ئەشت. جاری واهەبوو بەمانگی جارێ جلم نەئەگۆڕی. چونکە شتنی جلوبەرگ، گرانبوو. لەدواییدا پارەم ئەدا بەگوندییەکانو جلەکانیان بۆ ئەشتمو بۆیان ئەهێنامەوە .

ئەو ژنەی نانی بۆ ئەکردین، دووسێ جار ڕەدوو کەوتبوو، هەمووجارێ بەکۆمەڵ دەورمان ئەداو پرسیارمان لێئەکرد. بۆچی ڕەدووکەوتووە؟ بەلام ژنەکە زۆر ڕووی نەئەداینێ، چونکە سەیدا یوسفی هەرەشەی لێکردبوون کەتوخنی ئێمە نەکەون. جارێکیان لەیەکێ لەژوورەکانماندا، خەڵکی ئەو گوندانە هاتبوون بۆ ئەوەی ئێمە بکەوینە بەینەوەو سوڵح بکەین.

پیاوێک ژنەکەی ڕەدوو کەوتبوو، منیش دانیشتبووم گوێم ئەگرت. پیاوەکە تفەنگێکی برنەوی کۆنی پێبوو، زۆر تووڕە دیاربوو، لەوەختی قسەکردنیدا وتی:"وەڵلاهی من لەم مەسەلەیە خۆش نابم. بەسەد دیناران نەبێ!". لەمن وایە ئەڵێت تابەم تفەنگە ئەوەو ئەوە نەکەم..! وابزانم شەهید عەبدولخالق بوو، وتی: "کوڕە بابە ئەوە جێبەجێ ئەبێ و لەئێمەی وەرگرە."!

سەرەتا بوو گەیشتبوومە ئەشکەوتی سەردێمان، وەک وتم لەگەڵ عوزێری-دا بەینمان خۆشبوو، دوای ماوەیەک ئەمبینی زۆر ماتو غەمگینە، جارێکیان لەبەر ئەشکەوتەکەدا دانیشتبووین، وێنەی کوڕەکەی لەگیرفانی دەرهێنا، "ڕاپەڕ" لەو وێنەیەدا، هەر ساڵەوەخت ئەبوو، تەماشای وێنەکەی ئەکردو چاوی پڕببوو لەئاوو لەبەر خۆوە گۆرانی "مەرابیووس"ی ئەوت .

شەڕی ئەوبەری قەرەداغ، لەنێوانی باڵی مەکتەبی سیاسیی و هێزەکانی شۆڕشدا ڕوویدابوو. سیامەند و ملکۆ، کە هەردووکیان بارزانی بوون کوژرابوون. ئەم ڕووداوە مەلا مستەفای تەواو تووڕەکردبوو. بەپێی قسە چەرمەگاییەکانیش، واتە حاجی برایمو براکانی لەم شەڕانەدا بوونو ئەوان دەستیان لەکوشتنی مەلکۆ و سیامەندا هەبووە، حاجی برایم مامی عوزێری بوو. لەوکاتانەدا بوو، عوزێری هەستی بەمەترسییەک کردبوو، ڕۆژێ منیش ڕاوەستابووم. بە کاک "جەلال عەبدولڕەحمان"ی وت: "ئەیەوێ نامەیەک بۆ بارزانی بنووسێ و ئەوەی تێدا ڕوونکاتەوە کە ئەم لەگەڵ ئەو تاوانانەدا نەبووەو هەر لێرە ئەبێ و باحاجی برایم مامۆیشی بێ". بەلام ئەم هەر دڵسۆزی سەرکردایەتی بارزانییەو چی پێبڵێن ئەوە ئەکات .

بەڵێ من خۆم لەبەینیاندا ڕاوەستابووم، کە ئەم قسانەی بۆ کاک جەلال عەبدولڕەحمان ئەکردو تەنانەت داوای ئەوەی لە کاک جەلال کرد کە ئەو دەقی نامەکەی بۆ بنووسێ. پاش یەک دوو ڕۆژ نامەکە نووسراو کاک عوسمان عوزێری خۆی بەدەستی خۆی دای بەسەیدا ساڵح یوسفی بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە بارزانی. ئەو ڕۆژە من مۆڵەتم وەرگرت و بەرەو ماوەت ڕۆیشتم و خواحافیزیم لەهەموویانکرد، عوزێریش هەر لەوێ بوو. بەڵام دوای من بەچەند ڕۆژێ وەکوو گێڕایانەوە، بارزانییەکان هاتبوونو خۆیو کەلوپەلو تەنانەت چی کتێبو دەفتەرو نووسینیشی هەبووە بەیەکەوە بردبوویانو ئیتر هەر ئەو بردنە بوو، جارێکی دی کەس عوسمان عوزێری نەبینییەوە !.

کە مۆڵەتەکەم تەواو بوو گەڕامەوە، ستافی ڕادیۆو بارەگامان چووبووە حاجی هۆمەران. کە چووم لەوێ هەموویانم بینییەوە، تەنها عوزێری نەبێ، کاک عەبدولخالق بۆیگێڕامەوە کە سەیدا ساڵح یوسفی بەشەخسی و زۆر بەپەرۆشەوە چەند جارێ داوای لەبارزانی کردووە بۆ ئەوەی لەعوزێری خۆشبێت، بەڵام بارزانی دواجار بەیوسفی وتوە: "هەرچی تەکلیفێکی لێئەکات بیکات ئەوە نەبێت". دوای ئەم قسەیە هیچ ئومێدێ نەما بۆ ئەوەی چاومان بەعوزێری بکەوێتەوە !.

لەوەختی مۆڵەتەکەمداو لەدەوروبەری ماوەتو لەهاوینە هەوارێکی ئێجگار خۆشو فێنکو پڕ میوەجاتدا، کاک فەرەیدونو دوکتۆر فوئاد کەپرو ساباتی خۆیان چێکردبوو، ئەو هەموو میوەیە لەترێ-وە بۆ قۆخو قەیسی و هەنجیر لەچواردەورت بوون، ئێرە لەچاو گردەکەی ئەشکەوتی سەردێماندا، بەهەشتێ بوو بۆ خۆی. ژەم بوردەی خواردنی باشو میوە بووم. ئیتر ئەوەندە قەیسیو هەنجیرم خوارد. بۆ ڕۆژی دوایی تووشی سکچوونو ڕەوانییەک بووم تاهەفتەیەک پێیەکم لەناو کەپرو پێکەی ترم لەسەر پێشاوبوو. د. فوئادو کاک فەرەیدون-یش تەماشایان ئەکردمو پێئەکەنین.

لەحاجی هۆمەران مابنەوەو شوێنی تازەی ڕادیۆشیان دەستنیشان کردوو وردە وردە خەریکی گواستنەوە بووین. لەو ڕۆژانەدا شێخ لەتیفی شێخ مەحموود؛ لەحاجی هۆمەران لەگەڵ دەستەیەک (پ. م)ی خۆیدا لەدووسێ چادردا ئەژیان، سەردانم کرد. زۆری پێخۆشبوو، بەڵام لەو دانیشتنەدا وەک زوخاولەسکێک سکاڵای حاڵی خۆی ئەکرد کە چۆن پشتگوێخراوە. تەنانەت چەند تفەنگێکی باشیشیان پێ ڕەوا نەبینیوەو ماوەیەکی دوورودرێژیشە لێرەیەو چاوی بەبارزانی نەکەوتووە .

هەر لەو ڕۆژانەداو لەحاجی هۆمەران چاوم بە کاک سەلامی مەلا سابیری پێشمەرگەی جوامێر کەوتەوە. کاک سەلام کوڕی ڕاستەقینەی سلەیمانی بوو. لەوەوبەر یەکتریمان ئەناسی، پیاوێکی خڕپلەی قژ کورتو بەخۆ بوو، لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشەوە لەشانەکانی پێشمەرگەی ناوشارا کاری ئەکرد. یەکەم (پ. م) بوو، لەناو شارداو بەئاشکرا دەست لەپیاوانی ڕژێم و جاشی تازە پەیدابوو بوەشێنێ. ئەو ڕۆژانە بەردەوام بەیەکەوە، منو ئەو و دڵشاد مەسرەف، خەریکی پیاسەکردن و قسەی خۆش بووین.

ژیانی پێشمەرگایەتی سەردەمی ئەشکەوتی سەردێمان؛ ئەگەرچی لەهەندێ ڕووەوە سەختو دژواربوو، بژێویمان خراپ و هیچمان نەبوو، یەکەمجار بوو

لەجل گۆڕینێکدا، بە ڕێچکە ئەسپێ لەخۆمدا ببینم، یەکەمجاربوو لەدایکمو ماڵەوە ئاوا دووربکەومەوەو جارێکی تر ئومێدی بینینەوەیانم نەبێت..! بەڵام ئەزموونێکی گەورەبوو بۆ ژیانم، بۆ هوشیاربوونەوەی زیاترم. گەشتو گەڕانو وردبوونەوەم لەناوچەی باڵەکایەتیدا، بەهەشتی ڕەنگاوڕەنگی ئەو مەڵبەندە، پەیوەندیم لەگەڵ (پ. م)و خەڵکی هەژاری گوندەکاندا، بیستنی سەدان وشەو زاراوەی شێوە جیاجیاکانی زمانی کوردی، تێکڕایی ژیانێکی زۆر جیاواز لەژیانی شارو دانیشتنی ئەو دیو مێزی ناو چوار دیوار .

ئەمانە هەمووی گەنجینەو زەخیرەیەکی بەپیتو بەرەکەت بوون بۆ تاقیکردنەوەی ناو ژیانی ئەدەبیو دەوڵەمەندکردنی سامانی زمانی شیعرو ڕووناککردنەوەی ڕێگای داهاتووم.

یەکێک لەکێشە کۆمەڵایەتی و جەستەییەکانی مرۆڤی پێشمەرگە، لەو شاخو داخانەی کوردستاندا، کە کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر باری دەروونی هەیەو بەردەوام ئاڵۆزت ئەکاو هیچیشت بۆ ناکرێ، کێشەی بۆشایی سێکسییە، ئەم کێشەیە هیچکام لەو کەسانەی بیرەوەری خۆیان نووسیوەتەوەو ئەزموونی شاخو داخیان هەبووە، باسیان نەکردووە .

وەک هەموو تخوبە حەرامەکانی تر خۆیان لێنەداوە. ئێمە جاری وابووە بەدوومانگو سێ مانگ لەدووریشەوە مێینەمان نەدیوە، قسەمان لەگەڵدا نەکردوون، هیچ پردی پەیوەندییەک لەنێواندا نەبووە، ئەمە لەکاتێکداو لەهەرەتی لاویدا، ڕۆژنەبووە، جەستەی مێینە لەزەینو خەیاڵدا ئامادە نەبووبێت. جاری وابووە پارچە پەڕۆیەکی سوورمان لەدوورەوە لێبووە بە ژن..! بەڵام لەناو هەرەشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، پ. م بەزۆر خۆی سەرکوتی خۆی کردووە. ناوبەناوێ لەهەموو دەورانی شۆڕش و شاخدا، ئەگەر سووسەی پەیوەندییەکی سێکسی یان پەیوەندییەکی عاشقانە کرابێ، زۆر بەدڵ ڕەقییەوە لەلایەن سەرکردەکانی شۆڕشەوە ئەو مرۆڤانە تەفروتوونا کراون .

ڕەنگە لای هەر یەکێکمان چەندین چیرۆکی تراژیدی پەیوەندار بەم کێشەیەوە هەبێت، بەڵام بەبایەخو گرنگ وەرنەگیراون. هیچ لێکۆڵینەوەیەکی قوڵیان بۆ نەکراوەو تەسلیم بەچارەنووسی نادیارکراون. مرۆڤی پێشمەرگە چاری نەبوو، کە پەنابەرێتە بەردەستی خۆی، یان پەنا بەرێتە بەر ئەوەی لەگەڵ ئاژەڵەکاندا جووت بێت.! یەکێک لەخولیاو خۆزگەکانی (پ. م) لەهەموو دەورانێکی شۆڕشدا ئەوەبووە چۆن بگاتە (بۆ نمونە) ئێران و لەوێ تینوێتی سێکسی خۆی بشکێنێ .

بۆیه بەلای منەوه ئاڵۆزترین مرۆڤی کورد لەباری دەروونییەوە، هەمیشه ئەو (پ. م)انه بوون که بۆماوەیەکی دوورودرێژ، تەنیاو گۆشەگیرو دووربوون لەهەموو ئاوەدانییەکەوە.

لەدوای شەڕە گەورەکەی (هەندرێن)و ئەو شکستییەی تووشی سوپای عێراق بوو، که تائەوکاته جەزرەبەی لەوجۆرەی بەرنەکەوتبوو، وەک ئەوەی لەڕەگو ڕیشەوه بێته دەرەوەو توانای بەپێوه ڕاوەستانی نەمابێ، وابوو .

حکومەت ناچار بوو بەچۆکدا بێتو خۆی دەست پێشکەری بۆ وتووێژکردن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشدا بکات. لەحوزەیرانی (١٩٦٦)دا گفتوگۆی نێوان هەردوولا دەستپێکرد. ئەوەبوو، ڕێککەوتنامەیەک مۆرکرا، که دواتر بەبەیانی (٢٩)ی حوزەیران ناوبانگی دەرکرد. لەتەمووزی هەمانساڵدا، ڕێگایان پێداین، که ئەتوانین بگەڕێینەوە، منو دڵشاد مەسرەف هەر لەڕێگەی گەلی عەلی بەگەوه گەیشتینەوه هەولێرو ئەو لەوێ مایەوەو منیش ڕوومکردە بەغدا. فەرمانی گێڕانەوه بۆ سەر وەزیفه ئەبوو لەبەغداوه دەربچێت، ئەوسا ئەمکاره ئاسان نەبوو. لەبەغدا نزیکەی شەش مانگێ بێ ئیش و کار بووم! ژیانو گوزەرانیش لەپایتەختدا گرانبوو، حەزیشم نەکرد ببم بە ئەرک بەسەر هیچ ماڵێکەوە، لەبەرئەوه هەر لەسەر شەقامی ڕەشید هەرزانترین ئوتێلم دۆزییەوە، ئوتێلەکه ناوی فایەق بوو، کرێی شەوانه نووستنیش بە(٥٠) فلس بوو، بەڵام چۆن ئوتێلێ.؟

پەڕپووتو پیسوپۆخڵ. بەڕاستی ئوتێلی لانەوازان بوو، بیرمه هاوڕێیەکم پێی وتم: "ئامۆژگاریت ئەکەم وەختێ شەو نوستی پێڵاوەکانت بخەره ژێر سەرت بۆ ئەوەی نەیدزن."!

من؛ شەوانه درەنگ ئەگەڕامەوه ئوتێلەکه، هەر بۆ نووستنو هیچیتر. ئیتر بەڕۆژ زۆربەی کاتم لەچایخانەکان و بەخوێندنەوەوه بەسەر ئەبرد، بۆ نانخواردنیش لەهەرزانترین شوێن نانم ئەخوارد. هەر لەو ئوتێلەدا بەشی زۆری قەسیدەکانی "تریفەی هەڵبەست"م نووسیی .

هێشتا هەر لەبەغدا بووم کە ئیمتیازی ڕۆژنامەی "التاخی" بەزمانی عەرەبیو پاشکۆکەی "برایی" بەکوردی دەرچوو. بەشە کوردییەکەی هەفتانەبوو، هونەرمەندی ناسراو "ڕەفیق چالاک" سەرپەرشتی ئەکرد.

دیارە "التاخی" بۆ خۆیشی کە بەزمانی عەرەبی دەرئەچوو، سەیدا سالح یوسفی سەرپەرشتی بوو. یەکێک لەو ڕووناکبیرە عەرەبانەی کە لەو سەردەمەدا لەگەڵ (التاخی)دا کاری ئەکردو گەلێ جاریش هەر خۆی سەروتارەکانی ئەنووسی "رسمی العامل"بوو، پێموایە چاپخانەکەیش کە التاخی و هەروەها برایی لێدەرئەچوو، هەر هی ئەوبوو. بەشی کوردی هەر لەو چاپخانەیەدا یەکدوو ژووری درابوویە، دووسێ مێزو چەند کورسییەکمان هەبوو. بەرلەوەی (برایی) دەربچێ، کۆمەڵێ لەو نووسەرو ڕووناکبیرە کوردانەی بەغدا سەردانیانکردین، ڕەفیق چالاک بەدەم و دووەکەی خۆی باسی ئەوەی بۆ ئەکردن کە ئەم ئەیەوێ "برایی" چۆن دەرکات!

بیرمە یەکێک لێی پرسی بۆ "برایەتی" نەبێ بۆ چی برایی بێ؟. ئەویش لەوەڵامدا وتی کورد ئەڵێ: "برامان برایی و کیسەمان جیابێ!". هەر لەو ماوەیەشدا وەختێ سەرمدا لە(التاخی) بۆ یەکەمجار لەنزیکەوە "رشدی العامل"م، ناسی ئەوکاتە ئەویش لە التاخی-دا ئەینووسی.

خۆمان ئامادەکردو بڕیاردرا کە ئەبێ ئیتر (برایی) دەربچێ. ئەو شەوەی کە ئەبوو بۆ سبەینێ برایی دەربچێ، هەموومان لەچاپخانەکە بووین.. چالاک و د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ و حەمەی مەلاکەریم و ڕەمزی قەزاز و من .

ڕەفیق چالاک؛ بەسەرەوە ئەگەڕاو قسەی ئەکردو ئێمەیش خەریکبووین. بەکورتی ئەو شەوە نەنووستین، تارۆژ بۆوەو براییش دەرچوو. دەرچوونی هەفتەنامەیەک بەکوردی و لەو سەردەمە تاریکەدا تروسکاییەک بوو بۆ زمانی کوردیو بۆ دنیای ڕۆژنامەوانی .

لەژمارەکانی سەرەتادا، بەشی زۆری ئەو وتارانەی بڵاوئەبوونەوە، ڕەفیق چالاک خۆی ئەینووسین. دیارە چ د. عیزەدین و چ حەمەی مەلا کەریمو ڕەمزی قەزازیش هەریەکەو لەئاستی خۆیەوە خەریکبوون. من هەردوو کتێبی "چۆنیەتی یەککرتنەوەی ئیتاڵیا"و "شەڕی چەتەگەری"م لەعەرەبییەوە وەرئەگێڕایە سەر زمانی کوردیو هەفتانە بەزنجیرە بڵاوئەبوونەوە. هەر شتێکیشم نەزانیایە لەچالاک-م ئەپرسی. هەروەها لە"برایی"دا لەشێوەی بیری ڕاگوزاریدا، هەندێ پەخشانو یەکدوو کورتە چیرۆکم بەناوی کاوەو پەیکانەوە بڵاوکردەوە. ئەمە جگە لەو شیعرانەی بەناوی خۆمەوە بڵاوئەبوونەوە، ئێستا ئەزانم کە وەرگێڕانەکانم باش نەبوونو تەنانەت نووسینو شیعرەکانیشم هێشتا بەتەواوی نەمەیی بوون .

من هەر لە سەرەتاوە زمانی کوردیم خراپ نەبووە. ئەوکاتە تەمەنم (٢٦-٢٧) ساڵ بوو، بەهۆی ئەزموونی شاخو خوێندنەوەوە، زمانی عەرەبیم باشتر بووبوو. لەمانە گرنگتر ئەوەبوو کارکردنم لەڕۆژنامەیەکداو لەنزیک "چالاک"ەوە خۆی بۆ خۆی تاقیکردنەوەیەکی تازەبوو. سوودێکی باشم لەزانیاری و ئەزموونی ئەو پیاوە وەرگرت. جێگیربوونیشم لەبەغداو ئەو مەڵبەندە ڕۆشنبیرییە گەورانە، تێکەلاوبوونم لەگەڵ ئەدیبە ناسراوەکانی عێراقدا، خوێندنەوەی بەردەوامی ئەو کتێبانەی لەزمانە زیندووەکانی دنیاوە تەرجەمەی عەرەبی ئەکران، مێژووی سەرهەڵدانی شیعری تازە لەدنیادا، قوتابخانەو ڕێبازە دیارەکانی، ژیننامەی کەڵە شاعیرانو نموونەی شیعرەکانیان، بینینی شانۆنامەکان، کۆڕو کۆبوونەوە، فیلمی باشی سینەماکان، ئەمانە هەموویان ئاسۆی گەشتریان لەبەردەمدا کردمەوە.

هەر لەوسەردەمەی بەغدادا ڕۆژێک سەیدا یوسفی لێی پرسیم: "تۆ گەڕاویتەوە سەر وەزیفە؟" وتم نەخێر. بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ خۆیدا بردمییە لای وەزیری

شارەوانییەکانی عێراقو لەبەغدا لەدایرەی ئاوو ئاوەڕۆی ئەوێ بەناونیشانی "کاتب" دامەزرامەوەو بەیانیان تانیوەڕوان لەوێ کارم ئەکردو دوای نیوەڕوانیش لەبرایی .
بەمجۆرە گوزەران و ژیانم باشتر بوونو هەموو سەری مانگێکیش یارمەتیم بۆ دایکم و بۆ خوشکەکانم ئەناردەوە. لەو ماوەیەدا ئوتێلەکەم گۆڕیبوو بۆ ئوتێلێکی باشتر. ڕەفیق چالاک لەو ڕۆژگارانەدا لەهەڕەتی پیاوەتی و جۆشو جوولەی خۆیدا بوو، ئەم پیاوە کۆمەڵێ بەهرەو تواناو زانیاری و ئەزموون بوو.. لەسەردەمی گۆڤاری "گەلاوێژ"دا یەکێک بوو لەنووسەرە دیارەکانی، بەزمانێکی کوردی بێ گرێوگۆڵ ئەینووسی. ئەکتەرێکی لێهاتوو دەرهێنەرێکی باشی سەردەمی خۆی بوو، لەڕێی ئەمەوە شانۆی تازەی کوردی کەوتە جوولەو دەرکەوت. هەر لەڕێی ئەمیشەوە هونەری تەمسیلی ڕادیۆیی گەشەی کردوو گوێگری خۆی دروستکرد. یەکەم کەسە هەوڵیدابێ جۆرێک لە ئۆپێرای کوردی بێنێتە سەر شانۆو نمایشتی بکات، ڕۆژنامەوانیش بوو. ئەم و چەند هونەرمەندێکی تر یەکەمین بەردی بناغەی دروستکردنی کۆمەڵی هونەرەجوانەکانیان لەشاری سلەیمانیدا دانا. بێژەری سەرنج ڕاکێشی ڕادیۆو سەر شانۆ بوو، دەنگی خۆش و ئەدایەکی چاکی پێوەبوو .
گۆرانییەکانی مۆرکێکی تایبەتی و غەمگینیان هەیەو لەکەسی تر ناچن. دەموپل پاراوو زیرەک و خۆیشی پیاوێکی چاوشینی قۆزو شیک بوو .
ڕەفیق چالاک، لەهەرزەکاریدا تێکەڵ بەبزووتنەوەی سیاسیی ئەبێو دواتر ئەبێتە ئەندامی لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقی. لە ساڵی (١٩٤٧-١٩٤٨)دا ئەگیرێو بەرگەی زیندان و ئازار ناگرێو دان بەنهێنییەکاندا ئەنێ و بۆ ماوەیەک بەداخەوە لەگەڵ حکومەتو تەحقیقاتی جنائی ئەوکاتەدا هاوکاری ئەبێو لەم ڕووەوە ئەکەوێو ئەدۆڕێ !..
ئەم کەوتنە کارێکی زۆر ئەکاتە سەر شەخسیەتی ئەم پیاوە هونەرمەندەو ناوی ئەزڕێ .
ڕەنگە گەورەترین هەڵەو خەوش لەژیانی چالاک-دا ئەوەبێت کە نەئەبوو نزیکی سیاسەت و حزبایەتی بکەوێتو خۆی لەگێژاوێک بدات کە لەبنەڕەتدا ئەم بۆ ئەوە دروست نەبووبوو. لەگەڵ ئەم "بەلام"انەشدا، لەگەڵ ئەم حەقیقەتە

تالانەیشدا، ناکرێ و ناشێ و هەرگیز لەبەر ئەو "کەوتنە" وەک هەندێ سیاسی دۆگما بیربکەینەوەو خەتی ڕاستو چەپ بەسەر ئەم کەڵە هونەرمەندەدا بێنین .

لەمێژووی سیاسیداو دەرهەق بەئەزموونێ لەحزبێکداو لەبارودۆخێکی ئاستەنگدا، ئەمە ڕاستە. بەڵام ئەم پیاوە، چەندین پیاوی تری لەخۆیدا هەڵگرتووەو پێویستە ڕێزیان لێبگرینو بەهاو نرخیان بزانین و ژیانیش هەرگیز بەتەنها ڕەشو سپی نەبووە.

من وەک شاگردێک و ئەو وەک مامۆستایەک، ئەو ڕۆژگارانەی بەغداو لەو کاتەدا گەلێ نزیکیی بووم، هەندێجاریش لەگەڵ خۆیدا ئەیبردمەوە بۆ ماڵی خۆیان لەکەڕادە. ئەو وەختەی ئەچووین سواری پاس ببین چالاک ئەیوت: "وەرە سواری ئەم پاسی نەفەراتانە بین، چونکە جگەرەی تیا ئەکێشرێ". من کەم کەسم دیوە، جگە لەخۆم، ئەوەندەی ئەو جگەرەکێش بووبێ .

بەدەیانو سەدان بەیتو باڵۆرەو حیکایەت و هەموو مەزامیری داودی لەبەربوو. عەرەبییەکی تەواوی ئەزانی. لەو ساڵانەی دوایی ژیانیدا بڕوای تەواوی بەسەربەخۆیی کوردستان بوو، حەزی ئەکرد لەحزبە قەومیەکان نزیک بکەوێتەوە .

ڕەفیق چالاک" لەو سەردەمەدا، لەدایرەی بەیتەرییەی بەغدا فەرمانبەر بوو، ئەو کاتەی لەبەغدا ئەچووم بۆ ماڵیان، منداڵەکانی وردبوون. لەجەنگی دووەمی جیهانیشدا، لەڕادیۆی یافای هاوپەیمانان لە فەلەستین، لەگەڵ گۆرانی شاعیرو ڕەمزی قەزازدا کاری نووسەری و بێژەری کردووە .

بیرمە لەبەغدا لەناوەڕاستی مانگەوە لاتو پووت ئەبووینو بۆ قەرز پەنامان ئەبردەوە بەر سەیدا ساڵح، بەڵام لەبەر ئەوەی دووسێجار لەمانگێکدا ئەم قەرزکردنە دووبارە ئەبۆوەو ئەیزانی بەئاسانی وەرناگیرێ. ئیتر وەک ئەکتەرێک قسەی لەگەڵ سەیدادا ئەکردو بۆ ئەوەی قەرزەکە بداو قەناعەتیشی پێبکات .

بۆ نموونە ئەچووە لایەوەو پێی ئەوت: "سەیدا ساڵح تۆ ئاگات لەوەیە ئەو سەروتارەی دوێنێ لە "التاخی"دا نوسیبووت چ دەنگێکی داوەتەوە. ئەچمە هەر شوێنێ باس باسی ئەو وتارەیە. تەحلیل ئەوەیە ."

سەیدا یوسفی-ش عەینەکەکەی ئەهێنایە سەر لووتی و تەماشای ئەکرد، ئینجا دوای ئەوە ئەیوت: "ئەم گرانییە چییە؟! ماڵ و منداڵ چۆن بەم مووچە کەمانە بژین". پاش تۆزێکی تر بەدەنگێکی نزم ئەیوت: "ئەوە منو شێرکۆش هەر

مەپرسە، ئەسپێ سەوزەڵەخانم ئەڵێ لەباخەڵماندا، بەشكوو پارچە كاغەزێ بنێرێ بۆ موحاسبی موحتەرەم.!

ماوەیەكیش شەوانە دوای كاركردن، سەیدا یوسفی بەئوتومبێلەكەی خۆی، هەردووكمانی ئەگەیاندەوە. من لە شەقامی ڕەشید لە "رأس القریە" دائەبەزیم و دوایی ئەویشی تانزیك ماڵی خۆیان ئەبرد.

شەوێكیان سەیدا وتی: "كاك ڕەفیق هێلكەی مەكینە هەنە؟". هێلكەی مەسلەحە تازە كەوتبووە بازاڕەوە، چالاك دایرەكەی سەر بەوەزارەتی كشتوكاڵ بوو، لای ئەوان و بۆ ئەوان بەئاسانی پەیدا ئەكرا. چالاك وتی: "بەڵێ سەیدا سبەی ئێوارە لەخزمەتتایە.!"

هەروایش بوو، سبەی ئێوارە تەبەقێ هێلكەی بۆ هێنا، شەوێك و دوو شەو هەفتەیەك ڕۆیشتو سەیدا باسی هێلكەكانی هەر نەكرد، چالاك چرپاندی بەگوێمدا "خەریكە دڵم شەق بەرێ! باسی ناكاتو سوپاسێكیشی لەدەم نەهاتە دەرەوە". ئیتر خۆی پێڕانەگیراو وتی: "سەیدا گیان هێلكەكە چۆن بوو؟" سەیدا لەسەر خۆ وتی: "ها.. باش بوو كاك ڕەفیق، بەڵام زەرد نەبوو!". چالاك كێشای بەسەری خۆیداو بەدەنگێكی نزم، ڕوو لەمن، وتی: "بۆ نەگبەتی من ئەمە یەكەمجارە ببیسم هێلكە زەردێنەی نییە!" لەڕاستیدا مەبەستی لەوە بوو زەردێنەكانی ئەم جۆرە هێلكانە، وەك زەردێنەی هێلكەی خۆماڵی نینو زۆر كاڵن!. بەڵام ئیتر چالاك وایلێكرد.!

سەروتاری برایی و هەڵبژاردنی مانشێتەكانو هەواڵەكان، هەر هەمووی خۆی ئەینووسینو هەڵیئەبژاردنو ڕێكی ئەخستن، هەندێ لەو وتارانەی ئەهاتن، ئەگەر زۆر بەدڵی نەبوایە، وردە دەسكارییەكی ئەكردنو ئەیوت "واباشترە!". هەندێ وتاری تریشی ئەدا بەمن تا سەرلەنوێ بینووسمەوە. ئەگەر جارێك ئیشمان زۆربوایەو درێژەی بكێشایەو بێتاقەت بوینایە، ڕووی تێئەكردمو ئەیوت: "دوایی قۆزی دێت، قۆزی عەنابی.!"

ماوەیەك نووسینگەی برایی چووە ئەپارتمانێكەوە لەكۆتایی شەقامی ڕەشید. شوقەیەكی بچووك بوو، جگە لەئیشی برایی، شوێنەكەی من وابوو، دەوری

پرسگەیشم ئەبینی. ژنێکی مەسیحی خەڵکی سلەیمانی هەبوو لەبەغدا دائەنیشت، زوو زوو سەری چالاکی ئەداو لای دائەنیشت. منیش گەنجو تینوو، چ لەهاتنو چ لەڕۆیشتنیا چاوم لێ نەئەتروکانو هەندێ جاریش مەرحەبای گەرمم ئەکرد. چالاک هەستی بەمەکردو ڕۆژێک پێی وتم: "ئەم ملەقوتێیە چییە؟! دە ڕاوەستە ئارامت بێ، باکاکی خۆت بگاتە بەندەرەکە، ئینجا تۆیش بکەوەرە ئاوەکەوە ."!

ئەگەر وەختی هەبوایە، بەوردی باسی سلەیمانی کۆنی ئەکرد، بنو بنەچەی خێزان بەخێزانی هەڵئەدا، شەوێکیان لەماڵی خۆیان کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی. کە گەیشتە ئەو جومگەیەی تیا زیندانی ئەکرێ و ئەخرێتە ژێر ئەشکەنجەوە وتی:"ئیتر ئەمە ئادەمیزادە. گۆشتو ئێسقانە. هەیە بەرگە ئەگرێ و هەیە نایگرێ. ئاخرشیشی سوورەوە کراوو گۆشتیان وتوە" ئیتر نەچووە ناو وردەکارییەکانی دواییەوە .

سەیدا ساڵح؛ کاتی خۆی چەند شیعرێکی نووسیبوو، یەکێک لەوانە "شەبا دیجلە" بووبوو. ناوبەناو بۆشایی ئەمایەوەو ئەبوایە پڕبکرێتەوە. لەچاپخانەکە ئەهاتەوەو پێمئەوت بۆشاییمان هەیە. یەکسەر ئەیوت: "شەبا دیجلە" دابەزێنە! هەر شەبا دیجلە فریامان ئەکەوێت!.. کە باسی ژیانی خۆیو سەردەمی رادیۆی یافای ئەکرد، گەش ئەبۆوەو ئەیوت: "کچە جوولەکەی ئەوێ فریشتە بوون فریشتە. ئەو ڕۆژگارانە ناگەڕێنەوە" دیاربوو لەو کاتانەدا چالاک کە لەهەڕەتی جوانیو قۆزیدا بووە، کچە جوولەکەی زۆری ناسیوە .!

ناسیاوی منو چالاک بۆ سەردەمێکی کۆنتر ئەگەڕایەوە. خزمایەتیشمان هەبوو، پور زازای دایکم بوو. بۆیەکەمجار کە چالاکم ناسی تەمەنم (١٦-١٧) ساڵ بوو، ئەو کاتەی کە شانۆنامەی "پیسکەی تەڕپیری" بۆیەکەمجار لەسلێمانی خستە سەر شانۆ. کە ئەو شانۆیە، شانۆنامەی "بەخیل"ی مولێر بوو، بەڵام چالاک بەجۆرێ کورداندبووی ئەگەر مۆلێرت زیندووبکردایەتەوە باوەڕناکەم بیناسیایەتەوە. پێموایە بەچەند شەوێ لەگەڵ نوری وەشتی-دا تەرجەمەیان کردبوو. من ئەوکاتە سەرم لەهێلکەی هونەریش نەجووقابوو، هەر ئەوەبوو

حەزم لەشیعرو هونەر ئەکرد، بەڵام چالاک لەو شانۆنامەیەدا، رۆڵی "سدیق بەگ"ی دا بەمن. نازانم بۆچی؟ !.

وامخوێندنەوە ئەمە ئاوڕدانەوەیە لەمنو لەوکاتەدا بووە مایەی ئەوەی بڕوام بەخۆم زیاتر بێ و کەسایەتی کۆمەڵایەتیم بەهێزتر بکات. کە رۆڵەکەی خۆیشم ئەبینی، دوای ئەوە ئەچوومە خوارەوەی شانۆکەو کاری "مولەقینیم" جێبەجێئەکرد، واتە ئەگەر ئەکتەرێ لەوەختی نمایشکردندا دیالۆگی رۆڵەکەی خۆی لەبیر بچوایەتەوە، من دەقەکەم لەبەردەستابوو، قسەکانی خۆیم بیر ئەخستەوە. ئەم شانۆنامەیە لەکاتی خۆیدا دەنگێکی زۆری دایەوە، بۆماوەیەکی دوورو درێژ نمایشکرا. پێموایە لەسەرەتای شەستەکاندا جارێکی تریش کاک ئەحمەد سالار و ئەوان نمایشیانکردەوە.

لەڕۆژگاری دووبەرەکییکەی نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و قیادەی بارزانیدا، من لەگەڵ خەتی بارزانیدا بووم. سەنگەری پێشمەرگە بۆ من پێوانە بوو، ئەوان لەکوێ بوونایە هەستو هۆشو شیعری منیش لەوێ بوو، ئێستەیش ئەگەر جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە، هەر ئەو هەڵوێستەم ئەبێت .

لەو کاتەدا خەڵکی کوردستان بەچاوی خۆیان دوو سەنگەریان ئەبینی، شاخو شار..! ئەوەی بەگژ دەوڵەتدا ئەچێ و ئەوەی لەشاردایەو لەژێر سایەی حکومەتداو خەباتی سیاسی ئەکات .

هەڵبەت ئەگەر ترازووی ئەم دوو هێزە بەوجۆرە نەبوایە، زۆرشت ئەگۆڕدرا، بەلام لەڕاستیدا ترازووی پێشمەرگەی شاخ لەناوخەڵکیدا بەڕێزترو خۆشەویستتر بوو. ئەمە لەکاتێکدا من ئەوسایش بڕوام وابوو کە خوێندەوارو ڕووناکبیرەکانی ناو (پ. د. ک) بەشی زۆریان کەوتوونەتە ناو جەماعەتی مەکتەبی سیاسییەوە. بەلام کێشەکە لەوە گەورەتربوو .

لە "برایی" دا شیعری "شارەکەم"م بلاوکردەوە، کە دژ بەوان بوو، زۆر توندیش بوو. بەلام لەو ڕۆژگارەدا شیعرەکە ئاوێنەی هەستو نەستی خەڵکەکە بوو. دوای ماوەیەک بەسەردان چوومەوە بۆ سلەیمانی، چالاک پێی وتم: "پەلەمەکە و مەچۆرەوە". بەلام من ڕۆیشتم، دوو ڕۆژ بوو لەسلێمانی بووم. ئێوارەیەک خۆم

گۆڕی و بەرەوخوار بوومەوەو هاتمە سەرشەقامی مەولەوی، گەیشتمە ئاستی محەلەکەی کەریمە فەندی ئابلاخ .

عەلی عەسکەری لەوێدا ڕاوەستابوو، ئاماژەی بۆ چەند چەکدارێکی خۆیانکرد، حەمەی سارۆو چەند کەسێکی تر، هاتنو گرتمیان. بەلام نەقسەیان کردو نەئازاریاندام. بارەگای سەرەکی نزیکی ئەوێ بوو. وابزانم خانووی چەرمەگاییەکان بوو، هەر بەپێ بردیانم بۆ ئەوێ. لەژوورێکدا دانیشتم و پاش سەعاتێ بردمیان بۆ لای کەمال ناوێک لەپشت مێزێکەوە دانیشتبوو، دیاربوو بۆ "تەحقیق"کردن بوو. کۆمەلە پرسیارێکی لێکردم لەکوێیت و چی ئەکەیتو بۆچی لێرەیتو..؟ لەمجۆرە پرسیارە ئاساییانە .

پاش چەند دەقیقەیەک بردمیانە دەرەوەو سواری تاکسیەکیان کردمو دووانیان هاتنە ئەملاو ئەولامەوەو بردیانم بۆ بەکرەجۆ. لەوکاتەدا "حیلمی عەلی شەریف" لەوێ بوو. ئەو منی نەدی و یەکسەر بردیانم بۆ بەنگەلەیەک، کەرێزە ژوورێکی تێدا دروستکرابوو، وەردیانەکە دەرگای ژوورێکی کردەوەو چوومە ناوەوە، تەماشامکرد کۆمەلێ گیراوی تریشی لێیە .

لەبەر چەرە دووکەلی جگەرە لەپێشدا کەسم نەبینی. یەکێکیان هاواری کرد "ئەوە تۆیشیان هێنا؟" دوای ئەوەی بەرچاوم ڕوونبووەوە، شەش حەوت کەسێکم بینی، یەکێک لەوانەی کە هاوارەکەی کرد، کاک "جەلال حسەین"بوو، ئەویش لەوێ گیرابوو. بەلام بۆچی نەمزانی. بۆ ئێوارە دۆشەک و بەتانی و جلیان بۆ هێنامە ژوورەوە. مالەوە ناردبوویان.

نزیکەی دەڕۆژێک مامەوە، لەو ماوەیەدا خالە عومەرم کە هاوڕێیەکی نزیکی "جەمال حەکیم"ە، چوو بۆلای و تێکەوت تا بەرمبدەن. هەروەها دایکیشم چووبوو بۆ بەغدا بۆلای برایم ئەحمەد .

تا سەرلەبەیانییەک بانگیانکردمو بەکەفالەتی "حەسەنی وەستا ئەمین" کە ئامۆزای دایکم بوو بەریاندام. دیارە گرتنەکە لەسەر کارکردنم لەبرایی و شیعری "شارەکەم"بوو .

ئەوان لەسەر هەق بوون منیانگرت یان نا؟! ئەوە کێشەی من نەبوو، بەلام ئەوەی پێویستە بیلێم: "من لەشیعرو هەلوێستی خۆم لەو ڕۆژگارەدا پەشیمان نیم. ئەو وەختەی لەبەغدایش دیوانی "تریفەی هەلبەست"م چاپکرد (١٩٦٨)،

هەمان شیعرم تیا دانابوو. بەڵام ڕەقیبی ئەوکاتە چەند ˝دێڕێکی زەقی کوژاندبۆوەو مێژووی نووسینەکەشی کردبوو بە (١٩٦٣) .

منیش وام بەچاک زانی هەر بەو جۆرە چاپبکرێ و دەستکاری نەکەم تادەرفەتێک هەڵئەکەوێ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دەست تێوەردانە."!

وەختێ گەڕامەوە بۆ بەغداو "چالاک"م بینیەوە. پێی وتم: "نەموت مەڕۆرەوە، ئاخر گلاراوتگرتبوو!. ئەم پەلەپەلەت لەچیبوو". بەهەرحاڵ ئیتر نەمئەتوانی وەک جاران بەناوی خۆمەوە بنووسمو خەمی کەفیلەکەم بوو، لەدەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان حکومەت و شۆڕشدا، ئەمجارەیان من نەچوومە دەرەوە .

ڕەفیق چالاک و کۆمەڵێکی تر چوونە دەرەوەو لەناوچەی چۆمانو دەربەندڕایات بوونو هەر لەو ماوەیەدا کە ڕادیۆی شۆڕش کەوتەوەکار، ئەمجارە گوێمان لەدەنگە زوڵاڵەکەی چالاک بوو، دوای بەیانی یانزەی ئازار من لەبەغدا نەمابوومو لەسلێمانی بووم. چالاک لەبەغدا بوو، ساڵی (١٩٧٢) یەکەمین میهرەجانی شیعری کوردی لەکەرکوک ڕێکخرا. ئەوکاتە سەیدا یوسفی سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد بوو، جەواهیریش لەوێ بوو. ئەو ئێوارە کۆڕەی کە منو عەبدوڵڵا پەشێو شیعرمان خوێندەوە، چالاکم بینی لەپشتی پشتەوە بەپێوە ڕاوەستابوو، دوای خوێندنەوە. پارچە کاغەزێکی ناردە سەرشانۆو بەڕێوەبەری کۆڕ کاغەزەکەی خوێندەوە. کە تیادا نووسرابوو: وەک خەڵاتی تایبەتی خۆی دوو قەڵەم پارکەری پێشکەش بەمنو پەشێو کردبوو .

دواتر کە لە دەرەوە دیمانو سوپاسمان کرد، وتی: "دەعوەتێکی مەسگوفە حەیاتەکەیشتان لەسەر دیجلە!". ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی و ڕێکەوت منو پەشێو لەبەغدا بووینو دۆزینییەوەو ئێوارەیەک هەرسێکمان چووین بۆ سەر دیجلە، بۆ ئەوەی وەک بەڵێنی دابوو دەعوەتی مەسگوفە حەیاتەکەمان بۆ بکات، هەروایش بوو. یەکە یەکە تەماشای حەوزی ماسییەکانی ئەکردو لەبەردەمی یەکێکیاندا وەستاو کەوتە سەوای ماسییەکی باش .

لەبیرمە ماسی فرۆشەکە لەو نرخەی دایابوو نەئەهاتە خوارەوە، تا چالاک پێی وت: "تۆ من ئەناسی؟!" دیارە ئەویش وتی: "نا"، چالاک پێی وتەوە "من خزمی نزیکی محەمەد عایشم". نەقابەی کرێکارانیش کە محەمەد عایش سەرۆکی بوو ڕێک بەرامبەر ماسی فرۆشەکەبوو، وەختێ کابرا ئەمەی بیست، یەکسەر وتی: "چەند ئەڵێی باشە."!

بەداخەوە لەساڵی (١٩٧٣)دا ئەوکاتەی چالاک بەهۆی نەخۆشی دڵەوە لەبەغداو لەخەستەخانە کەوتبوو، من لەوێ نەبووم، بەڵام زوو زوو هەواڵم ئەپرسی. پێموایە کاکە حەمەی مەلا کەریم بوو بۆی گێڕامەوە، سەردانی کردووەو، ئەویش وتویێتی: 'ئاخر خوای گەورە، تۆ زۆر ئەندامی لەشی مرۆڤت دوو دوو دروستکردووە. دوو گوێ، دوو دەست، دوو قاچ، دوو سی، دوو گورچیلەو دوو چاو، باشە چی ئەبوو ئەگەر دوو دڵیشت دروستبکردایە؟.'!

هەر لەهەمان ساڵدا، چالاک کۆچی دوایی کردوو تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ سلەیمانی و گەڕەکی سەرشەقامو لەوێوە برا بۆ گردی سەیوان و بەخاک سپێردرا.!

لەساڵی (١٩٦٧)دا، وەزیفەکەم گواستبۆوە بۆ 'وەزارەتی کاروباری ژوورو' بۆ یەکەمجار کاکە 'مەم بۆتانی' هاوڕێم لەوێ ناسی، هەروەها جەوهەر غەمگین. کە لەبەشی خۆیەتی وەزارەتدا کاری ئەکرد. گوزەرانی ژیانم باشتر بوو، بۆیە لەگەڵ 'شێرکۆ نامیق کاکەمین' برازای کامیل کاکە مین'، کە هەر لەبەغدا گەورەبووبوو، خزمایەتیشمان هەبوو، پێکەوە شوقەیەکمان لەسەر جادەی ڕەشید، نزیک ئەو شوێنەی کە دواتر بەساحەی خەیری ناوئەبرا بەحەوت دینارو نیو بەکرێ گرتبوو ..

شێرکۆ؛ کوڕێکی گورج و گۆڵ و چالاکو دەست ڕەنگین بوو. تەواو بەپێچەوانەی منەوە کە تەمەڵ و لەشبەدۆشاوبووم. زۆربەی کاری ناوماڵ هەر ئەو ئەیکرد. منیش ئیشە سووکەکان. ماوەیەکی باش لەم شووقەیەدا ماینەوە. هەردووکمان لەیەک تەمەندا بووین، گەنجو خوێن گەرم، ناوبەناو فریشتەی ئەسمەری عەرەبییش ڕوویانئەکردە شووقەکەمان. هەر لەو ساڵانەدا بوو (١٩٦٧-١٩٦٨) لەگەڵ حسێن عارف و جەلالی میرزاکەریم و کاکە مەم-دا ڕۆژانە یەکترمان ئەبینی.

'حسەینو جەلال'م لەساڵی (١٩٥٥-١٩٥٦)ەوە ئەناسی، ئەوکاتەی لەگۆشەکەی سەرەوەی چایخانەی بەهەشتی 'حەمە ڕەق'دا یەکترمان ئەبینی و لەسەیرانەکانی شەقڵاوەدا بەشداریمان ئەکرد .

جەلالی میرزا کەریم، لەبزووتنەوەی قوتابیانی ئەو سەردەمەدا بەرپرسی من بوو، ساڵی (١٩٥٦) بەهۆی تێکەڵاویم لەگەڵ کاک فەرەیدوون و جەوهەر و هەردی-دا، من هیچ مەیلێکی سیاسیم بەلای کۆمۆنیستەکاندا نەمابوو، ئەمە

جگەلەوەی دەرکەوتنی جەمال عەبدولناسرو خوتبەکانی کاریگەری تەواویان هەبوو، دیارە بەو بارەدا کەئێمەیش بۆ کورد بەو جۆرەبین، لەو تەمەنەدا ئەموت ئەوان باسی (عروبە) ئەکەن، پێویستە ئێمەیش باسی (کرودە) بکەین !.

بیرمە لەو سەردەمەدا، جەلالی میرزاکەریم ڕۆژێک هات بەشوێنماو لەمالی دایەخانم منی دۆزییەوە. هاتە دەرەوەو لەکۆلانەکەدا پێکەوە ڕاوەستاین‌و پێی وتم: "تۆ پالێوراوی بۆ ئەوەی بییتە ناو حزبەوە". بەلام بەتوندی وەلامم دایەوەو وتم: "هەرکاتێ سەربەخۆیی کوردستان بوو بەدروشمتان، ئینجا قسەم لەگەلدا بکە". بەهەرحال نائومێد بوو لەوەی بۆیهاتبوو، ڕۆیشت‌و جارێکیتر ئەو باسەی لانەکردمەوە.

یەکەم سەفەرم بۆ هەولێر لەسالی (١٩٥٨)دا بوو، یەکێتی قوتابییانی کوردستان دوای شۆڕشی تەمووز، وەفدێکی ڕێکخست و منیشی تێدا بووم. دوای ئەوەی گەیشتینە هەولێر یەکسەر ڕوومانکردە بارەگای یەکێتی قوتابیانی کوردستان لەوێ. ئەوەی ئێجگار بەلامانەوە سەیربوو، قوتابییەکانی ئەوێ لەناویەکدا بەتورکمانی قسەیان ئەکرد، ئێمە پەست‌و تووڕەبووین و داوامان لێکردن کەپێویستە بەکوردی قسە بکەن. بەڕاستی لەبلاوکردنەوەی گیانی کوردایەتی‌و بایەخدان بەزمانی کوردی "گیو موکریانی" دەوری مێژوویی لەوشارەدا بینیوە، چونکە لەوکاتەدا تاقە تابلۆیەک کەبەزمانی کوردی لەسەری نووسرابوو، تابلۆی سەر چاپخانەکەی ئەو بوو..! دیارە ئەمە جگە لەدەرکردنی گۆڤاری (هەتاو)یش کە بۆ ئەو ڕۆژگارانە بەڕاستی هەتاوبوو.

هەر لەسالی (١٩٦٧-١٩٦٨)دا بوو، سەفەرێکم کرد بۆ هەولێرو لەوێ بۆیەکەمجار عەبدوللا پەشێوی شاعیرم ناسی، بەیەکەوە چووینەوە بۆ مالی خۆیان، مالێکی بچووکی هەژارانەو لەگەڕەکێکی میللیدا. وابزانم لەگەل برا گەورەکەیی و خێزانەکەی ئەودا ئەژیا.

پەشێو؛ پێشتر لەدووبەرەکییەکەی (م. س) و قیادەی بارزانیدا کەوتبووە لای (م. س) و پێشتریش شیعری (بتی شکاو)ی دژی بارزانیٔ نووسیبوو. هەلبەت ئەو شیعرە لەچاو شیعرەکانی دواتریا گەلێ لاوازو ساکاربوو. پێموایە ئیتر ئەوەندەی نەخایاند وازیلێهێنان .

هەر لەو سەفەرەدا لەماڵی خۆیان، بیرمە نامەکانی کچە دڵدارەکەی خۆی نیشاندام، کە ئەویش هەر لەهەمان گەڕەکدابوو. هەر لەو سەفەرەیشدا لەڕێی پەشێوەوە "جەمیل ڕەنجبەر"م ناسی .

لەکۆتایی شەستەکاندا ئەو شاعیرانەی لەنەوەی ئێمە بوون‌و حەزیان بەنوێخوازی و تازەکردنەوە ئەکرد، لەسلەیمانی و لەهەولێریش بەپەنجەی دەست ئەژمێردران. لەبەغدا زوو زوو یەکترمان ئەبینی. لەمیهرەجانی یەکەمی شیعری کوردیدا لەکەرکوک، پەشێو شیعری (دوانزە وانەی بۆ منداڵان) خوێندەوە، کە یەکێک بوو لەشیعرە جوانەکای ئەو میهرەجانە. لەساڵی (١٩٧٢-١٩٧٣)دا لەبەغدا، سەیدا یوسفی ناردی بەشوێن هەردووکماندا، دوای ئەوەی دوو کورسی خوێندنیان لەیەکێتی سۆڤیەتی جاران وەرگرتبوو، ئەوانیش ئێمەیان بۆ ئەو خوێندنە پاڵاوتبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوەندە نەبوو ژنم هێنابوو، من نەمتوانی بڕیاری ڕۆیشتن بدەم. پەشێو ڕازی بوو، بەر لەدەستپێکردنەوەی شەڕ لەنێوان کوردو ڕژێمدا، پەشێو وڵاتی بەجێهێشتوو .

تائەوکاتە نێوانمان ئاسایی بوو، دوای ڕۆیشتنیشی ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوانماندا هەبوو، تەنانەت بیرمە جارێکیان هەندێ لەشیعرەکانی "پوشکین" کە شاعیری ناسراو (حسب الشيخ جعفر) لەڕووسییەوە کردبوونی بەعەرەبی‌و منیش بەکوردی ناردمن بۆ پەشێو، بۆ ئەوەی بزانم لەکارەکەمدا سەرکەوتووم یان نا. وەڵامی دامەوەو نووسیبووی "ئەگەر ڕوسیشت بزانیایە هەروا تەرجەمەت ئەکرد ."

دوای دابڕانێکی دوورو درێژ، لەساڵی (١٩٩٠)دا سەردانی مۆسکۆم کردو لەوێ بینیمەوەو چەند ڕۆژێ پێکەوەبووین، بەڵام ئەوە بۆ چواردە ساڵ ئەچێ هیچ پەیوەندیەکمان لەبەیندا نەماوە!..

بەغدای پایتەخت؛ چاوی ژیان و شیعری منی کردەوە .

چونکە جموجوڵی گەورەو بەرفراوان و لق و پۆپداری ئەوێ، لەهەموو ڕوویەکی ئەدەبیو ڕووناکبیرییەوە بەراورد نەئەکرا بەشارێکی بچووکی وەک سلەیمانی. هەر لەئەنجامی ئەو تێکەڵاوبوونەی نێوان حسەینو جەلالو کاکە مەمو من، گەلێ پرۆژەی تازەمان لادروست بوو، شەوانە باس هەرباسی تازەکردنەوەو نوێخوازی بوو .

چی بکەینو چی نەکەین، دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردو بیرکردنەوە لە "ڕوانگە" لەو وەختانەوە گەرای خۆیان لەناو مێشکو دەروونی ئێمەدا خستبوو .

لەساڵی (١٩٦٨)دا، بەدەست پێشخەری کاکە مەم بۆتانی و دکتۆر ئیحسان و حسەین عارف و چەند ئەدیبێکی تر، هەنگاو بۆ دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد نراو جموجووڵ و پەیوەندیکردن بەزۆربەی زۆری ئەدیبانی کوردەوە دەستپێیکرا. لەمکارەدا کاکە مەم ڕۆڵی مەکۆی ئەبینی. وابزانم پێشتریش هەوڵێکی تر لەلایەن خالید دلێرەوە درابوو، بەلام لەبەر ئەوەی وەک وتیان مۆرکێکی زەقی لایەنێکی پێوەبوو، دەستبەرداری بووبوونو بۆ ئەمانیان بەجێهێشتبوو. بەرنامەکە وابوو یەکەم کۆبوونەوە لەشووقەکەی مندا بکرێ، بەلام بڕیاری دامەزراندنی زانکۆی سلەیمانی و گواستنەوەی کارەکەم لەوەزارەتی کاروباری شیمالەوە بۆ زانکۆی سلەیمانی، دەرفەتی ئەوەی نەدامێ لەیەکەم کۆبوونەوەی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورددا بەشداری بکەم. پێموایە دواتر ئەم کۆبوونەوەی دامەزراندنە لەماڵی "جەمال بابان" دا کرابوو.

هەر لەساڵی (١٩٦٨)دا بوو لەبەغدا هاتوچۆی د.ئیحسان و د.کاوس-م ئەکردو لەو سەردەمەدا چاپکردنی دیوان کارێکی ئاسان نەبوو. ئەگەر هاوکاریت نەکرایە یان یەکێکی تر ئەرکی چاپکردنی لەئەستۆ نەگرتایە .

یەکەم دیوانم"تریفەی هەڵبەست" ئامادەبوو بۆ چاپ. لەڕەقابەیش ڕزگاری بووبوو. ئیتر هەر لەڕێگەی "د.کاوس"ەوە، کاک فەهمی قەفتان بەڵێنی دابوو ئەو ئەرکی چاپکردنەکەی لەئەستۆ بگرێ. بەمجۆرە یەکەم دیوانم لەبەغداو لەچاپخانەی "سلمان الاعظمی" بەتیراژی دوو هەزار دانە لەچاپدرا .

ئەوکاتە گەیشتبوومە ئەو قەناعەتەی کە بەشی زۆری ئەو شیعرانەی بەر لەچەند ساڵ بڵاومکردبوونەوە، کرچوکاڵ بوون، بۆیە کاتێ شیعرەکانم کۆکردەوە، سەرلەنوێ، کەوتمەوە بژارکردن و ئەو شیعرانەم لاداو ئەوانەم هێشتەوە کە لەو ڕۆژگارەدا بەشیعرم ئەزانین .

دیوانی تریفەی هەڵبەست، یەکەم هەنگاوبوو لەنێوان شەپۆلەکانی ڕۆمانسییەتێکی سادەو ڕیالیستێکی فۆتۆگرافیانەدا لەهاتوچۆدا بوو، کاریگەری زمانی گۆرانیان پێوە دیاربوو. تێکەڵ و پێکەڵییەک لەفەزای گشتی دیوانەکەدا هەبوو، بەڵام چەند شیعرێکی سەرنجڕاکێشی تێدا بوو وەکوو: "شەقامی کچان" و "شارەکەم" و "ئەشکەوتی سەردێمان"و "زەردەخەنە لەفرمێسکدا" و "دڵداری" و "منداڵی جاران"، تەنانەت هەندێ لەگەنجە کوردەکانی دانیشتووی بەغدای ئەوکاتە، لەبەر شیعری "شەقامی کچان" هاتن بۆلام و داوەتیشیان بۆ کردم .

یەکێک لەوانە کاک خەسرەو جاف بوو، هەروەها بیرمە کاک "لەتیف حامید"ی چیرۆکنووس و نوێخواز، شیعری "زەردەخەنە لەفرمێسک"دای زۆر پێ جوان و تازەبوو. بەکورتی دیوانێکی ساردو سڕو بێ ئاگر نەبوو بۆ (١٩٦٨)ی شیعری کوردی تروسکاییی جۆرێک لەتازەبوونەوەی تێدا بوو.!

لەسەردانەوەیەکی سلەیمانیدا، نامەیەکی هاوڕێم، فەتاح ئاغای حەمەئەمین ئاغام پێگەیشت. نامەکە هەر بۆ هەواڵ پرسین و بەسەرکردنەوە بوو. کۆمەڵێ دەنگو باسیشی تێدابوو. هاوڕێیەتی منو کاک فەتاح بۆ ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) ئەگەڕێتەوە، ئەوکاتەی ئەو مامۆستای سەرەتایی بوو لە قوتابخانەی سەرشەقام، ناسیاوی و دۆستایەتیشی لەگەڵ کاک فەرەیدون عەلی ئەمیندا هەبوو.

کاک فەتاح؛ لاوێکی کەڵەگەتی سپیکەلەی ڕووخۆش بوو، زۆر شیعر دۆست بوو، پێموایە لەهاوینی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا بوو، هەر لەگەڵ خۆی، چووین بۆ ناوچەی شارباژێڕو بناری سیوەیل، هەر لەو سەفەرەدا "حەمە ئەمین ئاغا"ی باوکی و "ئەورەحمان ئاغا"ی مامی و مامەکانی تریم ناسی، بەهەموو بناری سیوەیلدا گەڕام، میوانداریەکی ئێجگار گەرمیان کردم. نزیکەی پانزە بیست ڕۆژ مامەوە، هەر لەو سەفەرەدا بۆ یەکەمجار سواری ئەسپ بووم، هەر بۆ یەکەمجاریش لەژیانمدا تفەنگم تەقاند. بەر لەچوونە دەرەوەی یەکەم جاریش هەر لەساڵانی (١٩٦٤-١٩٦٥)دا جارێکی تر ڕێمکەوتەوە بناری سیوەیل، ئەمجارەیان بۆ جۆرێک لەخۆ حەشاردان بوو، چونکە ترسی گرتنم هەبوو، ئەوجارەیش لەگوندی زێ و

تورک و بارێی گەورەو بارێی بچووک مامەوە. لەگەڵ براکانی و ئامۆزاکانی و مامەکانیدا دۆستایەتی و ئاشنایەتیی تەواو هەبوو. بەتایبەتی کاک سوارەو کاک خدری برای .

دەرگای کراوەی ماڵی شەهید فەتاح و مامەکانی، جێی داڵدەی دەیان نیشتمانپەروەرو ئازادیخوازی لانەوازی ئەو سەردەمانە بوون. ئەم بنەماڵەیە هەر لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە لەگەڵ بزووتنەوەی کوردایەتیدا بوون، ڕۆژێ لەڕۆژان و لە هەموو قۆناغە سەخت و تاریکەکاندا تاقە یەکێکیان نەبوو بەپیاوی ڕژێم و چەکی خیانەت بکاتە شان .

ناوچەی سیوەیل بەدرێژایی شۆڕشی ئەیلول، لەناوچە هەرە بێگەردەکانی کوردستان بوو، هەمیشە لە سەنگەری گەلەکەی خۆیاندا بوون. کاک فەتاح یەکێک بوو لەو سەرکردانەی ناو شۆڕشی ئەیلول کە ڕێزی زۆری لەئەدیبان و ڕووناکبیران ئەگرت .

لەساڵی (١٩٧٤)یشدا، دوای ڕێکنەکەوتنی حکومەتو پاشگەزبوونەوەی لەبەندەکانی یانزەی ئازارو دەستپێکردنەوەی شەڕ، وەختێ لەگەڵ دەستەیەک لەئەدیبانی سلێمانیدا بڕیاری چوونە پاڵ شۆڕشماندا، ڕوومانکردە هەڵەبجە، لەوێ کە شەهید فەتاح ئێمەی بینی، پێیوتین کە ئەبێ لەگەڵیدا بچین بۆ تەوێڵە، هەرچەندە ئێمە وتمان ئەمە ئەرکەو پێویست ناکات و لە هەڵەبجە ئەمێنینەوە، بەلام ئەو سووربوو لەسەرئەوەی کە لەگەڵ خۆیدا بچین بۆ تەوێڵە. دوای ئەوەی گەیشتینە تەوێڵە، بردینییە ماڵی خۆیو براکانی. چەندین ڕۆژ خزمەتی کردین. تادواتر لەمەخفەرەکەی تەوێڵەدا جێی بۆ چاککردین و هەرچی پێداویستی ژیان هەبوو بۆی دابینکردین. لەناو فەرماندەکانی شۆڕشی ئەیلولدا، کەم کەسیان وەک شەهید فەتاح سادەو ساکارو لێزان و ڕووخۆش و بەوێل و ڕووناکبیر بوو. ئەو شەوانەی کە لەتەوێڵە و لەماڵی خۆیان پێکەوە دائەنیشتینو قسەی ئەکرد، ئەیزانی ئەڵێ چیو جگە لەوەیش زانیاری و خوێندەواری چ لەڕووی عەسکەری و سیاسیی و ئەدەبییەوە بەبڕشت بوو. دیاربوو چەند خۆی ماندووکردووە. خۆی ڕقی لەوشەی "ئاغا" ئەبۆوە، ڕۆژێ لەڕۆژانیش

بەشبەحاڵی خۆم هەڵسوکەوتی ئاغایانەم لێنەبینیبوو. لەشەڕو بەرەنگاربوونەوەی دوژمنیشدا کوڕێکی ئازاو لەخۆبوردوو بوو، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، گەلێ لەڕووناکبیران‌و کەسانی دی ڕوویان تێکرد بۆ ئەوەی موقاوەمەت بکاو بمێنێتەوە، منیش سەردانم کرد، بەڵام ئەو دواجار نەیتوانی لەفەرمانی بارزانی دەرچێ. منیش بۆخۆم، کورد واتەنی ئەو کانییەی ئاوم لێخواردبێتەوە، هەرگیز بەردی تێفڕێنادەم. وەک وەفایەکیش لەساڵی (١٩٩٢-١٩٩٣)دا پەخشانە شیعرێکم بەناوی "پڵنگەکەی ئەیلول"ەوە بۆ نووسیی‌و پێموایە لەکتێبێکدا، کە براکانی سەرپەرشتی چاپیان ئەکرد بڵاوبۆوە.

ئەو کاتەی زانکۆی سلەیمانی دامەزرا، کارمەندەکانی بەپەنجەی دەست ئەژمێردران. بۆ یەکەم ساڵی خوێندن، چەند فەرمانبەرێک یەکەم فایلی خوێندکارانیان وەرگرت، یەکێکیان من بووم. جێگەی ئێستەی زانکۆی سلەیمانی، تاقە بینایەکی تێدا دروستکرابوو، کە نیازبوو بۆ پەیمانگەیەک تەرخانبکرێ، زانکۆ چووە ئەو بینایەوەو ئیتر لەوێوە پەلی هاویشت .

لەتۆمارگەی گشتی زانکۆ کارم ئەکرد، بەڕێوەبەرێتییەک کە پەیوەندی بەوەرگرتنی خوێندکارەوە هەیە. ناونیشانی وەزیفەکەم "ملاحظ" بوو، ئیشێکی وام نەبوو. لەبەرئەوە زۆربەی کات لەژوورەکەی خۆمدا خەریکی خوێندنەوەو نووسینی خۆم بووم، ساڵانەیش چەند جارێک ئیفادی بەغدا ئەکرام بۆ کارکردن، چونکە وەرگرتنی خوێندکار لەهەموو زانکۆکاندا مەرکەزی بوو .

دووسێ ساڵێ بوو دایکمو کەسوکار سەریان کردبووە سەرم ژن بهێنم. من بۆ خۆم لەهەرزەکاری سەرەتای گەنجێتیدا، شەرمن بووم. لەبەغداش هیچ پەیوەندییەکی عاشقانەم نەبوو. زیاتر حەزم لەپەیوەندی کاتی بوو، ڕقم لەخۆبەستنەوە بوو بەیەکێکەوە. هەرچەند تەماشای خۆیشم ئەکرد، هی ئەوە نەبووم، بچمە ژێر باری ماڵو منداڵ بەخێوکردنەوە .

بۆیە خۆم لەژنهێنان ئەدزییەوە. لەوکاتەدا ئاواتەخواز بووم ڕێم بکەوێتە دەرەوەی وڵات، بەڵام نەلوا. گوشاری دایکم و کەسوکاریش تائەهات زیادی ئەکرد. ژنهێنان و شووکردن بەتایبەتی لەو سەردەمەی ئێمەدا خۆو بەخت بوو، تێکەڵاوبوون هەر نەبوو، ناسین لەنزیکەوە نەبوو. هەر نامەنووسینو پیاهەڵدانی عاتیفی هەبوو. تەمەنیشم گەیشتبووە (٢٨) ساڵ، کە ئومێدی ئەوەم برا بچمە دەرەوەی وڵات و و ئەوروپا، وردە وردە منیش پەتەکەم شلکرد، ناپلیۆنیش وتەنی: "قەڵاکەیە ئەوەی لەناوەوەیە ئەیەوێ بێتە دەرەوەو ئەوەی لەدەریشەوەیە ئەیەوێ بچێتە ناوەوە". داوای دوورە خزمێکم کردو سەری نەگرت .

کاک ئەحمەدی میرزا عارف" ئامۆزای باوکم بوو، پیاوێکی قۆشمەو لەهەمانکاتدا خوێندەوارو مۆدێرن و زیرەک بوو. لەکاتی خۆیشیدا وەک ئامۆزای باوکم بووە، هاوڕێشی بووە. ئێمە هەر لەخانوەکەی ئیسکاندا بووین، ئەوانیش تازە هاتبوونە خانوەکەی خۆیانەوە لەو بەرمانەوە، ئیتر کەوتینە هاتو چۆی یەکتر، ئەمەی ئەیڵێم بەر لەساڵی (١٩٦٨) بوو .

ماڵی کاک فەرەیدون عەلی ئەمینی ئامۆزایشمان هەر لە تەنیشت ئەوانەوە بوون، لەئەنجامی ئەم تازەکردنەوەی خزمایەتیو تێکەڵ بوونەوە. "نەسرین"ی کچیانم ناسیو حەزملێکرد. نەسرین؛ چوارەم منداڵی کاک ئەحمەدو ئامینە خان بوو، لەقوتابخانەی هونەر ئەیخوێند. کچێکی سپیکەڵەی ناوقەد بارێکی باڵا مام ناوەندی بوو، لەساڵی (١٩٦٨)دا کە دیوانی "تریفەی هەڵبەست"م دەرکرد، یەکەم شیعری ئەو دیوانە "دیاری ئەمجارە" بوو، کە پێشکەش بە "ن"م کردووە، کە مەبەست لە "نەسرین"ە .

بەتەمەن من دەساڵ لەو گەورەترم، لەکۆتایی (١٩٦٨)دا داوامکرد. بەڵام کاک ئەحمەد ڕازی نەبوو، چونکە ئەیوت پێویستە خوێندنەکەی تەواو بکات ئینجا شووبکات، ڕاستییەکیش لەم قسەیەدا هەیە. بەڵام ئەوسا من کێچ کەوتبووە کەوڵمەوەو گوێم لەو قسانە نەئەگرت. تەنها ئامۆژگارییەکیش کە هەرگیز گوێی لێنەگیرێ ژن نەهێنان یان شوونەکردنە !.

پێموایە تینویەتی سێکس لای گەنجی ئێمە، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی پەلەکردن لەژن هێناندا!. ڕێگە چارەیەکی تریش نییە، نە پەیوەندی و نەناسینو نەچوونە دەرەوە بەیەکەوەو لەدواییدا هەمووی ئەخەیتە ناو دەستی قەدەرێکەوە ئیتر گاڵ دێنێ یان پەموو! ئەوە کەس نایزانێ .

هەرچی قسەی پێش شووکردن‌و ژن هێنانیشە، بەشی هەرە زۆری پووچەو ڕاستی و ناڕاستی بەختیاری و نابەختیاری، گونجاندن‌و نەگونجاندن، تەنها وەختی دەردەکەوێت کە لەژێر بنمیچێکدا بن. واتە ئەوکاتەی ئەگەر "پەشیمان بوونەوە" ڕوودەدات. جا لە هەر تەرەفێکەوە بێت، وێران بوونی لەدوایە!. مامیشم چووە لای کاک ئەحمەدو ڕازی نەبوو، ناچاربووم پەنا بەرمە بەر هاوڕێیەکی کە ئەو ئێجگار خۆشی ئەویست، ئەویش مامۆستا برایم ئەحمەد بوو .

کاک ئەحمەد؛ زۆریش لەوە ئەترسا سیاسییەکان بەئاشکرا هاتوچۆی بکەن. چووم بۆ بەغداو مامۆستا برایم-م بینی و پێموت حاڵ لەمەو حیکایەت لەمە. لەوەڵامدا وتی ئاسانە و هەر لەوێدا نامەیەکی بۆ کاک ئەحمەد نوسی و تیایدا وتبوی ئەحمەد گیان کارەکە جێبەجێکە، ئەگەر نا ئەوا هەفتەیەکی تر خۆم‌و برادەرانی مەکتەبی سیاسی‌و پۆلێک پێشمەرگەدێین و هەر لەماڵی ئێوەیش میوان ئەبین، کاک برایم ئەیناسی .

هاتمەوەو هەر خۆیشم نامەکەم بۆبرد. لە هۆڵەکەی خۆیان پاڵکەوتبوو. بەبێ هیچ قسەیەک نامەکەم دایە دەستی، یەکەمجار خوێندییەوەو هیچی نەوت. خستییە ژێر قەراغی دۆشەکەکەوە، یەک دەقیقەی پێنەچوو دەریهێنایەوەو دیسانەوە خوێندییەوەو هەمدیسان خستیەوە ژێر دۆشەکەکە. بەکورتی سێجار ئەوەی کردو لەدواییدا هەر ئەوەندەی وت: "باشە مەیکەن بەقەڵەباڵغی."!

لە (١٩٦٩/١/١٦)دا نەسرین-م گواستەوەو چووین بۆ بەغدا. لەو ڕۆژەوە تائەمڕۆ کە (٣٦) ساڵ زیاترە هەر ژن‌و مێردی یەکترین‌و جیانەبووینەتەوە. ڕەنگە من وەک شاعیرێ هەندێ سەرە ڕۆیی و هەڵەم هەبووبێ، ڕەنگە ئەو تین‌و تاوەی کە هەموو پیاوێ لەسەرەتادا هەیەتی بۆ ژن ئەوەم تیا کزبووبێ یان لاوباڵی تر بووبم، یان چاو لەدەرتر بووبم بۆ ژن‌و فریشتە جوانەکان، دڵی شاعیرانەم لەناو دەستما بووبێ لەبەردەمیاندا، بۆ سیحری جوانییان نوشتابمەوەو شیعرم لەدەور گێڕابن، ڕەنگە هەندێ جاریش بووبم بەقوربانیی لەئاتەشکەدەی ئەواندا .

شاعیر بووم‌و تائێستەیش سووتاوی جوانی..! بەڵام ئەبێ دان بەوەدا بنێم دڵسۆزی نەسرین بۆ من گەورەتر بووە. بەتەنگەوە هاتنی ماڵ‌و پەروەردەکردنی منداڵ بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە ئێمەو مانان لەشاخ‌و داخ بووین، یان لەمەنفادا بووین، زیاتر بووە ..

نەسرین؛ لەرۆژگارە هەر دژوارەکاندا هەر لەگەڵ مندا بووە. نەک هەر ژنم بەڵکوو هاوڕێم بووەو وەک سەرئەنجامیش هەر من قەرزاری ئەوم. لەگەڵ ئەمانەیشدا ڕاستییەک هەیە، ئەویش ئەوەیە "نەسرین" لەناو دنیای مندا نەبووە..! ئاگای لەشیعرو شاعیریتی من نەبووە، تەنانەت تائێستەیش یەک شیعری منی بەتەوای لەبەر نییە! نازانێ چیمکردوەو چی ئەنووسم.

نەسرین ژنی ماڵەو بەس، دڵپاکە و ڕقوقینی لەلا نییە، پەیامێکی ئەدەبیو کۆمەڵایەتیو یان سیاسی نییە، ژنێکی سادەو ساکارە، بەڵام دڵسۆزی منو منداڵەکانو داهاتوومانە .

دڵی نەسرین؛ دڵی منداڵە، پڕە لە پاکژی و خۆشەویستیی. لەهەموو قۆناغە تاڵەکاندا لەگەڵما بووە، داوای تایبەتی نەبووە، ئەوەی گوێی نەداوەتێ زێڕو زیو بووە. هەروەکوو چۆن ئەوەی گوێی نەداوەتێ شیعر بووە!! بەڵام من ئەمەم نەکرد بەکۆسپو کێشە، تاڕیانی خۆم تێکبدەم. باوەڕناکەم نەسرین لەهەموو ژیانیدا دە کتێبی خوێندبێتەوە! لەگەڵ ئەمانەیشدا مەرج نییە بەختیاری لەو شوێنە بێ کەهاوشێوەی خۆتی لێیە .

ڕەنگە نەمتوانیایە لەگەڵ ژنێکی شاعیردا ساڵێکیش هەڵبکەم. من وەک مرۆڤ، پیاوێکی دڵپاکم، هەڵئەچمو تووڕە ئەبمو ڕەنگە هەندێجار بەرامبەرەکەیشم ئازاربدەم، بەڵام هەر زۆر زوو لەوە زووتر کەس چاوەڕوانی بکات، سارد ئەبمەوەو هیچ لەدڵما نامێنێ. جاری وابووە، منیان وێرانکردووە، تاسەر ئێسقان وردیانکردوم، سووکایەتیان پێکردووم و وتومە جارێکی تر مەحاڵە لەو کەسە نزیک ببمەوە. کەچی ڕۆژگار هاتووەو ڕۆیشتوەو بۆنەیەک هەڵکەوتووە، ئەو کەسەم دیوەتەوەو هیچم لەدڵدا نەماوە! من ترسنۆک بوومو ئازایش، هەڵەم کردووەو ڕاستیشم کردووە. شیعری جوانم نووسیوەو هەروەها ناشیرینیش .

نەسرین؛ ژنێکی ئارامو لەسەرخۆیە، هەڵچوونو تووڕەبوونی زیاد لەپێویستم لێ نەدیوە، من هەمبووەو ئەو ددانی بەخۆیدا گرتووە. لەماڵدا من هەمیشە تەمەڵ بوومو ئەو گورجوگۆڵ و ئازا. بەجگەرەکێشان ژیانی ئەوم قانداوەو ئەو بێدەنگ بووە. بەڵام من هەرگیز ڕەزیلیم لەگەڵ ئەودا نەکردووە، ئازادیم زەوت نەکردووە. دڵم لێی پیس نەبووە .

نەسرین؛ وەک زۆربەی زۆری ژنی کورد، مەسەلەیەکی نەبووە، دەنگی هەڵنەبڕیوە. ئەوەی بەلایدا نەچووە کارکردن بووە لەڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی

یان سیاسیدا، بۆیە بەلامەوە سەیر بوو، بەر لە سالی (٢٠٠٤) پێیوتم ئێستە لەگەڵ ڕێکخراوی ژناندا لەسوید کارئەکەم !.

منداڵەکانم زیاتر هۆگری دایکیانن وەک لەمن، ئەوان لەسەرهەقن. چونکە ئەوەندەی نەسرین لەگەڵیاندا بووەو خەمی خواردونو شەونخونی بەدیارەوە کێشاونو ئاگای لێیان بووە، من کەمتر. نەسرین لەگەڵ مندا سنگ فراوان بووە، منیش کەم جیگلدان، ئەو ئارامو هەناسە درێژ. من بەمەسرەفـو ئەو بێ مەسرەف. زۆرجار من لاوبالیو پەرتو مشورنەخۆر، ئەو جدیو لەسەرخۆو مشوورخۆر. من هەر نەمزانیوە ماڵ چییەو چی تیایەو چی ئەویو ئەو کەیبانووی ماڵو پاسەوانی ماڵو لاکەرەوە لەهەموو کێشەیەکی گەورەو بچووکی ماڵو منداڵ .

لەقۆناغە جیاجیاکانی تەمەندا، بەهۆی بارودۆخی سیاسی کوردستانەوە، جێمهێشتوونو بەساڵ لێیانەوە دوور بووم، بەڵام نەسرین، نەبۆڵە بۆڵی بووەو نەناڕەزایی و بەرگەی هەموو ئەو دەردەسەرییانەی گرتووە کە من بۆمبەجێهێشتوون. بەتایبەتی، لەو سەردەمەدا کە ڕژێمو دەزگا جاسووسییەکانی، کون بەکون بەشوێنیاندا ئەگەڕانو ئەوانیش ماڵ بەکوڵ و ڕۆژێ لێرەو دوو ڕۆژ لەهەولێرو هەفتەیەک لەبەغدا خۆیان ئەشاردەوەو دیسانەوە ئەهاتنەوە.

منداڵ نەیئەتوانی بچێتەوە قوتابخانەو هەموو خەمەکەیش هەر بۆ نەسرین بوو. بەهەشتی دایکیشم کە لەو ڕاونانو ئەم ماڵوئەو ماڵ کردنەدا لەگەڵیاندا بووە، هاودەمو پشتوپەنایەکی قایم بووە بۆ نەسرینو منداڵەکان .

هەر لەهەمانساڵدا (١٩٦٩)، دیوانی دووەمم "کەژاوەی گریان" لەچاپخانەی کامەرانی لەسلێمانی چاپکردو بڵاوبۆوە. یەکێتی بابەتو وێنەی شیعری لەم دیوانەدا کۆکترو گەشترن. سەرەتای هەوڵدانم بۆ نووسینی شیعری درێژ، لەم دیوانەوە دەست پێئەکات .

ڕەخنەگرتنی توند لەدابونەریتی کۆمەڵایەتی زمانێکی دیاری ناو ئەم دیوانەیە. لەڕووی فۆرمەوە ڕستەکان کورتترو پڕماناترن، بەڵام دیسانەوە دەربڕینی ڕاستەوخۆو ساکارییان هەر پێوە دیارە. هەر لەم ساڵەیشدا بوو کە مۆڵەتی کارکردنی "کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی" بەڕەسمی دەرچوو .

کۆمەڵ؛ ڕۆڵێکی باشی هەبوو لەگەشەپێدانی بزووتنەوەی هونەری و ئەدەبیو شانۆییدا، بووم بە ئەندام لەکۆمەڵداو لەدواییدا چوومە دەستەی بەڕێوەبەریشەوە .

کاک نووری وەشتی؛ سەرۆکی کۆمەڵ بوو، دیارترین چالاکی کۆمەڵ ئەو میهرەجانە گەورەیە بوو، کە لە یادی (١٩)ی حوزەیراندا بۆ پیرەمێردیان گێڕا. لە بەغدایشەوە کۆمەڵێ لەشاعیران و ڕووناکبیرانی دیاری عێراق بانگهێشت کرابوون، لەوانە جەواهیری و شاکر خەسباک و مەخزومی و زۆری تر بوون. میهرەجانەکە هەردوابەدوای بەیانی (١١)ی ئازارو لەهەمان ساڵدا ڕێکخرا.

بەرنامەکە لەهۆڵی سینەمای دڵشاد لەسەر شەقامی کاوە بەڕێوەچوو. لەم میهرەجانەدا منیش شیعرێکم تێدا خوێندەوە. لاموایە پەشێو-یش بەشداریکرد .

بەرپرسی لقی چواری (پ. د. ک) لەسلێمانی ئەوکاتە کاک فاخر مێرگەسووری بوو. ئەوە یەکەم جارو ئاخِر جار بوو بیناسمو قسەی لەگەڵدا بکەم. پیاوێکی ڕووخۆش لەسەر خۆبوو. دوای خوێندنەوەی شیعرەکەم، هات بۆ لامو بەگەرمی پیرۆزبایی لێکردم. هەر دوابەدوای میهرەجانەکەش سەیرانێکی گەورە بۆ پیرەمەگرون ڕێکخراو نوکتەیەکی خۆشیش لەوێ دروستبوو.

ئەو کاتەی د. عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ کە لە دەمێ ساڵەوە دۆستی نزیکی جەواهیری بوو، وەختێ ڕوومان ئەکردە سەرەوە بۆ شوێن سەکۆکان، لەوێدا، بەجەواهیری وت: وەرە بایەکێکت پێبناسێنم، ئەوسا وتی: "ئەمەیش کاک مەحمودە کوڕی زێوەری شاعیرا". جەواهیری لەوەڵامدا وتی: "لەدڵی خۆمدا وتم ڕەنگە کچێکی جوانم پێبناسێنێ! ئەمە بوو؟."!

کردنەوەی زانکۆی سلەیمانی و مۆڵەتی ئیشکردن بەیەکێتی نووسەرانی کوردو کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی و تیپی مۆسیقای سلەیمانی و نواندنی سلەیمانیو پێشتریش دەرچوونی گۆڤاری ڕزگاری لەو دەسکەوتانە بوون کە بەر لەڕێککەوتننامەی (١١)ی ئازار هاتنەدی و کۆمەڵی مەکتەبی سیاسی خۆیان لەپشت ئەم دەسکەوتانەوە ئەبینی.

شەستەکانی سەدەی ڕابوردوو، ئەدەبو ڕووناکبیری کوردی تووشی جۆرە شەختە بەندانێک بووبون. هۆی سەرەکیش بارودۆخە سیاسی وئەمنیەکەی کوردستان بوو. سەرکوتکردنی ئازادی گشتی و تاکی کۆمەڵ بوو، بەڵام لەهەمانکاتیشدا، سەردەمی سەرهەڵدانی شۆڕش و موقاوەمەتی (پ. م) بوو. دنیایش لە هەژینێکی گەورەدا بوو. ڕاپەڕینی خوێندکاران لە فەرەنسا، شۆڕشەکانی ئەمریکای لاتینی، دەرکەوتنی چەندین سومبولی شۆڕشگێڕی وەک گیڤارا لەدنیادا، شۆڕشی کوبا. یاخیبوونو مانگرتنی گەورەی کرێکاران لەدنیادا، بەکورتی شەپۆلەکانی چەپڕەویی و مارکسی جیهانیان گرتبۆوە، هەر لەچینەوە تائەوپەڕی دنیا. بیروباوەڕی مارکسی شۆڕشگێڕی لەو سەردەمەدا بەربڵاوبوو. بەهەردوو شێوازەکەی چینی و سۆڤیەتی کاریانکردبووە سەر ڕووناکبیرانو ئەدیبانی ناوچەکە و کوردیش لەگەڵیدا، بەڵام لەناو ئێمەدا عەقڵەکان عەقڵی دۆگماو چون مەیمون لاساییکەرەوە بوون. "دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە" لەخەیاڵی ئەواندا بوو .

هیچ کام لەو ڕێبازانە نەیانتوانی واقیعی ڕاستەقینەی کوردستان بخوێننەوە. "شیوعییەکانی کوردستان"ی سەر بەسۆڤیەت بەدرێژایی پەنجا ساڵ زیاتر، بریتی بوون لەکلکی سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت، سەریان لای خۆیان نەبوو، بەڵام لەو حزبانەیش بوون کە قوربانیان کەم نەبووە. پیاوی ڕووناکبیرو بیرمەندیان هەبووە .

بەکورتی لەم قۆناغەداو لەکوردستانیشدا بیروباوەڕی مارکسی لەبرەودا بوو. چا بەهەرناوێکەوە بووبێت. تەنانەت بەشێک لەپارتیش وەک خەتی چینی کەوتبوونە ئەم گێژاوە گەورەیەوە. کوردایەتی کردن و بەکوردستانیی بوون لای ئەوان مایەی گاڵتەجاڕی و بەخەونی زڕاوی وردە بۆرژواو کۆنەپەرستی لەقەڵەم ئەدرا!..

ئەو گۆڕان‌و وەرچەرخانە گەورانەی دنیایان ئەهەژاند، ئەدەبیشیان بەئاقاری نوێبوونەوەو تازەگەریدا ئەبرد. ئەم شەپۆلانە گەیشتبوونە میسرو وڵاتە عەرەبییەکانی وەکو سوریا و عێراقی عەرەبیشی گرتبۆوە. گۆڤاری "گەلەری ٦٨" لەقاهیرە دەرئەچوو، نوێخوازەکان تیایاندا ئەنووسی‌و ئەشگەیشتە بەغداو دەست ئێمەیش. لەعێراقیش (شعر ٦٩) لەلایەن فازل عەزاوی و دەستەیەک لە نوێخوازانەوە دەرچوو، کە یەکەم بەیانی شیعری خۆیانیان تێدا بڵاوکردەوە .

ئەمە جگە لەدەیان کتێب و لێکۆڵینەوەی وەرگێڕدراو لەزمانە زیندووەکانی دنیاوە بۆ سەر زمانی عەرەبی، کە هەموویان‌و تەوەری سەرەکییان باسکردن بوو لەشیعری تازەو تازەگەری بەگشتی، لەم سەردەمەدا بوو، کە لەلای ئێمەیش بیرۆکەی دەرکردنی یەکەمین بەیانی ئەدەبی سەریهەڵداو دواتر لە ساڵی (١٩٧٠)داو دوای ڕێککەوتننامەی ئازار بڵاوکرایەوە.

لەکۆتایی شەستەکاندا ئەوکاتەی لەبەغدا ئەژیام ،دوو ڕووداوی گەورە ڕوویاندا .

یەکەمیان؛ بەزین و ژێرکەوتنەکەی (٥)ی حوزەیرانی عەرەبەکان لەگەڵ ئیسرائیلدا. من ئەوکاتە لە دایرەی ئاوو ئاوەڕۆی بەغدا فەرمانبەر بووم‌و دووەمیان کودەتا ڕەشەکەی بەعسییەکان کە بۆ جاری دووەم دەسەڵاتیان گرتەوە دەست .

ئەو بەیانییەی (١٧)ی تەمووز من هاتمە دەرەوەو گەیشتمە (صالحیة)و دەوروبەری ئێزگەی بەغدا، بەعسیەکان بەجلی سویلەوەو چەک بەدەست ئەو ناوەیان گرتبوو، چاوەڕوانی فەرمان بوون. هەستمکرد گەیشتوومەتە شوێنێکی

مەترسیدار بۆیە لەوە زیاتر نەڕۆیشتمو بەڕێگەی خۆمدا گەڕامەوە بۆ شووقەکەمان .

شێرکۆی هاوڕێم زۆر شڵەژابوو وتی: "وا بۆجاری دووەم تووشی ئەم فاشییانە بووینەوە، خوا ئەزانێ ئیتر چیمان بەسەردێ؟!". هەر لەهەمان ئەو بینایەی ئێمەی تیا ئەژیاین، کاک جەمیل جەلالی گۆرانیبێژیشی تیا ئەژیا، لەکوڕە ڕووخۆش و باشەکان بوو، بەڵام ئەوەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، نوستنە دوورو درێژەکانی بوو. جارێکیان سێ شەوو سێ ڕۆژ لەسەر یەک نووست بەبێ ئەوەی بۆ چەند دەقیقەیەکیش خەبەری ببێتەوە!

ساڵی هەزارو نۆسەدو حەفتا هات و تەمەنم بوو بەسی ساڵ. ئەو کاتە لەسلێمانی بووم، بەڵام زوو زوو سەردانی بەغدام ئەکرد، ئەمە جگەلەوەی بەهۆی ئیشەکەمەوە لەمانگێکدا جارێکیش ئیفاد ئەکرام. لەساڵی تازەی خوێندنیشدا لەمانگ زیاتر ئەمامەوە. ئەوکاتانە شەوانەو بەردەوام حسەین و جەلال و کاکە مەم-م ئەبینی. جگە لە مەحمود زامدارو عەبدوڵلا عەباس کە پێشتر یەکترمان ناسیبوو .

زامدار؛ لاوێکی بەتواناو قسە خۆش، عەودالی شیعری جوان و داینەمۆی کۆڕو کۆبوونەوەکان بوو. هەنگاو بەهەنگاو ئاگای لەگەشەکردنی ئێمە بوو. ئەنوەر قادر هاتە سەر مێزی شەوانەو خواردنەوەی کەمتر بوو.. لەشاعیرانی بەتەمەن لەخوار ئێمەوە. سەلاح شوان و ئەنوەر قادرو سەلام محەمەد لەبەهرە جوان و ڕۆشنەکان بوون .

تۆزێ درەنگتر من ڕەفیق سابیرم ناسی، هەر لەو ماوەیەیشدا سامی شۆڕش-م ناسیی، ئەوانەیش، جگە لە سەلام محەمەد، هەموویان خوێندکاری بەشی کوردی بوون لەزانکۆی بەغدا.

دوای ڕێککەوتنامەی ئازاری (١٩٧٠) وەرچەرخانێکی سیاسی و فەرهەنگی گەورە بەسەر بارودۆخی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و هونەری کوردستاندا هات. وەک ئەوەی لەتاریکاییەکدا پەنجەرەیەکی پڕ لەهەتاو بکرێتەوە. ئەم وەرچەرخانە، تەوژم و تین و گوڕێکی تازەیدا بەڕۆژنامەگەری کوردی و دەیان کانیی بەهرەی تەقاندەوە. هونەری شێوەکاری و موزیک و گۆرانی و شانۆی کوردی نشونمایان کرد. بەکورتی وەک دەرگای زیندانێ لەسەر لێشاوی بەهرەی گیرخواردوو بکەیتەوە وابوو. ئەو بەخشین و ئەفراندن و داهێنانە ئەدەبی و

هونەریانەی لەماوەی ئەو چوار ساڵەدا بەلووزەو ڕژانە ژیانی فیکریو ئەدەبیمانەوە، لەوەوبەر وێنەی نەبینرابوو. ئەو ئازادییە نیسبییەی هاتە گۆڕێ، وزەیەکی نوێی کردەوە بەبەری جەستەی ساردوسڕی ئەدەبو هونەری ساڵەکانی ڕابوردوودا .

ڕۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەی ئەدەبی و هونەری و زانیاری چەندان پەنجەرەیان لەسەر کوردستان کردەوە. کۆڕی زانیاری کورد و چالاکییەکانی یەکێتی نووسەرانی کوردو هاتنەکایەی ڕوانگە لەئاسۆ گەشەکانی ئەو سەردەمە بوون. کۆمەڵی بنیاتنەری ڕوانگە و کەسە دیارەکان، بریتی بوون لە حسەین عارفو جەلالی میرزا کەریمو من .

دواتر جەمال شاربازێڕی و کەمال ڕەووف محەمەد-یش لەئیمزاکارانی بەیانەکەبوون، بەڵام زۆر زوو کەمال ڕەووف خۆی کشانەوە. ڕەشنووسی یەکەمی بەیانەکە من نووسیم، بەڵام بەر لەبلاوکردنەوەی حسەین و جەلال و کاکە مەم بینیان و لەچەند شوێنێکدا هەندێ دەستکاری کراو تەواو بوو. ئەو پێکهاتە لەیەک نەچووە لەژێر بنمیچی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاردا نەئەکرا کۆببنەوە. من تادوێنێ لەناو کاژیکدا[1] بوومو حسەین عارف لەقیادەی مەرکەزیداو کاکەمەم لەناو پارتی و باڵی مەکتەبی سیاسیەوەو جەلال پێشتر لەحزبی شیوعی و پێموایە دواتر لەپارتیدا، یەکمان گرتبۆوە.

هەریەکەمان ئەزموونێکی تاڵی سیاسی هەبوو، بۆیە ئەتوانین بڵێین "ئێمە کۆمەڵێکی یاخی بووین لەحزبەکانی خۆمانو ئەمانویست لەڕێی ئەدەبەوە هەناسەیەک بدەینو ژیان بەجۆرێکی جیاواز تەفسیر بکەین. ئێمە ئەمانویست تازەگەری ئامانجی گەورەمان بێو سنووره تەقلیدییەکان ببەزێنین، بەڵام بەگەرووی شیعرو چیرۆک و هونەر ئەم هاوارەبکەین. نەک حزبو ئایدیۆلۆژیا.

یاخیبوون لەهەموو کۆنە چەق بەستووەکان، لەهەموو دابو نەریتە ئازادی کوژەکان، جیا لەئایندا بێ یان لە حزبدا، بەناوی مارکسییەتەوە بێت یان قەومیەت. ئێمە ئیتر گومانمان هەبوو لەهەموو شتە موقەدەسەکان. چونکە هەریەکەمان بەئەزموونی خۆی درۆو تەڵەکەبازیەکانی بینیبوو. ئێمە ئەوکاتە پێمانوابوو پاک پیس بووەو پێویستە پەردەپۆش نەکرێن. پێویستە زمان گۆڕانی بەسەردا بێت. شیعر ئیتر لەو قاڵبانە بێتەدەرەوە کە ئیفلیجی کردووە. چیرۆک خوێنێکی تر بەجەستەیدا بگەڕێ. ئێمە لەناو نائومێدییەکانەوە هاتبووین بۆ ئەوەی هیواو جوانییەکان لەئەدەبدا بدۆزینەوە. پرسیاری تازە بێنینە گۆڕێ.

زمان بشلەقێنێ و وێنەی سەرسوورهێن دروست بکەین. ئایندە بێنینە ئەو وەختەی ئەوسامانەوە. ڕوانگە هیچ نەبوو لەوە بەولاوە کە ئەیوت: با هەست و نەست و عەقلمان نوێ بکەینەوەو کاژەکەی فرێدەین."

ئێمە ئەمانویست قسەیەکی سادەی تازەبکەین: "دابو نەریتو کولتوور بەگشتی نەکەین بەبەندیخانە! ئازادی بەبێ مرۆڤی ئازاد نییە، بەستەڵەکەو ئەبێ ئەم بەستەڵەکە لەشوێنێکەوە بشکێنین. ڕوانگە هیچ نەبوو لەوە بەولاوە کە یەک پرسیاری تازەی کرد: مادام مردوونین ئەبێ بگۆڕێین. ئەمەیش نابێ ئەگەر لەم ئەدەبەدا زمانێکی نوێ نەخولقێنین. ئێمە ئەوکاتە بڕوامان وابوو کە ئەدەبو هونەر بێ پەیام نابێ، پەیامی ئایدیۆلۆژی نا، پەیامی پڕ لەبەهای مرۆڤو مرۆڤایەتی. ئەوپەیامەی بەرگری لە جوانیی و ڕاستی ئەکاتو ناهێڵێ ژیان لە قاڵببدرێ. ڕوانگە لەڕوانینەوە هاتووەو بێ ڕوانینی جوانو پاکژیش تازەکردنەوە هیچ مانایەکی نابێت. ڕوانگە لەو سەرودەمەدا هیچی نەکردبێ ئەوەیکرد بۆ یەکەمجار دیالۆگێکی گەرم دروستبێ و جیاوازییەکان لەیەک لاپەڕەی ڕۆژنامەدا دەرکەون و یەکیش نەکوژن". ڕەنگە بەهەڵەدا نەچووبم ئەگەر بڵێم: "ڕوانگە سی و پێنج ساڵ لەمەوبەر یەکەمین بزووتنەوە بووە هەر لەناوخودی خۆیەوە بیروباوەڕە جیاوازەکان لەسەر شانۆیەک کۆبکاتەوە کە ئەویش شانۆی تازەگەری بوو ."

بەیان-ی ڕوانگە؛ ساکار بوو، بەڵام ساکارێ جورئەتی پرسیارکردنی هەبێت. ئێمە هیچمان نەکرد لەوە زیاتر وێرامان بەردێک بخەینە گۆمێکەوە. وێرامان لەسەر ئازادی ژن بەگژ ئەو مەلایانەدا بچینەوە کە مزگەوت و دەسەڵات و ڕابووردویان لەگەڵدا بوو. ئێمە هیچمان لەگەڵ نەبوو، ئایندەیەک نەبێت کە ئەویش لەپشت نادیارەوە بوو.

کاک سەربەست بامەڕنی؛ هاوڕێمان بوو، خۆیشی یەکێک بوو لەو لاوە ڕووناکبیرانەی بڕوای بەگۆڕانکاری و تازەگەری هەبوو، بەرپرسی ڕۆژنامەی هاوکاری بوو. ئەمە بۆ ئێمە پشت و پەنایەک بوو. بەڵێنی ئەوەی پێداین کە بەیانەکەی "ڕوانگە" لەهاوکاریدا بڵاوبکاتەوە، پێمانوت: "ئاخر لەوانەیە تووشی گێرمە و کێشەت بکات؟" وەڵامی دایەوە: "ئەوەی بەخەیاڵما نەیەت ئەو گێرمەو کێشەیەیە .!"

بەڵام لەتیف حامید ڕازی نەبوو، ئێمە دواتر تێگەیشتین کە لەو سەردەمەدا کاک لەتیف حامید گرێدراوی دەزگایەکی گرنگو نهێنی (پ. د. ک) بووەو ئەوان ڕێگەیان پێنەداوە کە لەگەڵ ئێمەدا ئیمزای لەبەیانی ڕوانگەدا هەبێت.!

بزووتنەوەی "ڕوانگە" بوو بەجێی مشتومڕو دەمەقاڵێی نێو کۆڕو کۆبوونەوەکان. بەرلەوەی یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کورد لەبەغدا ببەسترێ، ئێمە دەستەی دامەزرێنەری لقی سلێمانی بووین. وەک لەبیرم بێ یەکەمجار لەهەموو سلەیمانیدا تەنها بیست کەس بەئەندامێتی وەرگیران. برای چیرۆکنووس مستەفا ساڵح کەریم یەکێک بوو لە ئەندامە هەرە چالاکەکانی یەکێتیو تا (١١) ئازاری (١٩٧٤) ئەو دینەمۆی جولانەوەو بزووتنەوەی نووسەران بوو لەشاری سلەیماندا .

ئێمەیش لەو کاتەدا زۆربەی زۆری وەختی خۆمان بۆ چالاکی ئەدەبی و کۆڕ و کۆنگرەکانی یەکێتی و تەلەفزیۆن تەرخانکردبوو. بەدەیان کۆڕو سیمینارو ئاهەنگی ئەدەبی بۆ یادکردنەوەی شاعیران و ئەدیبانی کۆچکردوو ئەبەسترا. چەندین فێستیڤاڵمان لەشارەکانی کەرکوک و هەولێرو تەنانەت بەغداشدا گێڕا.

هەر لەدوای بەیانی ئازارو ئاشتبوونەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ قیادەی بارزانیدا، جارێکی تریش، لە دیلمان مەلا مستەفای بارزانیم بینیەوە. من سێجار لەنزیکەوەو بەقسە مەلا مستەفام بینیوە .

یەکەمجار لەساڵی (١٩٥٨)دا دوای شۆڕشی تەمووز، وەختێ سەردانی سلەیمانی کردوو، ئێمەی قوتابیانی کوردستانی ئەو سەردەمە بەخۆمان و دروشمەکانمانەوە لەبەردەرکی سەرا کۆبووبووینەوە. ئەویش لەسەر تارمەی بیناکەی "نوری عەلی" ڕاوەستابوو .

قوتابیە عێراقییەکان بەئاراستەی عێراقچێتیو ئێمەیش بەئاراستەی کوردستانییانە بەیەکدا ئەهاتین. ئەو ڕۆژگارانەی کە عێراقچییەکان سووکایەتییان بەکوردایەتی ئەکردو (مەعاریفی کوردستان) کە ئامانجێکی ئێمە بوو ئەیانکرد بە(مەعاریفی قلیاسان).! ئەوەبوو دواتر مەلا مستەفای بارزان هەندێ قسەی کردو لەپێشدا داوای کرد کە وێنەکانی خۆی دابگرینو چەندینجار دووبارەی کردەوە "کە ئەو جوندی عەبدولکەریم قاسم"ە. دوای خۆپیشاندانەکە بۆ ڕۆژی دوایی یەکێتی قوتابیانی کوردستان وەفدێکیان دروستکرد بۆ بەخێرهاتنو دیدەنی بارزانی کە لەماڵی شێخ لەتیفی حەفید لەکانێسکان

دابەزیبوو. لەو وەفدەدا منیشی تێدا بووم. بیرمە قادر دیلانی مۆسیقارو تیپی مەولەوی لەوێ بوون. ئەوە یەکەمجار بوو تەوقە لەگەڵ بارزانیدا بکەم، گوێم لێبێ. قسەکان ئاسایی بوون .

دووەمجار لەئەشکەوتی سەردێمان بوو، وەک بەدرێژی لەلاپەڕەکانی پێشوودا باسمکردبوو. سێهەم جاریان لەگوندی دیلمان بوو .

بیرمە نزیکەی سێ چوار شەو مامەوە، مەلایەکیش وەکوو من لە چاوەڕوانیدا بوو. ویستم قسەی لەگەڵدا نەکەمو بیخەمە پشتگوێ، بەهەرحاڵ من لە پێش مەلاکەدا بانگکرام. دنیا تاریک بووبوو، (پ. م)ێکی بارزانی هاتو بەلایتێکی دەستییەوە پێشمکەوتو منیش بەدوایدا. تاچووینە بەردەم هۆدەو هەیوانێکی گەورە، کەچوومە ژوورەوە، یەکەم کەس کەدیم کاک ئیدریس بارزانی بوو، لەبەردەرگاکەدا بەپێوە ڕاوەستابوو. مەلا مستەفایش لەبنەبانی ژوورەکەدا لەسەر کورسییەکی بەرز دانیشتبوو، زۆر بە پەرۆشەوە باوەشم پێداکرد. دوای دانیشتنو بەخێرهاتن پێیوتم: "ئیشم چییە؟!". وتم "لە زانکۆی سلەیمانی فەرمانبەرم". ئینجا دیوانەکەی "بێکەس"م پێشکەشکرد کە ئەوەندە نەبوو دەرچووبوو. واتە یەکەمین چاپی .

عەینەکەکەی کردە چاویو خەریکی خوێندنەوەی هەندێ لەشیعرەکانی بوو، لە دواییدا وتی: "شیعرەکان هەر ئەمەندەیە، هیچ لای ئەو... "لێرەدا دووسێ جنێوی دا" نەماوە؟! مەبەستی "برایم ئەحمەد" بوو! زۆرم بەلاوە سەیر بوو، چونکە ئەوەندە نەبوو پێکهاتبوونەوە. لەوەڵامدا وتم: "نەخێر هەر ئەوەندەیەو جگە لەوەیش برایم ئەحمەد بۆ خێزانی ئێمە زۆرباش بووەو ئەگەر ئەویش نەبوایە ڕەنگبوو ئەم شیعرانەیش بفەوتانایە". لەدواییدا لێی پرسیم: "ئەڵێی چی بەرامبەر بەم ڕێککەوتنە لەگەڵ حکومەتدا؟ ."!

من هەر ئەوەندەم وت: "دەسکەوتێکی باشە". بەڵام ئەو وتی: "خراپ نییە ئەگەر خۆمان لەناو خۆماندا تێکی نەدەین!". دوای ئەوە چەند دەقیقەیەکی تر دانیشتمو ئینجا خواحافیزیم لێکردوو چوومە دەرەو، بەدرێژایی ئەو دانیشتنە کاک ئیدریس وەک هەر پاسەوانێکی تر لەبەردەرگاکەدا ڕاوەستابوو.

جموجوولّی ئەدەبی و هونەری لە کوردستاندا، بزووتنەوەی چاپ و چاپەمەنی، بە بەراورد لەگەڵ سالانی شەستدا، هەر تەواو لەگەشەکردندا بوو. هونەری شێوەکاری و کردنەوەی پێشانگە و چالاکی تیپی مۆسیقا و پێشکەوتنی ڕەوتی شانۆ لەبەرچاوبوون .

لە سالّی (١٩٧١)دا شانۆنامەی شیعری "کاوەی ئاسنگەر"م بلاوبۆوە، بەلام دەقەکە خۆی لەسالّی (١٩٦٩- ١٩٧٠)دا نووسرا بوو. ئەوکاتە کاک جەلالی میرزا کەریمی هاوڕێمان لەوەزارەتی ڕاگەیاندن کاری ئەکرد، یارمەتی لەچاپدانی بۆ وەرگرتمو لەسلێمانی چاپکرا.

من؛ ئەو کاتە بەچاکی لە هونەری دراما نەگەیشتبووم! ئەبوو پەلە نەکەمو لەسەری بوەستم. گەلێ بۆشایی وەک دراما لەم شانۆگەریەدا هەیە، بەتایبەتی کە شیعر شوێن دراما ئەکەوێ، نەک بەپێچەوانەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، هەنگاوێک بوو بەباشی و خراپییەوە گەلێ وتاری لەسەر نوسرا، پێشەکییەکەی د. ئیحسان و ئەو زنجیرە وتارەی کاک کەمال میراودەلی لەهاوکاریدا بلاویکردنەوە، لەدیارترینی ئەو نووسینانەن کە لەسەر "کاوەی ئاسنگەر" نووسرابن. بەکورتی کاوەی ئاسنگەر: یەکەمین هەوڵدانی شانۆنامەی شیعرییە بەهەموو ئەو خەوشانەیشەوە کە هەیەتی .

یەکێک لەو میهرەجانە گەورانەی کە لەمارتی (۱۹۷۱)داو لە کەرکوک ڕێکخرا 'میهرەجانی یەکەمی شیعری کوردی' بوو، بەستنی ئەم میهرەجانە لەناو شاری کەرکوکدا، بەردێکی گەورەو قورس بوو لەسەر دڵی داگیرکەران و خۆپیشاندانێکی مەزنی نووسەرانی کوردیش بوو، بۆ جەختکردنەوە لەسەر کوردستانیبوونی شاری کەرکوک .

میهرەجانەکە چەند ڕۆژێکی خایاند، قەسیدەی، 'من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ'م تێدا خوێندەوە. کە دواتر بوو بەناونیشانی دیوانی سێهەمم. پێویست بەوە ناکات من خۆم باسی ئەوە بکەم، ئەم شیعرە لەو میهرەجانەدا چ دەنگدانەوەیەکی هەبوو، ئەوە بۆ کەسانی تر بەجێبێڵم باشترە .

پەشێوی شاعیریش، شیعری 'دوانزە وانەکەی بۆ منداڵان' خوێندەوە، کە بەڕاستی وەک شیعر، وەک ئیلقایش، لە نەختینەکانی ئەو میهرەجانە بوون، لەڕۆژانی ئەم میهرەجانەدا بوو، کە بۆ یەکەمینجار هێمن موکریانی شاعیرم ناسی. نوکتە خۆشەکەی 'هێمن'یش کە هەر لە یەکەم ڕۆژی میهرەجانەکەدا کردیو دەماودەم بڵاوبۆوە، خۆم لەوێدا ڕاوەستابووم: 'نووسەرانو شاعیرانی هەولێر، بۆ ئەوەی بەیەکەوە بڕۆن بۆ ناو هۆڵەکە یان لە یەکتری دانەبڕێن، یەکێک هاواری ئەکرد: زامدار. یەکێکی تر بن خەو، یەکێکی تریان: پەرێشان. ئا ئیتر لێرەدا بوو، هێمنی موکریانی وتی: ئەدی بابم ئەمە یەکێتی نووسرانە یان نەخۆشخانەیە.'!

هەر لەم ساڵەیشدا بوو کە دووەم بانگەوازی ڕوانگە بەناوی 'ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەککرن' لە هاوکاریدا بڵاوبۆوەو هەراو زەنایەکی گەرمی دوای خۆی نایەوە .

چیرۆکەکەیشی بەمجۆرە بوو: لەساڵی (۱۹۷۰-۱۹۷۱) بوو، کاک جەمال شالی پارێزەر نامیلکەیەکی چاپکراوی بڵاوکردەوە، کە تیایدا بەرگری لە مافە سروشتییەکانی ژن ئەکات و عەبا و پەچە بەدیاردەی دواکەوتن و تاریکیی لەقەڵەم ئەدات. دوای بڵاوبوونەوەی ئەم نامیلکەیە، هەندێ لە مەلاکانی سلەیمانی و هەڵەبجە لەنوێژی جومعەدا و لەبەر مایکرۆفۆنەوە هێرشێکی ناڕەواو توندیان کردە سەر کاک جەمال شالی و بەمولحید و زەندیق ناویان بردبوو! ئەوەی ڕاستیبێ ئێمەیش وەک کۆمەڵێ شاعیرو نووسەرانی ڕوانگە کە مەسەلەی ئازادی مرۆڤ بەگشتی و ژن بەتایبەتی پەیاممان بوو، نەمانتوانی لەئاست ئەم

پەلامارەدا بێدەنگبین. بەسەفەر لەبەغدا بووم، لەوێ قسەمان لەم مەسەلەیە کردوو، نووسینی بانگەوازەکەیان بەرەو ڕووی من کردەوە .

بانگەوازەکەم بەو ناونیشانە نووسی تاڕادەیەکیش زمانی بانگەوازەکە توندوتیژ بوو، قسەمان لەگەڵ سەربەست بامەڕنی-دا کرد، کە لەو کاتەدا سکرتێری نووسینی هاوکاری بوو، بێ هیچ دوو دڵییەک بڕیاریدا کە لەهاوکاریدا بڵاوی ئەکاتەوە! هەرچەندە پێمانوت: "کە ئەشێ ئەم هەنگاوەیان گرانتربێ لەوەی یەکەمو لێپرسینەوەی توندی لەدوابێت، بەڵام سەربەست وتی: "من بڕوام پێیەتیو ئەبێ بڵاوبێتەوە."!

بانگەوازی "ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەککرن" بڵاوبۆوەو چەند ڕۆژێکی پێنەچوو، مەلاکان لەچەندین مزگەوتی جیاجیاوە لە سلەیمانی و هەڵەبجە و ڕانیە و.. دواتر ئەمە پەڕیەوە تاگەیشتە هەندێ لە مزگەوتەکانی "نەجەف"یش، ئیتر بوو بەفەتوای بەکافرکردن و ڕەجم کردنمان. کار بەوەیشەوە نەوەستا، دەستیانکرد بەلێدانی بروسکە و ناڕەزایی دەربڕین بەدوو ئاڕاستەی جیا: "یەکەمیان بۆ حکومەت و دووەمیان بۆ بارەگای بارزانی ".

من ئەو ڕۆژانە گەڕابوومەوە بۆ سلەیمانی، سەر لە ئێوارە بوو لەحەوشەدا نانمان ئەخوارد، بەردەباران کراین. ئیتر دوو سێ ڕۆژێ لەسلێمانی مامەوەو ڕوومکردە بەغدا بۆلای حسەین و جەلال و کاکە مەم. لەگەڵ حسەین-دا چووین بۆ ڕۆژنامەی "التأخی" ئەو کاتە حەبیب محەمەد کەریم سکرتێری نووسینی بوو. داوای هاوکاریی و یارمەتیمان لێکرد، لە بیرمە کاک حەبیب چەکمەجەکەی لای دەستە ڕاستی ڕاکێشا و وتی: "من ئەتوانم هەر ئەوەندە یارمەتیتان بدەم ئەم بروسکانە بڵاونەکەمەوە". لەسلەیمانیش بەسەرۆکایەتی شێخ محەمەدی خەتیبی مزگەوتی گەورە، وەفدێک بەرەو ناوپردانو حاجی هۆمەران کەوتبووە ڕێو چووبوونە لای مەلا مستەفا، بەڵام وەک دواتر زانیم کاک "فرەنسۆ هەریری" لەو مەجلیسەدا ئەبێو بەرگری باشمان لێئەکا.

لەسەردەمێکی تردا، بۆ خۆم کە کاک فرەنسۆم بینییەوەو مەبەستم بوو ئەو سۆراخەی لێبکەم، وتی: "بەڵێ وابوو، ئەو وەختەی وەفدی مەلاکان هاتبوون بۆلای سەرۆک بارزانی، من لەوێ بووم، خۆشبەختانەیش چەند ڕووناکبیرێکی تریش لەوێ بوون، ئەگەر قسەی ئەوانو تکای من نەبوایە، پێموایە زۆر ئەزیەت ئەدران."!

هەر لەو ڕۆژگارەدا، دایکم بەسەردان چووبوو بۆ ماڵی مامۆستا برایم ئەحمەد لەناوپردان، وەختێ گەڕایەوە، نامەیەکی کاک ئیدریس بارزانی بۆ هێنابووم. بەداخەوە نامەکە فەوتا، ناوەرۆکی نامەکە ئەوەبوو کە ئێمە واتە ڕوانگە، ئاژاوەمان ناوەتەوەو مەلاکانمان تووڕە کردووە، تۆیش واتە من، ئەگەر کوڕی فایەق بێکەس نەبوویتایە لێم نەئەبوردن، لەدواییدا نووسیبووی ئومێد ئەکەین کەجارێکی تر ئەمجۆرە کارانە نەکەن!

لەکۆشکی کۆماریشەوە کاک سەربەست بامەڕنی بانگکرابوو، بەڵام لەگەڵیا توند نەبووبوون، چونکە لەو سەردەمەدا سیاسەتی بەعس نەیئەویست پایگە ئاینییەکان بەهێزبن‌و مەلاکان دەنگی زاڵ بن. بەهەرحاڵ بۆ یەکەمجار بوو حکومەت خۆی ڕۆژنامەی خۆی دابخات. پێموابێ دوو هەفتەیەک هاوکاری دەرنەچوو.

دیارە هەر لەڕۆژی یەکەمەوە ناومان بەدەرگای مزگەوتەکاندا هەڵواسرا!. بۆ هەفتەی دواتر هەر لەهاوکاریدا پشتگیری کۆمەڵێ ڕۆشنبیرو نووسەرو هونەرمەندی ناسراوی کورد بڵاوکرایەوە. ئەوکاتە کاک "عەلی عەبدوڵلا" پارێزگاری سلەیمانی بوو، بەداخەوە هەڵوێستی ئێجگار توندوتیژو ناجۆر بوو بەرامبەرمان، تەنانەت وەک ئێمە فەرمانبەری لای ئەو بین، نووسراوێکی کردبوو بۆ یەکێتی نووسەرانی کورد لەبەغدا، کە لەوەو دوا هیچمان بۆ بڵاونەکەنەوە!. مامۆستایان سەعید ناکام و د.عیززەدین پشتگیریانکردین. نامەکەی عەلی عەبدوڵلا بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدرا.

دووەم بانگەوازی ڕوانگە؛ بەردێکی گەورەتری خستە ناو گۆمی بێدەنگییەوە، کە ئەمجارەیان مەسەلەی ئازادی ژن‌و یەکسانی سەردێڕی لەبەرچاوی بوو. لەو دەمەدا ئەوە جووڵەیەکی پێشکەوتووخوازانەی چاو نەترسانە بوو. من هەمیشە بۆ خۆم وابیرمکردۆتەوە: "پەیامی ئەدەبی‌و نوێخوزای، بەبێ پەیامی پێشکەوتووی هزری دیموکراتی و کۆمەلایەتی ناتەواو و نیوە ناچڵە". تۆ ئەبێ وەک ڕووناکبیرو ئەدیب لەمەڕ مەسەلەی ئازادی ژن قسەی خۆت هەبێ، قسەی ئاشکراو بێ پەردەپۆشی. نوێخوازی لە ئەدەبدا بەواتەی نوێخوازییە لەڕوانیندا بۆ ژیان و بۆ مرۆڤ و ئازادییەکانی. نەک بەتەنها نوێخوازی لەڕواڵەتی ئەدەبدا. هاتنە دەنگ لەسەر پێشێلکردنی هەق و مافی مرۆڤ لەسەر دەمکوتکردن و چەوساندنەوەی ژن و هەر مەسەلەیەکی تر بەر لەهەموو کەس کارو پەیامی نووسەران و ئەدیبانە.

کوڕەکانی ئەدەبی لاوان لەبەغدا لەکۆلێجی پەروەردە- هۆڵی (ساطع الحصری) ئەبەسترا. زۆربەی هەرە زۆری ئەدیبە لاوەکانی ئەو سەردەمە، بەباس‌و لێکۆڵینەوە بەشدارییان تێدا ئەکردو تەنانەت ئەدەبدۆستان لەشارەکانی کوردستانەوە، بەتایبەت ئەهاتن بۆ گوێگرتن و بەشداریکردن لەگفتوگۆکاندا .

پشتگیری د.ئیحسان و د.عیززەدین مستەفا ڕەسوول لەئەدەبی لاوان و بەشداریکردنیان لەدەوڵەمەندکردنی ئەو گۆڕانەدا دیارو لەبەرچاو بوون.

دوابەدوای بڵاوکردنەوەی بانگەوازی یەکەمی ڕوانگە، چالاکییەک کەوتە مەیدانی ڕەخنەی کوردییەوە، کە تائەوکاتە ساردوسڕو بێ جووڵە بوو. قسەکردن لەسەر ڕوانگە بەچاک و بەخراپ، بە لەگەڵدابوون و یان دژ، بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵە وتارو باسێک لەسەر مەلەسەی تازەکردنەوەو تازەگەری بنووسرێن و ببنە مایەی دیالۆگ‌و مشتومڕی ئەدەبی، کە تائەو کاتە نەنووسرابوون. هەرچی قەڵەمەکانی سەر بەبیروباوەڕی مارکسی و چەپی ئەو کاتەی کورد بوون، ڕوانگەیان بەلاوە ناپەسەند بوو، ئەدەبەکەشیان بەئەدەبی وردە بۆرژوا لە قەڵەم ئەدا..! تەنانەت هەندێ نووسەریان تائەوپەڕی بردو ئێمەیان کرد بەعەدەمی و وجودی و نەهلستی، ئەمە لەکاتێکدا، ئەبوو ئەوان بەر لەکەسانی دی لەگەڵ ئەم شەپۆلە تازەیەدابن.

ئێمە سێ ژمارەمان لەبڵاوکراوەی "ڕوانگە" دەرکرد. یەکەم کۆسپی گەورە، نەبوونی پارەو پوول بوو. ئەو سێ ژمارەیەیش بەپارەی گیرفانی خۆمان و هەندێ وردە باربۆ چاپکرد. وابزانم بۆ ئەوەی چاپخانەیەک بدۆزینەوە هەرزان بێت، سەلاح شوان کە سەرپەرشتی چاپ‌و دەرچوونی ئەکرد، گەیشتبووە چاپخانەیەک لەنەجەف.

ئەگەر تەماشایەکی هەر سێ ژمارەکە بکەین، هەست ئەکەین، تین‌و تاوێ بۆ تازەکردنەوە کەوتۆتە دەقەکانەوە، یان زمانێک بەڕێوەیە، کە لەزمانی پێش خۆی ناچێ، بەڵام هێشتا ماوێتی گەشە بکەن‌و ببنە ئەو دەقانەی کە ئێمە خەومان پێوە ئەبینین.!

لەکۆنگرەی دووەمی یەکێتی نووسەرانی کورد-دا لەهەولێر، لەئێوارە کۆڕەکانی شیعر خوێندنەوەدا، لەجموجوولی ناو کۆنگرەو گفتوگۆی ناو لیژنەکانو پێشکەشکردنی پێشنیازەکاندا، ئەدیبە لاوەکان، جێدەست و دەنگیان دیار بوو. لەو سەردەمەدا سەیدا سالح یوسفی سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد بوو. ئەویش بەگەرمی پشتگیری لەئەدەبی لاوان ئەکرد. لەو ئێوارە کۆڕەدا کە منیشی تێدا بووم بۆ شیعر خوێندنەوە، سەرەتا هەندێ کۆسپیان لەبەردەمما قوتکردەوە بۆ ئەوەی لەبری ئەو شیعرەی ئامادەم کردبوو، شیعرێکی تر بخوێنمەوە! چونکە زانیبوویان ئەو شیعرەی ئەیخوێنمەوە، لە ئاگرە سوورەکانەو ڕەنگە گێچەڵیان بۆ دروستبکات، بەهەرحاڵ من هەر ئەو شیعرەم خوێندەوە کە لە باخەڵما بوو، ئەویش قەسیدەی "تۆ هەوریتو ئەتبارێنم" بوو. کە دوابەدوای هێرشی عەقڵە تاریکەکانو کۆنخوازان نووسیبووم. هێشتا دووکەڵی ئەو ئاگرە هەر بە ئاسمانەوە بوو، هێشتا هەڕەشەو گوڕەشەی توولەمارە سەرسپییەکان نەڕەوییبۆوە. جارێکی تریش شیعر گڕیدایەوە.

لەساڵی (١٩٧٢)دا، لەگەرمەی دۆستایەتیو هاوپەیمانێتی پارتیو بەعسدا، حکومەتی دیکتاتۆری، لەڕێی کۆمەڵێ مەلاوە، کە بۆ دیدەنی بارزانی نێردرابوون بۆ حاجی هۆمەرانو لەوەختی ئەو دیدەنییەدا، خۆیان تەقاندەوە یان تەقاندبوویاندنەوەو بارزانیش بەموعجیزە ڕزگاری بوو. لەو سەردەمەدا، تیرۆرکردنی بارزانی یانی تیرۆرکردنی شۆڕشەکەی بوو، کوشتنی بارزانی، کوشتنی گەورەترین سومبولی ئەوکاتە بوو. بۆیە منیش هەر دوابەدوای ئەو ڕووداوە، شیعری "بۆ بارزانیم" نووسیی .

ئەم بەرهەمە، قسەو بڕوای ناودڵو فیکری میللەتێ بوونو من کردبووم بەشیعر. لەوەرچەرخانە سیاسییەکانی ساڵانی دواتردا، زۆرجار لێیان ئەپرسیم، لەو شیعرەت پەشیمان نیت؟! من ئەوساو ئێستاو بۆ داهاتوویش هەر ئەڵێم: "نەخێر پەشیمان نیم، چونکە ئەو شیعرە ئاوێنەی ڕاستەقینەی ئەو ڕۆژگارە بووە کە خۆم و میللەتەکەمی تێدا ژیاوە."

لەساڵی (١٩٧٣)دا بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیری کوردی لەبەغدا کە ئەوسا د.ئیحسان فوئاد بەڕێوەبەری گشتی بوو. دیوانی سێیەمی لەچاپدا "من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ". یەکێک لەشیعرەکانی ناو دیوانەکەیش شیعرەکەی "بۆ بارزانی" بوو. ئەمە خۆی لەخۆیدا جۆرە بوێرییەک بوو لەلایەن "د.ئیحسان"ەوە، ئەگەرچی هێشتا شەڕ نەبووبۆوە، بەڵام پەیوەندی نێوان حکومەتو قیادەی بارزانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، ڕوو لەگرژیو ئاڵۆزی بوو. لەڕووی هونەری شیعریشەوە، چەند قەسیدەیەکی ناو ئەم دیوانە وەک: "گێنگڵو من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێو تۆ هەوریتو ئەتبارێنم و سەرچۆپییەک لەسوتاندا و سمکۆ جارێکی تر ناچێتەوە سەرخوانی مردن"، هەروەها دوو سێ شیعری تریش، سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوون بۆ شیعری من، کە دواتر لەساڵی (١٩٧٥)داو لەشیعری "کۆچ"دا، ڕەنگ و ڕووی تەواوی ئەم وەرچەرخانە دەرکەوت.

ئێمە هەڵەبووین،
ئەوپیاوە راست بوو..

لەسەرەتای حەفتاکاندا "شانۆی کوردی"یش لەگەشەکردندا بوو. چەند هونەرمەندێکی دەرچووی پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی بەغدا گەڕابوونەوە کوردستان و دەستیانکردبوو بەکار، جیا لەو شێوازەی کە ڕەفیق چالاک پێشتر کاری پێئەکرد. بەتایبەتی هەردوو تیپی شانۆی پێشڕەو و نواندنی سلەیمانی لەتیپە چالاکەکان بوون. چەندین ئەکتەری بەتوانایان تێدا بوو. غازی بامەڕنی؛ یەکێک بوو لەو دەرهێنەرانەی جێدەستی دیاربوو، هەروەها هونەرمەندانی وەک چێوار و کەمال سابیر و ئازاد جەلال و شەماڵی عەبە ڕەش و جیهاد دڵپاک و گەزیزە، لەو ئەکتەرانە بوون کە ئیتر وردە وردە بەهەنگاوی گەورەوە بەرەو پێش ئەچوون .

هونەرمەند فازڵ جاف؛ خۆی خەڵکی کەرکوک بوو، لەسەرەتای حەفتاکاندا هاتە سلێمانیو لەڕێی تیپی نواندنەوە چەند کارێکی تازەی پێشکەش بەشانۆی کوردی کرد، کە پێموایە گۆڕانێکی نەوعی بوو لەڕەوتی شانۆی ئەو کاتەدا. بەتایبەتی شانۆنامەی (پردی ئارتا) و (دووڕەگ) کە لەعەرەبییەوە کرابوون بەکوردی. یەکەمیان محەمەد موکری کردبووی بەکوردیو منیش شیعرەکانی ناو شانۆنامەکەم بەشیعرەوە تەرجەمەکردبوو. دووەمیشیان دووجار کرابوو بەکوردی، یەکەمجار لەلایەن عومەر عەلی ئەمینو دووەم جاریش من کردبووم. بۆ نمایشکردن سوود لەهەردوو تەرجەمەکە وەرگیرا.

تەمومژی شەڕبوونەوە، لەنێوان کوردو حکومەتدا وردە وردە ئاسمانی کوردستانی داگرتەوە. لەو سەردەمە تاڵو تووشەدا، دووجاری تر یەکێتی نووسەرانی سلەیمانی، لەناو شاری کەرکوکدا کۆڕیان گرتەوە. دواجاریان هەستمانکرد بەوەی گرەگرێ مەترسی دەوری داوینو ئەمنی کەرکوکیش چاوی زەقی خۆی تێبڕیوینو ئەیەوێ لەفرسەتێکدا پەلامارمانبداو یان بمانفڕێنێ. بەر لەگرتنی کۆڕەکەیش کوڕوکاڵانی کەرکوک ئاگاداریان کردین کە پێویستە وریابین. بۆیە هەر لەدوای تەواوبوونی کۆڕەکەو لەئێوارەیەکی درەنگدا یەکسەر بەرەو سلەیمانی گەڕاینەوە. بۆ ڕۆژی دواییش لەلایەن لقی سێی پارتییەوە ئاگادار کرام ئاگام لەخۆم بێ و ماوەیەک خۆم بزر بکەم. هەر لەو ڕۆژانەیشدا بوو، هاوڕێ حسەین عارف ئاگاداری کردم کە دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەران بڕیاریانداوە منیش یەکێکبم لەو نووسەرانەی لەگەڵ وەفدی ئەدیبانی عێراقدا هاوبەشی کۆنگرەی ئەدیبانی ئاسیا و ئەفریکا بکەم، کە لە"ئەڵمانیا" ئەبەسترێ، بەڵام بەهۆی ئەو مەترسییەوە نەچووم بۆ بەغداو خۆشترین سەفەری عومریشم لەکیس چوو. دواتر برایان حسەین عارف و جەلال دەباغ بوونە نوێنەری نووسەرانی کورد لەو کۆنگرەیەدا.

هەر لەهاوینی هەمان ساڵیشدا دەستەیەک لەنووسەرانی سلەیمانی، گەشتێکمان بۆ ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان کرد لەناوچەی باڵەکایەتی، لەماوەی ئەو گەشتەدا کە هەفتەیەکی خایاند، چەندین کۆڕی شیعرو چیرۆک خوێندنەوە بۆ پ. م و ئەو قوتابییانە گێڕدرا کە لەو کاتەدا لەهەوارگەی هاوینەدا کاریان ئەکرد .

هەر لەو سەردەمەدا مامۆستا برایم ئەحمەد ماڵەکەی لەناوپردان بوو، زۆری پێخۆش بوو کە ئێمەی بینی. ئیتر شەوێک بەکۆمەڵ هەموومانی بانگکردو لەکۆڕێکی خۆبەخۆی ڕەنگیندا تادرەنگانێ لای ماینەوە. کە باسیش هاتە سەر باسی هەڵوێستی سیاسی مەکتەبی سیاسی و قیادەی بارزانی، مامۆستا برایم زۆر بەئاشکراو لەبەرچاوی هەمووان وتی (ئێمە هەڵەبووینو ئەو پیاوە ڕاست بوو!) .

بیرەوەری ئەو شەوە، قسە خۆشو ناوازەکانی خوالێخۆشبوو "شێخ حسەینی خانەقا" کە ئەو بەینە میوانی مامۆستا برایم بوو. تا مردن بیرمناچنەوە.

گەورەترین کێشەی نێوان کوردو بەعس، مەسەلەی کەرکوک و خانەقین بوو، ڕووداوەکانی دواییش دەریانخست، بەعس ئەیویست وەخت بکوژێ تا بەتەواوی خۆی ئەگرێ، ئێرانیش لەلای خۆیەوە گەمەیەکی تری ئەکرد بۆ ئەوەی شەڕ

ببێتەوە. بەمجۆرە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بۆنی خوێنو شەڕ نزیکتر ئەکەوتەوە. لەشوباتی (١٩٧٤)دا هیوایەک نەماو ڕێکەوتنی ئازار بەرەو پووچەڵبوونەوە ئەڕۆیشت. بەر لەشەڕبوونەوە دوا فێستیڤاڵ و ئاهەنگی، کە پەیوەندی بەمەسەلەی هونەرو ئەدەبی کوردەوە هەبێ. ئەو میهرەجانە گەورەیە بوو کە لەبەغدا بەناوی "میهرەجانی یەکەمی هونەری کوردی"یەوە بەستراو بەدەیان تیپی شانۆیی و تیپی مۆسیقی و هونەری، لەهەموو شارەکانی کوردستانەوە بەکەرکوکێشەوە هاتبوون و بەشدارییان تێدا کرد. میهرەجانەکە چەند ڕۆژێکی خایاند، منیش بۆ ئەم میهرەجانە بانگکرابووم و لەگەڵ هونەرمەندە ناسراوەکانی وەک زەینەب و محێدین زەنگەنە و سامی عەبدولحەمیدو زۆری تردا لیژنەی تەحکیم بووم بۆ هەڵبژاردنی شانۆنامە باشەکان. بەکۆتاییهاتنی ئەم میهرەجانە، کۆتاییش بەباری ئاسایشی کوردستان هات و جارێکی تر دوژمن هەڵیکوتایەوە سەر گەلەکەمان.!

ئازادیی؛ یەکەمین فەزایە بۆ گەشەکردنی بەهرەو خەملینی هەموو ئەفراندنێ. ئەدەب و هونەری هەر میللەتێ لەئازادیدا باڵا ئەکات و گەورە ئەبێ. ئەو چوار ساڵەی دوایی ڕێککەوتننامەی ئازار، لەبەرئەوەی جۆرە ئازادییەک، هەناسەدانێک، جوڵەیەک بوو بۆ زمانی کوردی و بەهرەکانی، لەبەرئەوە بەرهەمەکەیشی بەبڕشت و لەبەرچاوبوو.

من سێ منداڵم لەنێوان (١٩٧٠-١٩٧٤)دا لە دایکبوون، کچە گەورەکەم "هەڵبەست" کە لەخۆشەویستیی شیعرەوە ئەو ناوەملێناوە، لەساڵی (١٩٧٠)دا لەدایکبووە، کوڕەکەم "هەڵۆ" لە(١٩٧٢)داو کچی دووەمم "هێژا" لەسەرەتای (١٩٧٤)دا لەدایکبوون. دوا کچیشم "هانا" لەبارودۆخێکی ترداو لەساڵی (١٩٧٩)دا هاتە دنیاوە.

کاک عومەر هەڵمەت؛ دوای ئەوەی لەئەمریکا گوزەران و ژیانی باشبوو، بیری لەوە ئەکردەوە کە منداڵەکانی خۆی "کاوەو کامەران و ژیان" ڕاکێشێ بۆلای خۆی، لەساڵی (١٩٧٠-١٩٧١)دا هەموو ئیشوکارێکی بۆ کاوە کردوو من لەبەغداوە بەڕێمکرد بۆ بێروت و لەبێروت-یش ماوەیەک لای کاک سەرچل قەزاز مابووەوە، دواتر گەیشتە لای باوکی لەئەمریکا. چەند ساڵێک دوایئەو بەهەمانشێوە کامەران و لەدوای ئەوانیش ژیانو مێردەکەیی و منداڵەکەیان گەیشتنە لای کاک عومەر.

لەناو یەکێتی نووسەرانی سلەیمانیدا، چەندین بیروبۆچوون‌و هەڵوێستی جیاجیا هەبوون، هەرچی پەیوەندداره‌کان بوون بەحزبی شیوعی عێراقەوە، پابەندی سیاسەتی ئەوان بوون، چاوەڕوانی فەرمانی ئەوان بوون، هەندێ مارکسی تریش هەبوون، بڕوایان نە بەحزبی شیوعی عێراق و نە بەهیچ حزب و لایەنێکی تر هەبوو، گاڵتەیان بەشۆڕشی کورد و بارزانی و پ. م ئەهات، بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە چ ئەوساو چ دواتریش هەڵوێستێکی ڕوون و ئاشکرایان نەبوو، بۆ پاساوی ئەم خۆدزینەوەیە لەشۆڕشی ئەیلول، مەسەلە تیۆرییەکانیان ئەکرد بە بیانوو، نەک هەر ئەو سەردەمە، دوای هەرەسی ئەو شۆڕشەو سەرلەنوێ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ و لەتاریکترین سەردەمی دروستبوونەوەی موقاوەمەدا، ئەوانە لەچایخانەکانی سلەیمانی دائەنیشتن‌و ئەیانوت (ئەمانیش بەجرتێک دێنەوە!). پەیوەندیدارەکان بەحزبی شیوعییەوە، دوو ساڵێ بوو، لەگەڵ بەعسدا لەبەرەی نیشتمانی‌و پێشکەوتووخوازدا بوون. هەندێک لەوانە لەساڵی (١٩٧٤)داو لەمەفرەزەکانی حزبی شیوعیدا لەسلێمانی‌و دەرەوەی سلەیمانی چەکیان هەڵئەگرت و تاقیبی پ. م یان ئەکردوو ئەچوونە سەر ماڵەکانیان و ڕاپۆرتیان لێئەدان !

لەسەرەتای حەفتاوە، تاکۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان لەناو شاری سلەیمانیدا، هەر شاعیرو ئەدیبێ، جۆرێک لەپێناسەی مارکسی لەگیرفاندا نەبوایە، یان وەکوو ئەوان قسەی نەکردایە، یان داخل بەگروپەکەیان نەبوایە. ئەوا ئیتر ئەو نووسەرە بەر نەفرەتی چینی چەوساوەو پرۆلیتار ئەکەوت. ڕەخنەی کوردی لەو سەردەمەدا، بەم پێوانەیە هەموو بەرهەمە ئیبداعیەکانی ئەپێوا. ڕەخنەکان، فریان بەسەر دەقەکانەوە نەبوو، خوێندنەوە نەبوون بۆ ئەدەب و داهێنان، بەڵکوو ڕەخنەگر، ئەوەی لەسەرچاوە تیۆرییەکانی مارکسییەت خوێندبوویەوە، ئەهات و هەڵیئەڕشتە ناو ڕەخنەکەیەوەو خۆی تیا خاڵی ئەکردەوە. شیعرو ئەدەبی ئێمە، شیعرو ئەدەبی وردە بۆرژوا عەدەمی و نەهلستیی بوو. نەک ئەدەبی واقیعییەتی سۆشیالیستی و کرێکاران! لەبیرمە هەر لەحەفتاکاندا بوو. وتارێکی ئاساییم بەناوی (جدا توفیق)ەوە لە(بەیان)دا بلاوکردەوە، کردیان بەهەرا. د. عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ لەدوایئەوەی لەسەفەرێک گەڕابۆوە، بەشێک لەوتارەکانی "ژدا نۆف"ی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوەو دابووی بەیەکێک لەو نووسەرە مارکسییانە، وەک ئەوەی هەنگیان لەداردا دۆزیبێتەوە، شانازییان بەو تروحانەی "ژدا نۆف"ەوە ئەکرد! ئەمە لە کاتێکدا بوو کە "ژدا نوف"، لە دنیادا ڕسوا ببوو. ستالینیزم؛ کەسەرچاوەی بیروڕاکانی ژدا نۆف بوو، لەجیهانی فیکرو ئەدەبدا وەک گۆبلزو هیتلەر تەماشا ئەکرا! تەنانەت کار گەیشتە ڕادەیەک یەکێکیان لە(بەیان)دا نووسیبووی ئەم ئەدەبە "واتە ئەدەبی ئێمە" لەئەدەبە زایۆنیزمەکەی کافکایە!. ئێمەیەک کە لەو کاتەدا لەقولەپێی کەڵە نووسەرێکی وەک کافکایشدا نەبووین!. بەلام بەڕاستی سێ چوارێک لەو نووسەرانە، نەمارکسی بوونو نەخاوەنی هیچ بیروباوەڕێ، چۆنییەتی پەیوەندییان لەگەڵ ئەم یان ئەودا، بەپێی ڕۆژ، هێڵی بیرکردنەوەیانی ئەکێشا. بەدرێژایی شۆڕشی ئەیلول و ئینجا شۆڕشی نوێ و تاراپەڕینی (١٩٩١)، چەند نووسەرێ لەوانە باجی یەک ڕۆژی ئازارو دەردەسەری و ئاوارە بوون و نەفیکردن و گرتن و ماڵ تالانکردن و دەرکردن لەوەزیفە و بانگکردن بۆ ئاسایش و لێکۆڵینەوە نەبوون !

سەر لەبەیانی یانزەی ئازاری (١٩٧٤) کۆمەڵێ لەو نووسەرانەی کە چارەنووسی خۆیان، بەشۆڕشی ئەیلولەوە بەستبۆوەو کوردستانییانە بیریان ئەکردەوە، وەک هەزاران هەزاری تر، لەگەراجی ئەسحابەسپی یەکمان گرتەوە، ئەو

نووسەرانەیش ئەمانەبوون (ئەمینی میرزا کەریم و مستەفا سالح کەریم و ڕەووف بێگەرد و تایەر سالح سەعید و سەلام مەنمی و من) .

ئەو ڕۆژانە حکومەت مەبەستی نەبوو کێ شار بەجێدێڵێ و ئەڕوا، ڕێگای کردبۆوە، دیارە هەر بۆ ئەوەی گوشاری زیاتر لەڕووی ئابووری و بژێوییەوە بخاتە سەر شۆڕش. ئەم کۆمەڵە پێکەوە ڕوومانکردە هەڵەبجە. وەختێ گەیشتین، هەڵەبجە چۆڵو شەقامەکان تاک و تەرا خەڵکیان پێوەبوو. "شەفیق ئاغای ئەحمەد ئاغا" لەوێ بوو، کە بینیمان ئەویش قسەیەکی ڕوون و ئاشکرای لەلانەبوو. ڕێکەوت "فەتاح ئاغای حەمەمین ئاغای" فەرماندەمان بینی، کە ئێمەی دی، بەگەرمی پێشوازی لێکردین. لەلاپەڕەکانی پێشوودا، تاخزمەتگوزاری زۆری ماڵی خۆیان و ماڵی "خدر"ی برایی و چاککردنی ڕێ و شوێن لەمەخفەرەکەی تەوێڵەدام بۆ باسکردن. ئێمە هێشتا لەماڵی خدری برای کاک فەتاح بووین. وتیان "ئەوە برادەرێکی تریشتان هات". کاک "حەمە ڕەشید فەتاح"یش گەیشت. لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنمانەوە، ئەو بارانەی دەستی بەبارینکرد تاچل شەو زیاتر خۆشکردنەوەی بۆ نەبوو! ئەو شوێنەی لەمەخفەرەکەدا جێگەکانمان تێدا چاککرد، لەهۆڵێکی گەورە ئەچوو، ئەمبەرو ئەوبەر جێگاکانمان ڕاخستبوو. چراو زۆپاو پێداویستی ترمان بۆ دابینکرا بوو. زەخیرەی خۆمان هەبوو، ڕۆژانەیش بۆ چێشتلێنان و قاپ شتن و گسکلێدان، خشتەی دابەشکردنی کارەکانمان ڕێکخستبوو. من و تایەر سالح سەعید بەیەکەوە بووین. من تەمەڵ و ئەو گورج و گۆل. من لە چێشتلێنان و ئەو کارانەدا دەستوپێ سپی و، ئەو وەستاو کارامە بوو. بەڵام ڕێککەوتبووین و کێشەمان نەبوو. ئیتر واهاتبووین، هەفتەیەک ئەوپەڕی دە ڕۆژ لەتەوێڵە بمێنینەوەو دوایئەوە لەڕێی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بگەینە ناوچەی حاجی هۆمەران و دەربەند ڕایات و ناوچەی سەرکردایەتی شۆڕش. بەڵام باران و تۆف، هەموو ڕێیەکی بەستبوو. هەر لەو ڕۆژانەدا بوو، باران و لافاو هاوولاتییەکی سەربەرەو خوار کرد بەشێوەکانداو ئێستاو ئەوسایش نەبینرایەوە!. شەوانە بەکۆمەڵ دائەنیشتین، وەختمان زۆر بوو، بەهیچ شتێ تەواو نەئەبوو. نەبەیاری دەنکە شقارتەو، نە بەکلاوکلاوێن و نەبەنووسین و نە بەخوێندنەوەیش. هەر لەو سەردەمەدا بوو. بۆ یەکەمجار کاک (حەمید بلباس)مان ناسیی، لەکۆلێجی یاسا دەرچوو بوو، لەناو شۆڕشیشدا کرابوو بە دادوەر. گەنجێکی سوورو سپی قۆزی هەمیشە دەم بەپێکەنین. شیعر دۆستو دەنگخۆش. گەلێجار شەوانە ئەویش لەگەڵ ڕەووف بێگەردا پێکەوە تێیان

ئەچریکاند. کاک حەمید کورێکی خزمی خۆی لەگەڵدا بوو، کە تەماشام کردو لێی وردبوومەوە، کوتومت دەموچاوی هەر لەدەموچاوی "حامووڕابی" ئەچوو. ئیتر لەو شەوەوە هەر بەحامووڕابی بانگ ئەکراو تائێستەیش من نازانم ناوی ئەسڵی چییە. بەڵام دیومەو هەر لەژیاندایە. بۆخۆشی و پێکەنین ناوی سەیر سەیرمان لە یەکتر نابوو. "مستەفا سالّح" بەحەسەنە سێ ژنو، "من" مەدحەتە کەچەڵی کەبابچی و "تایەر سالّح" شینە شاهۆ ..

بەردەوام باران سەر بەکلاوە ئەباری، ئەوەی ڕاستیبێ لەم بێکاری و بێ ئیشییەی خۆمان بێزار بووبووین. بەڵام چاریش نەبوو، ئەبوو هەر چاوەڕێبین، تاخۆش ئەکاتەوەو ڕووناکییەک ئەکەوێتە ئەو ئاسمانە دڵتەنگەوە .

ڕۆژێکیان ڕەووف بێگەرد و تایەر، بیریان کردبوەوە لەوەی نامەیەک بەناوی "هێرۆ"ی کچی سەلام مەنمی-ییەوە بنووسن و لابەلا لەڕێگەی شۆفێرانەوە، کە تائەو کاتەیش هاتوچۆی نێوان سلەیمانی و سەیدسادق و تەوێڵەیان ئەکرد، بیگەیەنینە دەست سەلام، نامەکەیان نووسی. ناوەڕۆکی نامەکە ئەوەبوو کە ئەوان زۆر بیری ئەکەن و کە بە بەردەمی کتێبخانەکاندا ئەڕۆن و کتێبەکانی باوکیان ئەبینن، سەر بەهەنسکەوە هەڵئەبڕنو تەنەکەیەک نەوتیش چییە لەماڵیاندا نییەو تادوایی... نامەکەیان گەیاندبووە دەست سەلام .

سەلام: خوێندییەوەو مات و غەمگین بوو، ئێوارە بوو هاتبووینەوە ناو مەخفەرەکە، هەریەکەو لەسەر جێگەی خۆی دانیشتبوو. سەلام ڕوویکردە ڕەووف‌و پێی وت "ڕەووف نامەی ماڵەوەم بۆ هاتووەو دایکی منداڵەکان زۆر سەلامت لێئەکات!". تایەر-یش لەخوارەوە بەدەنگی بەرز هەڵیدایە "ڕەووف بڕوای پێمەکە، درۆ ئەکاو سەلامی تۆی تیا نییە!" سەلام هەر هەستیشی پێنەکرد. بەڵام سەیر ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێ تایەرو ڕەووف، ئەم کڵاوەیشیان کردە سەر من. چونکە ئەو شەوە من زۆر سەرم کردبووە سەر سەلام و گاڵتەم کردبوو. ئەویش بەمجۆرە بوو:

ئەو ڕۆژە هاتبووینە دەرەوە، تۆزێ خۆشی کردبۆوە، لەچایخانەکەی ناوەڕاستی تەوێڵەدا دانیشتبووین، پێموایە یەکێک لەشۆفێرەکان هات و نامەیەکی دامێ. نامەی خەسرەوی ئەحمەد میرزای ژن برام و لەهەمانکاتدا مێردی گەزیزەی خوشکم بوو. نامەکەم خوێندەوە کە گوایە ئەو و نەسرین و منداڵەکان هاتوونەتە سەید سادق و لەوێ چاوەڕێم ئەکەن بیانبینم .

خەت خەتی خەسرەوەو گومان لەوەدا نییە، دووسێ جارێ هێنام و بردم، بەڵام بەهیچ جۆرێ گومانم لەخەتەکە نەبوو، لە دواییدا چووم بۆلای شۆفێرەکان و جێگەیەکم لەپێشی جیبەکەدا گرت و هاتمەوە دانیشتم. لەولایشەوە ڕەووف و تایەر گوایە سەرقاڵی تاوڵە کردنن، پێموتن (من ئەچم بۆ سەید سادق و ئەگەڕێمەوە). وتیان (پەلەمەکە جارێ و بیخەرە وەختێکی تر).

وتم (نا.. هەر ئەبێ بڕۆم). کەچوومە ناو جیبەکەوەو شۆفێر خەریکبوو لێبخوڕێ، تایەر هات و وتی: (دابەزە.. دابەزە! دەعوەتەکەی نیوەڕۆیماڵی کاک عومەر عەلی ئەمین لەکیس خۆت مەدە، دابەزە). ئیتر ئەو شەوەش بەزمەکە بەسەر من دا شکایەوە.

ئیتر ئەوسا زانیم تایەر-یش ئەم کڵاوە نایابەی بۆ من کردو لەدواییدا لەتایەرم پرسی، باشە ئەم خەتە چۆن؟! لەوەڵامدا وتی ماوەیەکی زۆر دەفتەرێکم لەلابوو کە خەسرەو بەخەتی خۆی شیعرەکانی برایم ئەحمەدی تیا نووسیبۆوەو ئیتر لەو وەختەوە ئەتوانم کوتومت وەک خەسرەو لاسایی خەتەکەی بکەمەوە. ئەو چل ڕۆژەی لەتەوێڵەدا گیرمانخواردبوو، کاک عوسمان هەورامیش لەماڵی خۆیان میواندارییەکی باشی کردین. هەروەها مەنگوڕی شاعیریش.

بیرمە کە چووینە ماڵی مەنگوڕی، لەتەنیشت خۆیەوە کۆمەڵێ دەفتەری هەڵچنیبوو، هەموو دەستنووس بوون، وتی (ئەمانە بیرەوەریەکانمن)، دەستیدایە دەفتەرێکیان و کردییەوە، چووە سەر لاپەڕەیەک، کاتێ ئەم لەڕانیە بووەو، وەختی دووبەرەکی و جیابوونەوەکەی م. س و قیادەی بارزانی، باسی ئەو ڕۆژگارانە ئەکات و لە شوێنێکدا بەلاقرتێ تەعلیقێکی لە کاک "عومەر دەبابە" داوە. منیش ئەو دێڕەم لەلاوە نیشانی کاکە مەم دا، کە خاڵێتی، ئیتر دەسمانکرد بەپێکەنین .

میرزا محەمەد مەنگوڕی؛ شاعیرێکی میللی بوو، ئەویش لەسەردەمێکدا کە لەڕانیە بوو، هەر لەسەرەتای حەفتاکاندا، کتێبێکی چاپکردبوو بەناوی "گەشتێ بۆ مەریخ"، مەلاکان کەوتنە پەلاماردانی و هێرشکردنە سەری و نەیانهێشت لەڕانیە بژی و ئەویش ناچار ڕانیەی بەجێهێشت و هاتبووە سلەیمانی و لە تەوێڵە فەرمانبەر بوو.

دوای چاوەڕوانییەکی دوورو درێژ، ئیتر ئەو ڕۆژە هات، کە لە ڕێگەی ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە بەناو ئێراندا بەرەو حاجی هۆمەران بکەوینەڕێ.

دەمەو ئێوارە گەیشتینە پاوەو بردیانینە ئوتێلێ و لەوێ ماینەوە، بەلام نەیانهێشت کەس ببینین یان بچینە دەرەوە. بۆ بەیانی، وامانزانی ئیتر بەردەوام ئەبین لەسەر ڕۆیشتن، بەلام دیسانەوە ئێمەیان گێڕایەوە بۆ تەوێڵە! دیسانەوە هەفتەیەک زیاتر ماینەوە، ئەوسا جارێکی تر هەمان ڕێمان گرتەوە بەر. شەو لەکرماشان ماینەوە، ئینجا بەرەو سەقزو بەنێوانی کەژو لاپاڵی بەفرگرتوودا بەرەو خانەو دوایی حاجی هۆمەران و تاگەیشتینە ناوپردان .

ناوپردان جمەی ئەهات، چونکە (م.س)ی پارتی و مەکتەبی عەسکەری لەوێ بوون، یەکەم بەرپرسێ کە دیمان کاک دارا توفیق بوو. دوای قسەکردن، کێ چی ئەکا و کێ نایکا، ئێمەیان برد بۆ کۆشکی سەلام و لەوێ جێگیربووین، کۆشکی سەلام بە بەرزاییەکەوە هەر لەولای چۆمانەوە دیاربوو، کۆشکەکە تازەبوو، دوابەدوای ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئازار دروستکرابوو، چەندین چاوپێکەوتنی سیاسی و دیداری گرنگی لەماوەی ئەو چوار ساڵەدا بینیبوو. لەسەر دالانێکی پان‌و بەرین، چەندین ژوور دروستکرابوو. ئێمەی نووسەرانی سلەیمانی چووینە ژوورێکییانەوە، دوایەوەی هەر کەسەو پێخەفو بەتانی خۆی وەرگرت، ئەمبەر

و ئەوبەر جێگەمان لێراخست. لەکۆشکی سەلامدا چاومان بەزۆر کەسی تریش کەوت، کە ئەوانیش تازە هاتبوونەوە ناو شۆڕشەوە، لەوانە عەقید لەتیف هەروەها مامۆستا ئەحمەد خواجەیش لەگەڵ (شوان)ی کوڕیدا لەوێ بوون. هەموو ڕۆژێ یەکترمان ئەبینی، ئەو پیاوە بەو تەمەنەوە ڕێی ئەو شاخ و کێوانەی گرتبووەبەرو نەیویستبوو لەژێر دەسەلاتی حکومەتدا بمێنێتەوە .

نزیکی ژوورەکەی ئێمەو لەدەرەوە، کونە تەیارەیەکی گەورە لەناو شاخەکەدا دروستکرابوو، وتیان (ئەمە کونە تەیارەی حەبیب محەمەد کەریم بووە!) جێگەی پانزە بیست کەسێکی تیا ئەبۆوە، هەرچەند ڕۆژێکمان خۆش بوو، ئیتر دوایئەوە بەتایبەتی لەشەواندا بەردەوام فڕۆکەی گەورەی جەنگی بەسەر سەرمانەوە ناڵە ناڵی بوو، لەحاجی هۆمەرانەوە بۆ گەلاڵە، بەدرێژایی ئەو خەتەی بۆردومان ئەکرد. هەر کەگوێمان لە قڕەی فڕۆکە بوایە، ئەوانەی نزیکی ئەو کونە بووین. خۆمان پێدا ئەکرد .

ئەحمەد خواجە-یش یەکێک بوو لەوانە. ماجید ئەمین، خەڵکی چوارتا بوو، ئەمناسیو لەقوتابخانەی پیشەسازیش تادەرچوونمان لەبەغدا هەر پێکەوە بووین، ئەمیش هاتبووە دەرەوەو لەوێ بوو، قسەی خۆش بوو. مامۆستا ئەحمەد خواجە پێموایە ساڵێک بوو بەرگی یەکەمی یادداشتەکانی خۆی بەناوی 'چیمدی'یەوە چاپکردبوو، شەوێکیان هەموومان لەکونە تەیارەدا بووین، ماجید ڕوویکردەوە ئەحمە خواجەو پێیوت: (ئاگات لێیە چیمان بەسەرهات مامۆستا! لەوانەیە ئەمجارە کتێبەکەت ناوبنێی 'چیم بە خۆمکرد!') .

جارێکی تریش لەگەرمەی بۆردوماندا بوو بەمامۆستا خواجەی وت (فڕۆکە ئەمانەن! ئێوەیش لەکاتی خۆیدا ئەگەر فڕۆکە بهاتایە ئەو هێشتا لەسەر چەمچەماڵ بوو ئێوە لەجاسەنە ئەتانزانی واهات، ئەگەر بۆردومانیشی بکردایە، هەر بەحاڵ خۆت بخستایە سەرلا، تەپ ئەیدا بەولاتا ڕزگارت ئەبوو).

زۆربەی هەرە زۆری ئەو نووسەرانەی ڕوویانکردە، شاخو چوونە ناو شۆڕشەوە، دەزگای ڕاگەیاندنو ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی کاری تێدا بکەن. کارگێرانی ئەم دەزگایانە ئەوەندە زۆر بوون لەژماردنو ناو هێنان نایەن. بەشێکی زۆری نووسەرانو ڕووناکبیران لەبەغداوە هاتبوون. د. کەمال مەزهەرو کامەران قەرەداخی و فەلەکەدین کاکەیی لەناوە دیارەکان بوون، ڕاگەیاندنو کارگێرانی ڕادیۆ، هەر هەموومان لەناوچەی ئازادی هەڵماندابوو، شوێنێکی دلگیربوو، بەلام ڕووتەن بوو. هەر چەند کەسو چادرێکی

هەبوو. لەئازادی بۆ دووەمجار لەناو شۆڕشدا (هەژار موکریانی)م بینییەوە، هەموو ئەو تەرجەمەو وتارانەی بەکوردی ئەنوسران، ئەبوو ئەو بیانخوێنێتەوەو لەڕووی ساغو سەلامەتی زمانی کوردییەوە چرای سەوزیان بۆ هەڵبکات .

کاک دارا تۆفیق؛ سەرپەرشتی هەموو کاروبارەکانی ڕاگەیاندنی ئەکرد. کاک دارا پیاوێکی ناسکو ڕووخۆشو ڕووناکبیر بوو، ڕۆژانەیش د. کەمال مەزهەر بەردەوام لای ئەو دائەنیشت. ڕێکخستنی بەرنامەکانی ڕادیۆو کاروباری ڕۆژانەی ڕاگەیاندن لەلایەن مستەفا ساڵح کەریم-ەوە سەرپەرشتی ئەکرا، هەر لەوبەری ئێمەیشەوە کاک جەلالی میرزا کەریم و چەند کەسێکی دی بەیەکەوە لەژێر چادرێکدا بوونو ڕۆژانە یەکترمان ئەبینی. چادرەکەی کامەران قەرەداخی و فەلەکەددین کاکەیی نزیکی ئێمە بوونو شەوانە سەردانمان ئەکردن، ئەوە یەکەمجار بوو لەنزیکەوە هەردووکیان بناسم. کامەران قەرەداخی بڕوانامەی ماستەری لەئەدەبدا لەیەکێتی سۆڤییەت وەرگرتبوو، لەبەرئەوە زۆر شەو باسی کەڵە شاعیرو نووسەرەکانی ڕووسیای بۆ ئەکردین، وەکوو گۆگۆلو پۆشکینو لیرمانتۆفو دستۆفسکیو تۆلستۆیو یەسەنینو مایکۆفسکیو ئەو زانیارییانەی لای ئەوبوو دەگمەن بوون. من لەبەشی وەرگێران بووم، لەگەڵ ئەنوەر قادر محەمەدو عەبدوڵلا عەباس-دا، جگە لەکاری وەرگێران ناوبەناو خۆیشمان وتارمان ئەنووسی، شیعری خۆیشمان ئەنووسی. ڕاگەیاندن و ئەو هەموو چادرانە نزیکی شەقامی گشتی حاجی هۆمەرانو گەلاڵە بوو، لەبەرئەوە هەموو ڕۆژێ بەدەیان میوان ڕوویان تێئەکردین.

ئەوەی بەلای منەوە سەیر بوو، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی من لەوێ بووم و ئەو هەموو ڕووناکبیرو نووسەرانە لەوێ بوون، ڕۆژێ لەڕۆژان، سەرکردەی شۆڕش بارزانی بۆ جارێکیش لاینەدا تابەخێرهاتنێکی ئەو هەموو نووسەرو ڕووناکبیرانە بکات !.

یەکدوو جارێ کاک سامی عەبدولڕەحمان و د.مەحمود ئەهاتن بۆلای کاک داراو هیچی تر. کاک کامەران قەرەداخی هەر لەو ڕۆژگارانەدا بوو، وتارێکی دەربارەی باوکی قومبەلەی هایدرۆجینی نووسیبوو، کرابوو بەکوردیش. کاک حەمەی تەباخیش کە ڕۆژانە لەگەڵ چەند کەسێکی تردا خەریکی ئامادەکردنی خواردن ئەبوون، ئەم هەواڵە ئەبیسێ و ئەچن بۆ لای کامەران قەرەداخی و پێی ئەڵێ (ئێ کاکە تۆ ئەو هەموو ساڵە لەڕووسیا بوویت، یەعنی ناتوانیت کەوچکێک لەو هایدرۆجینەت دەسکەوێو ئێمەیش بەکاری بێنینو ڕزگارمان بێت!) .

هەر لەو سەردەمەدا، دوو قۆلییەک هەبوون بەردەوام بەیەکەوە بوون. گوایە کاری نواندن و تەمسیل بۆ ڕادیۆی شۆڕش ئەکەن، ئەوانەیش کاک ڕەووف یەحیاو جەمال شۆتەر بوون. هیچیشیان دیارنەبوو. پێموایە بۆ ماوەیەکیش کاک جەمال شۆتەر بوو بەسەرپەرشتیکاری موبەقەکەمانو بەو حسابەی نیوەڕوان و ئێواران جۆری خواردنەکان بگۆڕێ، بەلام هەر قسە و هاش و هووش بوونو خۆیان لە هەموو کەسێ نەوسنتر بوون.

بارەگای یەکێتی نووسەرانی کورد لەکەپرێکدا بوو لەپێشدا هەر حسەین عارف خۆی بوو، لەدواییدا مامۆستا هەردی-ش، من دووسێ جارێ سەردانی حسەینم کرد، لەولایشیانەوە وەزارەتی دارایی بوو، ڕۆژێک لەوێ لەنزیکەوە شەهید 'ئارام'م بینی و لەگەلیدا دانیشتمو خەریکی کاروباری ژمێریاری بوو، هەر لەوێش سەربەست بامەڕنی هاوڕێم بینییەوە.

لەئازادی، بەیانییەک لەشیرین خەودا بووین، لەپڕ گرمەیەک هاتو ڕاپەڕین، لە ئێمەوایە فڕۆکەیە، بەلام وانەبوو، هەرسێکمان بەڕێکەوت لەمردن ڕزگارمان بوو. شۆفێرێک شەو لەسەرەوە لەسەر بەرزاییەکە جێبە پشت بەتالەکەی ڕائەگرێ، بەلام دیارە باش ڕایناگرێ، جێبە وردە وردە جولاوەو لەبەرەبەیاندا خل ئەبێتەوەو ڕووئەکاتە ناو ئەو هەموو چادرانە. چەند چادرێکی شێلابوو، بەلام ئەوەی باشبوو کە ئەو چادرانە ڕۆژانە کاریان تێدا ئەکراو هیچی تر. وەختێ جێبەکە گلۆرتر ئەبێتەوە ڕێک ڕووئەکاتە چادرەکەی ئێمە، بەلام بەردێک هەر لەلای چادرەکەوە ڕێی پێئەگرێو ڕووی پێ ئەکاتە ئەولاترو لەوێشەوە بۆ ناو چەمەکە. وەختێ ئێمە هاتینە دەرەوەو ڕووداوەکەمان بینی، حەپەسابووینو زانیمان ڕێکەوتێکی بچووک ئێمەی لەمردن قوتار کردووە. ئیتر یەک لەدوای یەک، کێ لەو ناوەدا بوو ئەهاتنو تەماشای ڕێڕۆی جێبەکەو بیچمی تێکشکاویان ئەکرد، کە لەناو چەمەکەدا کەوتبووە سەر پشتو تایەکانی بەئاسمانەوە .

کاک 'خالید خال'یش لەوێ بوو، لە دواییدا قسەیەکی خۆشیکردو وتی: کوڕینە! من بۆ مردن بەبۆردومان، مار پێوەدان، دوپشک، تۆپ، تفەنگ لەدەست دەرچوون، کارەساتی ئۆتۆمبێل، هەلدێرانی شاخ هاتبووم، بەلام ئەوەی بەخەیالمدا نەهاتبوو ئەمەیان بوو، ئۆتومبیلێ لەخۆیەوە خلۆربێتەوەو بێتە سەرتو بتشێلێ!

تفەنگ لەدەست دەرچوونەکەی- کاک خالید خال باسیکرد، ڕووداوێکی بەبیر هێنامەوە، هەر کەسێ سەرەتا ئەهات، خولێکی بچووکیان بۆ ئەکردەوە، بۆ

ئەوەی فێری ئەوەبێ چۆن کلاشینکۆف بەکاربێنێ بیکاتەوەو هەڵیوەشێنێتو سەرلەنوێ پێکی بێنێتەوە. یەکێک لەو خولانە بۆ عەبدوللا عەباس و پێموایە جەلالی میرزا کەریم و چەند نووسەرێکی تر ئەبێ. هەموویان لەگەل فێرکەرەکەیاندا دانیشتوون، کلاشینکۆفەکانیشیان بەدەستەوە ئەبێ لەپڕێکدا عەبدوللا عەباس پەنجە ئەنێ بەسەلیبەداو ڕیزێک بەپەنا گوێی بەرامبەرەکەیدا دەرئەچێ، ڕیزە گوللەو سەری ئەو کەسە تاڵەمویەکیان فەرق ئەبێ! کەعەبدوللا هاتەوە ڕەنگی زەرد زەرد بووبوو، لاڵ بووبوو، نەیئەزانی چیبڵێ!

بەشی هەرە زۆری ئەو وتارانەی بۆ ڕادیۆ ئەنووسران، کاک دارا تۆفیق بەعەرەبی ئەینووسینو دواتر ئەکران بەکوردیش، د. کەمال مەزهەریش ئەینووسی. جگە لە فەلەکەدینو کامەران قەرەداخی و مستەفا ساڵح کەریم، کە ئەوانیش بە عەرەبی ئەیاننووسی، ڕەوف بێگەرد و ئەنوەر قادر و کۆمەڵێک نووسەری تر بەرنامەی کوردییەکەیان بەڕێوەدەبرد.

لەدوای دووسێ مانگێ، حکومەت هەڵمەتی دەرکردنو ئاوارەکردنی هەموو ئەو خێزانانەی دەستپێکرد، کە پیاوەکانیان هاتبوونە ناو شۆڕشی کوردستانەوە، بەتایبەتی لەپایتەخت و شارەکانی خواروو، هەموو ڕۆژێ کاروانێکی لەو ماڵ و منداڵانە ئەهێنا و لەولای گەلی عەلی بەگ-ەوە هەڵیئەڕشتنو پێی ئەوتن (بچن بۆلای کوڕەکانتان یا براو مێردەکانتان!) ڕۆژ نەبوو ناوی دەیان خێزان نەگاتە ڕاگەیاندن.

ئەنوەر توفی؛ مامۆستا و هونەرمەند، کە ساڵانێکی دوورو درێژ لەشاری سلەیمانی خزمەتی کردبوو، ئەویش هەموو ڕۆژێ سەردانی ڕاگەیاندنی ئەکردو بەپەرۆشەوە سۆراخی ئەوەی ئەکرد کە ئاخۆ ژنەکەی لەنێو ئەو دەرکراوانەدایە یاخود نا!.. تا ڕۆژێ کاک دارا لێی پرسیی (کاک ئەنوەر تێبینی ئەکەم تۆ ئێجگار شپرزەتری لەوانی تر!) ئەویش وەڵامیدایەوە (ئەی چۆن کاک دارا، ئەمەوێ بزانم ژنەکەم بەڕاستی ئەگاتە ئێرەیش یان نا، چونکە من لەترسی ئەو هاتوومەتە ئەم شاخو داخە، ئەگەر بزانم بەڕاستی وایە.. ئەبێ سەری خۆم بۆ شوێنێکی تر هەڵگرم!).

من بەهەمووی چەند مانگێ لەکۆشکی سەلامو ناوچەی ئازادیو ڕاگەیاندن بووم، لەگەرمەی چالاکیو ئیشو کاردا بووم، ڕۆژێ کاک دارا ناردی بەشوێنماو

پێیوتم (ئەم بروسکەیەت بۆ هاتووە) بروسکەکە لەپێنجوینەوە هاتبوو، تیایدا هاتبوو، کە نەسرینو منداڵەکان هاتوونەتە دەرێو لەبناوەسووتەنو پێویستە بگەیتە لایان.

بۆ ڕۆژی دوایی هەگبەکەم دابەشانداو خواحافیزیم لەبرادەرە نزیکەکانم کردوو چوومە حاجی هۆمەرانو خانەو کەوتمە ڕێ، هەڵبەت نەسەفەری پێشووم کە هاتینو نەئەم سەفەرەیش ئەوە یەکەمجار نەبوو من شارەکانی کوردستانی ئێران ببینمو تیایاندا بمێنمەوە، لەساڵی (١٩٦٥)یشدا لەپێنجوینەوە بەهەمان خەتدا هاتبوومە حاجی هۆمەران.

بیرمە لەسنەو لەمەهاباد دوو شەو مامەوە، ئەو دەمە، سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول بوو، هێشتا پێشمەرگە لەئێراندا زۆر نەئەبینرا، ئەگەرچی چەکم پێنەبوو، بەڵام خەڵکەکە ئەیانناسینەوە، ئەچوومە هەر چایخانەو چێشتخانەیەک وەختێ هەڵئەسام ئەیانوت (پارەکەت دراوە). یان وەختێکم ئەزانی، یەکێک بەلامدا تێئەپەڕی و ئەیوت (بەساقەتان بم. هیوامان ئێوەن) .

بەهۆی کوڕێکی ناسیاومەوە، چوومە شاییەک، ئای لەو شاییەدا چ ڕێزێکیان لێگرتم، دواتر چوومە ژوورێکەوە هەر لەوماڵەدا، کۆمەڵێک کوڕی گەنج ئەیانخواردەوە، دوایئەوەی مەستبوون، کەوتنە هەڵڕشتنی خەمو دەردی خۆیان.

بیرمە یەکێکیان، باسی پێشەوا قازی محەمەدی ئەکردو خوڕ خوڕ ئاو بەچاویا ئەهاتە خوارەوە، خۆ کەزانییان من کوڕی فایەق بێکەسم، هەر ئەوە نەبوو قوتم نەدەن! من قەت ئەو دڵسۆزی و ڕێزگرتن و خۆشەویستییەی کوردی ڕۆژهەلاتی ولاتەکەم بیرناچێتەوە.

ئێوارە درەنگی کردبوو، وەختێ گەیشتمە بنارەسووتە. یەکەم کەس هەڵۆی کوڕم بینی، ئەو وەختە تەمەنی سێ ساڵ ئەبوو، کردمە باوەشمو خۆمکرد بەماڵی "باجی خەجێ و کاک مەحمود-دا". دایکمو نەسرین، هەموو چاوەڕوانییان ئەکردم، دوای دابڕان یەکترمان گرتەوە. نەسرینو منداڵەکان لەترسی گرێو ڕاوەدوونان، خۆیان بڕیاریان دابوو بێنە دەرەوە. باجی خەجێ، ژنی کاک مەحمود بوو، لەسەردەمی باوکمەوە ئەم خێزانەمان ئەناسی. کاک مەحمود پۆلیس بوو، لەدواییدا هاتە ناو شۆڕشەوە. باجی خەجێ بۆ یارمەتیدانی دایکم هەر لەماڵی ئێمەدا بوون، هەر بەشێک بوون لەخێزانەکەی ئێمە. باجی خەجێ و کاک مەحمود، یەک کوڕیان هەبوو ناوی عومەر بوو. لەسەرەتای دەستپێکردنی

شەڕی ناوخۆداو لەشەستەکاندا لەسلیمانی و هەر لەکۆلانەکەی ماڵی خۆیاندا دایانە بەر خەنجەرو کوشتیان .

لەم کارەساتەوە، ئیتر ئەو ژن و مێردە هیچ هیوایەکییان بەدنیا نەما، بەلام لەئێمە دانەئەبڕان، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولو پەراوەزەبوون ئیتر خەجێ و کاک مەحمودیش دیار نەمان. سۆراخمان کردن، بەلام بێسوود بوو، جارێک هەواڵێکمان بیست کە لەڕووداوی ئۆتۆمبێلداو لەئێران هەردووکیان تیاچوون. دەنگیان نەما، ئێمەیش لای خۆمانەوە دەستمان لێشتن، کەچی سەیر ئەوەبوو، لەم دووسێ ساڵەی دواییدا لەپڕ باجی خەجێ دەرکەوتەوە، بەلام کاک مەحمود هەر لەو ساڵانەی دواییدا لەئێران کۆچی دوایی کردبوو. وەختێ زانیم باجی خەجێ لەماڵی خاڵە عومەرمە بەهەڵەداوان چووم بۆ لای .

(باجی خەجێ و کاک مەحمود لەئەسڵدا خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەلاتن‌و لەکاتی خۆیدا هاتوون بەمدیودا).

نزیکەی هەفتەیەک لەماڵی باجی خەجێ مابنەوە، کۆنە ڕادیۆیەکیان هەبوو، ئێواران گوێم لەڕادیۆی شۆڕش ئەگرت، بۆ ئەوەی ئاگاداری دەنگوباس بم، بەتایبەتی دوای بۆردومانەکەی قەلادزێ، من هێشتا لەئازادی بووم کە ئەو کارەساتە ڕوویداو بەدەیان هاوولاتی شارەکەو بەدەیان خوێندکاری زانکۆی سلەیمانی تێدا بوونە قوربانیی. لەو کەسانەی لە نزیکەوە ئەمناسین، چەند خوێندکارێکی بەشی زمانی کوردی، کۆلیجی ئادابی سلەیمانی بوون. لەوانە حەمە ساڵح هەروەها سەروەری عەلی فەندی کە دراوسێمان بوو لەگەڕەکی ئیسکان، گەنجێکی قژ سووری ئێسک سووک بوو، بەتەمەن دە ساڵێ لەمن بچووکتر بوو، شیعر دۆستو شەیدای هونەر بوو. کارەساتی قەلادزێ کارێکیکرد کەئیتر خەڵکی وریاتر بنەوەو جێی خۆیان قایمتر بکەن‌و بزانن کە دوژمن بەهیچ جۆرێ دەست لەکورد ناپارێزێ و مەسەلەیش هەر شەڕی (پ. م) و سوپا نییە، بەڵکوو ئەم شەڕە، یەخەی هەموو کوردێکی گرتووە، جا پ.م بێ یان هاوولاتییەکی ئاسایی.

نەسرین بڕیاریدا بمێنێتەوە، وتی (من ناچمەوە بەردەستی حکومەتو بەعس). دوایئەم بڕیارە ئیتر منیش نەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ ئازادی‌و لای ئیشەکەی خۆم. وامان بەباشزانی وەکوو زۆربەی زۆری خێزانەکان ڕووبکەینە "مەریوان"و وەک پەناهێندە داوای مانەوە بکەین .

چووین بۆ مەریوان و هۆدەو هەیوانێکمان لەبەشی سەرەوەی ماڵێکدا بەکرێ گرت، ماڵێکی هەژار بوون، پیاوەکەیان کرێکاری ئەکرد. دوو کوڕی بچووکیشیان هەبوو ناویان عیسا و موسا بوو. زستانی ئەو ساڵە لەو ماڵەدا بووین. هیچی وامان نەبوو، ماوەیەکیش بوو هیچ یارمەتییەکی شۆڕشمان وەرنەگرتبوو. ڕۆژانە سەردانی کتێبخانەی گشتی مەریوانم ئەکرد. هیچ کتێبێک بەزمانی کوردی لەو کتێبخانەیەدا نەبوو، وردە وردە خۆم لەگەڵ زمانی فارسیدا خەریککردبوو، بەڵام بارودۆخی شۆڕش و باری دەروونی خۆم، بەسەر هەموو شتێکی تردا زاڵ بوون‌و لەچوونە کتێبخانەیش ساردبوومەوە. چایخانەیەکیش هەبوو ڕێک بەرامبەر سینەماکەی مەریوان بوو. ناو بەناوێ سەردانی ئەویشم ئەکرد. لەو ڕۆژگارانەدا جەمال شارباژێڕی شاعیریش هەر لەمەریوان بوو، ئەویش لەژوورێکدا لەگەڵ یەکێکی تردا کولەمەرگی ئەژیان، جاربەجار هەر لەو چایخانەیە یەکترمان ئەبینی، ئەو پەناهێندانەی لەمەریوان بوون، بەشی زۆریان خەڵکی سلەیمانی بوون، بۆیە بەوردی ئاگامان لە هەموو دەنگوباسێک هەبوو .

کاک فەتاحی حەمە مین ئاغای هاوڕێم، ئامر هێزی خەبات بوو. ماڵەکەی لە مەریوان بوو، ئەو کاتانەی سەردانی مەریوانی ئەکردەوە ئەمبینی‌و چەند جارێکیش زەخیرەی ماڵی بۆ دابینکردین. لەو سەردەمەدا هەندێ ئاڵوگۆڕی ئایدیۆلۆژی بەسەر بیرکردنەوەی سیاسیمدا هاتبوو، یەکێک لەو گۆڕانە گەورانە، ئەوە بوو کەپێویستە بیری کوردایەتی‌و نەتەوایەتی کراوەتر بێ و بڕوای بەپرنسیپە ڕاستەقینەکانی دیموکراسی هەبێ‌و خۆی لە توندوتیژی و دەمارگیری دووربخاتەوە و وانەزانێ کە هەرچی حەقیقەتە بەتەنها لەلای خۆیەوەیە .

ئەمە جگە لەوەی من کە لەساڵی (١٩٧٠)وە وازم لەکاری حزبایەتی هێنابوو، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەو قەناعەتەم لاجێگیرتر ئەبوو، کە هەرگیز بەکەڵکی حزبایەتی و دیسپلینی حزبی نایەم، لەبەرئەوە پێویست ناکات نەخۆم بخڵەتێنم‌و نەکەسانی تریش. چونکە هەرچەند ئەمهێناو ئەمبرد من بۆ ڕێکخستن نابم‌و نووسینی شیعرێکی جوانم لەچالاکییەکی حزبی کاری نەهێنی پێباشترە. ئەمزانی پیاوێکی شپرزەو ڕاڕام‌و هەر زوویش تاقەتم لەو کارانە ئەچێ کە خۆجوونەوەو دووبارەکردنەوەی ڕۆتینی تێدا بێت .

لەزستانی هەمان ساڵداو هەر لەمەریوان کۆمەڵێ لاوی خوێن گەرم خەریکی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی حزبێکی نەتەوەیی بوون، دوای ئەو بۆشاییەی (کاژیک) لەدوای خۆی بەجێیهێشتبوو. ئەم کۆمەڵە لاوە، نوێنەرێکیان ناردبوو

بۆلام بۆ مەریوان، خۆیان لەپینجوین بوون، بەلام پێشتر بەیاننامەیەکیان دەرکردبوو. هەندێ ئەندامی کۆنی کاژیکیان دابووە بەر تیرو توانجو قسەی بێ سەروبەر، بەلام ئەوەی ڕاستیبێ چوستو چالاک بوونو ئەیانویست لەخۆبوردوانە بێنەوە مەیدانی کارکردن. ئەیانویست هەندێ لێکدانەوەی سیاسی چەوتی لەوەوبەر ڕاستبکەنەوە. لەگۆشەگیری سیاسیی خۆیان ڕزگار بکەن، لەدیدی چەپی نەتەوەییەوە تەماشای بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بکەن. یەکەم هەنگاویشیان ئەوەبوو کە لەگەڵ ڕێکخستنی ئەوسای قیادەی مەرکەزیدا ئەم پردی دۆستایەتیو هاوکارییە ببەستن. لەو دانیشتنەدا، سەرزەنشتێکی زۆری بەیاننامەکەیانم کرد. داوایان لێکردم ئینتیما بکەمو لەگەڵیاندا ئیش بکەم، بەلام من هەڵوێستی خۆم بۆ ڕوونکردنەوەو لەهەمانکاتیشدا هانمدان بۆ ئەوەی خەتی ڕاستوڕێکی شۆڕشگێڕانەی خۆیان بگرنو سوود لەتاقیکردنەوەکانی ڕابوردوو وەربگرن .

ئامادەبوونی خۆیشم نیشاندا بۆ ئەوەی چیم پێبکرێ یارمەتییان بدەم. یارمەتیشمدان. بەلام دووبارە داوای لێبوردنم لێکردن کەمن کاری حزبی ناکەم! ئەو وەختەی لەئازادی بووین، جاربەجار، هاوڕێم فاروقی مەلا مستەفا ئەهات بۆلامان و چەند جارێکیش لەکەپرەکەی یەکێتی نووسەرانی کورد لای کاک حسەین عارف بینیبووم. لەو ڕۆژگارەدا ئەو نوێنەری قیادەی مەرکەزی بوو لەشاخ. بارەگای خۆیشیان هەبوو نزیکی گەلالە، چەند جارێکیش پێی وتم سەردانیان بکەم، بەلام ئیتر ڕێنەکەوت. کاک سامی شۆڕش، کە لەسەرەتای حەفتاوە ئەویش هەر لەناو ڕێکخستنی قیادەی مەرکەزیدا کاری ئەکرد. ڕۆژێکیان هات بۆلامان بۆ ئازادی. پاڵتۆیەکی عەسکەری درێژی لەبەردا بوو، کۆنە تفەنگێکیشی کردبوو بەشانیدا، لاوازو بێ هەناو، ئێمە زۆرمان پێخۆش بوو کە جارێکی تر سامی-مان بینییەوە، ئەو ڕۆژەو بۆ شەویش لەلامان مایەوە. هانماندا کە ئێرە شوێنی ئەوەو پێویستە بە ئێجگاری لێرە کار بکات، دوای پرس و ڕاکردنی بە حیزبەکەی و ڕەزامەندی وەرگرتنین بە تەواوەتی هاتە راگەیاندن.

ئەو خوێنەی تەنها
مەرگم ئەیگیرسێنێتەوە!..

ماڵی گەزیزەی خوشکیشم هاتبوونە مەریوان، لەدواییدا لەگەڵ ئەواندا پێکەوە خانوویەکمان بەکرێگرت. بەر لەهەرەسی ئازاری (١٩٧٥)، سەردانێکی پێنجوێنم کرد. چوومە لای ئەو دۆستو ناسیاوانەی لەهێزی خەباتدا پێشمەرگە بوونو شەوێک لای ئەوان مامەوە .

بۆ سبەی خۆمکرد بەچایخانەیەکدا، کاک عومەری سەید عەلی لەوێ دانیشتبوو. ئەو منی ناسیو بەگەرمی بەخێرهاتنی کردمو خولقی کردم کەبچینەوە بۆ ماڵەکەی، وەختێ چووینەوە بۆ ماڵەکەی، لەڕێگە پێیوتم لەگەڵ کاک شیهاب و کاک حەمەی مەلا سەعیددا، پێکەوە ئەژین، ئێمە لەدایکەوە خزمی نزیکی ئەوان بووین، کاک شیهاب-یش هاوڕێی خاڵە عومەرمو تێکەڵی ماڵی دایەخانم بوو. پێموایە لە ساڵانی (١٩٦٢-١٩٦٣)دا بوو، خاڵە ئەنوەرم دکتۆری عەسکەری بوو لەکەرکوک، هەر لەوێش ماڵی خۆی هەبوو. وابزانم بەبۆنەی جەژنێکەوە بوو لەگەڵ خاڵەکانم و کاک شیهاب و کاک نیهادی برایدا هەموومان چووین بۆ کەرکوک. چەند ڕۆژێ لەکەرکوک ماینەوەو بەیەکەوە ئەچووینە دەرەوە بۆ ناو بازاڕو لە شەقامەکاندا پیاسەمان ئەکرد، کاک شیهاب دەساڵێ لەمن گەورەتر بوو، چاکم لەبیرە ڕۆژێک لەیەکێک لەچایخانە گەورەکانی ناو کەرکوکدا دانیشتبووین، ژنێکی فاڵچی فاڵی ئەگرتەوە، من بانگم ئەکرد کاک شەهاب وتی (بڕوات بەم شتانە هەیە). وتم (نە ، بەلام بابزانین ئەڵێ چی!).

ژنه فاڵچییەکە دەستیشی ئەگرتەوە، کە دەستی بۆ من گرتەوە هەندێ قسەی کرد لەوانە وتی (تۆ لەدوا ڕۆژدا لەم وڵاتە نامێنیو بۆ ساڵانێکی دوورو درێژ ڕێت ئەکەوێتە دەرەوە. تۆ لە ژیانتا تووشی نەشتەرگەری گەورە نابیت) کە دەستی-شی بۆ کاک شیهاب گرتەوە پێیوت (تۆ زۆر بەناوبانگ ئەبیتو جگە لەوەیش تۆ مردنەکەت ئاسایی نابێت!). من زۆرجار بیر لەقسەی ئەو ژنە فاڵچییە ئەکەمەوەو ئەڵێم ئەو قسانە چیبوون ئەو ژنە کردنیو وایش دەرچوون!

ئەو شەوەی پێنجوینیش لەلای کاک عومەری سەید عەلیو خاڵە شیهاب و حەمەی مەلا سەعید مامەوە. کاک شیهاب زوو زوو پرسیاری کاژیک و "پاسۆک"ی تازە دروستبووی لێئەکردم. ئەیوت (پێویستە هەموومان بچینە بەرەپەکەوە). من هیچ حەماسەتێکم بۆ کاری حزبی نەبوو. ئەمویست باس باسی ئەدەب بێ ، بەڵام وەک دوایی زانیم ئەوان لەچەند ساڵ لەوەو بەرەوە خەریکی کاری نهێنی حزبی بوونو ئەو ماڵەیش ماڵی کاک حەمەی مەلا سەعید بووە، یان یەکێک بووە لەوەکرەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان .

گەڕامەوە بۆ مەریوان، دوای (٦)ی مارتو مۆرکردنی پەیمانی نێوان سەدامو شای ئێران لەجەزایر، ئیتر هەواڵەکان ناخۆش بووبوون، هەر لەو ڕۆژانەدا لەگەرووی هۆمەر ئاغاو بەرەکانی خوارەوە، گەورەترین شەڕی نێوان (پ. م) و سوپای عێراقی ڕوویداو پێشمەرگە قارەمانانە جەنگابوون .

واتە ئەو کاتەی کە دەنگ بڵاوبۆوە ئیتر ئێران پشتمان تێئەکا، (پ. م) ورەی بەرزتر بووبۆوە. ئێمە لەمەریوان بووین، وەختێ بیستمان مەلا مستەفا بانگکراوە بۆ ئێران. دوای یەک دوو ڕۆژیش دەنگ بڵاوبۆوە لەئێران دەستبەسەرە. ئەو ڕۆژانە دەیان هەواڵی لەیەک نەچوو دژ بەیەکمان پێئەگەیشت. بۆ نموونە: د. کەمال مەزهەرو کامەران قەرەداخیو کومەڵێ چوون بۆلای بارزانیو لە وەختێ قسەدا وتویەتی: (من وەختێ خۆی کە دەستمکردووە بەشۆڕش، بیست سی کەسێکم لەگەڵدا بوو، من تەنها ئەوەندەم ئەوێو ئەم قەرەباڵغییە زۆرەم لەدەور کەمبکەنەوەو هیچیتر) .

کاک نوری شاوەیس، کەوەک نوێنەری بارزانی هاتبوو بۆ ناوچەی پێنجوین، هەر ئەو قسانەی کردبوو. دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە ئێران، ئیتر هەواڵەکان تائەهات ناخۆشتر ئەبوون. هەر لەو ڕۆژانەیشدا بوو، وەک مامۆستا برایم دواتر بۆی گێڕامەوە، کە مەلا مستەفا ناردبووی بەشوێنیاو لێی پرسیبوو (چیبکەین باشە؟!) ئەمیش لەوەڵامدا پێی وتبوو (جەنابی مەلا مستەفا، تۆ وەختێ

ئەنێریت بەشوێن منداو پرسم پێئەکەی کە تابینەقاقامان هاتووە. بەلای منەوە، چار هەر ئەوەیە، تۆ وەک ڕەمزێکی شۆڕش بمێنیتەوەو هەقت بەسەر هیچەوە نەبێو کارەکە تەسلیمی ئێمە بکە. ئیتر خۆمان بەرپرسیار ئەبین لەهەموو شتێ) .

بەلام مەلا مستەفا ئەمەی قبوڵ نەکردبوو. چەندین کەسایەتی سیاسی و کۆمەلایەتیش وەک عەلی عەسکەری هەمان قسەیان لەگەڵ مەلا مستەفادا کردبوو. بەلام وەک لەدواییدا ڕوونبۆوە، مەلا مستەفا دوای بینینی شای ئێران، ئەو بەڵێنەی دابوو کە ئیتر کاری ئەو تەواو بوەو 'شا'یش چی پێوتووە ئەوە ئەکات! ئەو ڕۆژەی بەتەواوی جاڕی هەرەس دراو بروسکەکەی بارەگای بارزان گەیشت، لەبیرمە لەگەڵ فوئادی مەجید میسری-دا بەشەقامێکی مەریواندا پیاسەمان ئەکرد، ئەو، دەقی بروسکەکەی پێبوو، نازانم چۆن دڵم نەوەستا!. بروسکەکە ئەڵێت: (خۆتان بەئێران یان عێراق تەسلیم بکەنەوە). ئەو ڕۆژە ناخۆشترینو نائومێدترینو تاریکترین ڕۆژی ژیانم بوو .

منیش وەکوو هەزاران هەزاری تر کەوتینە ناو گێژاوێکەوە، نەمانئەزانی بەرەو کام چارەنووسی نادیار ملبنێین! سەرەتا بڕوامان نەکردو وەک خەوێکی ناخۆشو ترسناک ببینین وابوو. هەموو هیوایەکمان بوو بەژێر هەرەسی بڕیارێکی ڕوخاوی قیادەی سیاسی کوردەوە .

من تائەو ڕۆژە بگرە تائەو دەقیقەو سەعاتەیش کەئیتر بەتەواوی دڵنیابووم شۆڕشی ئەیلول-یان بەزیندوێتی ناشت. بارزانیم نەک هەروەک سەرکردەیەک، بەڵکوو وەک ڕەمزێکی گەورەی نەتەوەییو نیشتمانی تەماشا ئەکرد، وەک قارەمانی داستانێ بیرم لەوەش ئەکردەوە. تادواساتەکانیش پێموابوو بارزانی نەک ڕێگەی تەسلیم بوون، تەنانەت ڕێگەی خۆکوشتنو ئینتیحار نەک خۆ بەدەستەوەدان، ڕێگەی بەرگریی نەک ڕێگەی هەلاتن. بەلام مەخابن هەزارجار مخابن، ئەو ڕۆژگارانەی، کە ئێمە لە هەموو ڕۆژگارێکی تر زیاتر ئازایەتیو جوامێریی ئەومان ئەویست، ئەو کاتەی لەهەموو کاتێکی تر زیاتر، هەڵمەتو ورەی بەرزی ئەومان ئەویست، کەچی ئەو سومبولو ڕەمزەمان لەهەلاتندا بینییەوە. ئەو ڕۆژگارانەی میللەتێ بەگەورەو بچووکەوە ئامادەبوو لەدوای ئەوەوە بڕواتو خۆیشی بدا بەکوشت، بەلام ئەو ڕایکرد!. ئەو وەختەی ڕایشیکرد تەنانەت نەهات لەئێزگە کڵۆلەکەمانەوە خواحافیزیەک لە گەلە ستەم دیدەکەی بکات .!

ئیتر کام ئینسان، یان کام شاعیر، ئەگەر ویژدانی سەردەمەکەی خۆی بێت، ئەگەر بەڕاستی دەنگی هەق‌و دوا ڕۆژبێ، ئەتوانێ لەئاستی ئەم کارەساتە گەورەیەدا بێدەنگ بێ؟! ئەتوانێ خوێنی هەزاران شەهیدی ئەیلول و بۆکرپووزی جەرگی سوتاوی هەزاران دایک و باوک و منداڵ و پیری ئەم نەتەوەیە فەرامۆش بکات‌و قوڕوقەپ بەقەڵەمەکەی بکات‌و شەرمەزار نەبێ؟! من پێموایە ئەو نووسەرو شاعیرانەی ئەم کارەساتە نەیهەژاندن، هیچ شتێکی تر نایانهەژێنێ. پێموایە ئەو قەڵەمەی لە ئاستی ئەم هەرەس‌و بەزینەدا بێدەنگ بوو، دەستی بەکڵاوی خۆیەوە گرت بانەیبا، شایەنی ئەوە نییە ناوی ئەدیب‌و ڕووناکبیری لێبنرێ!. بەتایبەتی ئەو نووسەرو شاعیرانەی کەخۆیان لەناو گێژەنی کارەساتەکەدا بوون‌و بەچاوی خۆیان هەرەسیان بینی‌و بەگوێی خۆیشیان گوێیان لەجاڕی تەسلیمبوونەوە گرت!

کارەساتی هەرەسی (١٩٧٥)، بە قووڵی کاریکردە سەر لێکدانەوەو دڵ و دەروونم‌و لەبنج‌و بێخەوە ڕەگی ژیانی ڕاوەشاندم، گەلێ قەناعەتی چەندین ساڵەی پێشوومی هەڵوەشاندەوەو هی تازەتری لەجێگە دانان. بۆ ئەزموونی شیعری داهاتویشم بوو بەهەوێنی دەیان قەسیدەی کورت‌و درێژو هەتا ئێستەیش ئەو کارتێکردنە وەک شەپۆلی دەریایەکی هەڵچوو، ئەمهێنێ‌و ئەمباو هەموو جارێکیش برینێکەو ئەکولێتەوەو خوێنی تازەتری لەبەر ئەڕوا. ئەو خوێنەی بەتەنها مەرگم ئەیگیرسێنێتەوە هیچی تر نا.!

نە پێکەنین‌و نەگریانی شاعیر بەزۆر دروست نابێ!. لەسەر داوای هیچ کەسێک ئەو کانییانەی لەناخی شاعیردان هەڵناقوڵێن، تاخۆیان لرفە نەکەن و بەلووزەو نەڕژێنە دەرەوە، گوێ بەهیچ تکاو پاڕانەوەیەک نادەن. لەدایکبوونی ئەم شەپۆلانە، ئەم خەونانە، ئەم پرسیارانە، ئەم بارانانە، وەخت و سەعاتیان بۆ نییە. جاری وا هەیە بۆ زنەیەکی بچووک، بۆ زەردەخەنەیەک، بۆ تیلەی چاوێک، قەسیدەیەک لەدایک ئەبێ و جاری وایش هەیە بۆ زەریایەک یەت‌و کەچی ناوترێ! جاری وا هەیە بەلێزمە ئەبارێ و جاری وایش هەیە قەترەیەک لەو ئاسمانەوە نایەتە خوارێ. بەدرێژایی ساڵی (١٩٧٤) دوو سێ قەسیدەم نووسی. ساڵێکی وشک و بێ بارانی شیعری من بوو. کەچی دوابەدوای هەرەس و لەساڵی (١٩٧٥)داو لەمەنفای دەوری (هیت)دا، ئەمویست بەس بێ و کەچی "کۆچ" خۆشی نەئەکردەوە.!

هەر ئەو کاتەیش من ئەمزانی پیلانی جەزائیر گەورەیە، دوای ئەو ڕێککەوتنە شوومە، ڕەنگە بزنە ڕێیەک بۆ کورد نەمێنێتەوە، بەڵام ئیرادەی میللەتەکەمان بۆ بەرگریی و مانەوە دڕی بەهەموو شەوە زەنگ و نائومێدییەک ئەدا. ڕووداوەکانی دواتریش ئەوەیان سەلماند، کە لەڕۆژانی دوای هەرەس تاڵترو نائومێدتر هەبوون و کەچی بانگی ئازادیو موقاوەمەتیشی تێدا درایەوەو لەو تاریکستانەدا سەرلەنوێ چرایشی تیادا هەڵکرایەوە، ئەو کاتەی هەرەس ڕوویدا، کورد خاوەنی هەزاران هەزار پارچە چەکی سووکو بەسەدان پارچەی قورس بوو.

هەزاران کەس ئامادەی گیانبازی بوونو تاسەر مانەوە. بەسەدان ڕووناکبیر کاریان لەناو دەزگاکانی شۆڕشدا ئەکرد. شۆڕشی کورد خاوەن ملیۆنەها دۆلار بوو. هەر بەو زەخیرەی چەکو خۆراکەی لەو کاتەدا هەبوون. ئەتوانرا بۆ ماوەیەکی زۆر، درێژە بەموقاوەمەت بدرێ. بەڵام نەکراو لەوەختی هەرەسدا تۆپێکت بەنانو کەبابێ ئەکڕی!

من؛ ماوەی شەش مانگێک زیاتر بوو لە هاوڕێکانم دابڕابووم؛ ناو بەناو هەواڵیان پێئەگەیشت. گۆڤاری نووسەری کورد، پێموایە یەکدوو ژمارەی لەشاخ لێدەرچووە. هەر سەیدا یوسفی-ش سەرۆکی یەکێتی نووسەران بوو، حسەین عارف-یش کاروبارەکانی ئەبرد بەڕێوە. دوو نووسەری هاوڕێشمان لەو ماوەیەدا لەلایەن هێزەکانی پاراستنەوە گیرابوون، ڕەووف بێگەردی چیرۆکنووس، پێموایە، لەسەر کورتە چیرۆکێکی کە ڕەخنە لە بونیادی شۆڕشەکەو کاربەدەستان ئەگرێو بۆ ماوەیەکیش زیندانی کرابوو. هەروەها حسەین عارفی چیرۆکنووسیش کە لەلایەن پاراستنەوە بانگرابوو، بەڵام ئەم، سەیدا یوسفی زووتر فریای ئەکەوێو بەر ئەدرێ. ئەوەی ڕاستیبێ لەشۆڕشی ئەیلولدا مشەخۆرو دزو کاربەدەستانی گەندەڵیش زۆر هەبوون! کەمیش نەبوون. بەرایی دیموکراتیو ئازادی ڕادەربڕین ئێجگار تەسکو سنووداربوون، ڕەخنەگرتن لەسەرکردایەتی و ئامرهێزو کاربەدەستان نەک هەر ڕێگە پێنەئەدرا، بەڵکوو ئەوەی بیکردایە چارەنووسی نادیار ئەبوو. لێپرسینەوە زۆر کەمبوو، پارەوپول سەرفکردن کەس نەیئەزانی چۆنە و چی ئەکرێ. لە مانگەکانی دوایی شۆڕشی ئەیلولدا پرسیار ئەکراو وەڵامی نەبوو، کار گەیشتە ڕادەیەک، ئەوترا "بارزانی خۆی ئەزانێ چی ئەکات". دەزگای پاراستن بووبووە مێردەزمەیەک

بەسەر خەڵکییەوە، بەسەدان ڕاپۆرت نووسی هەبوون‌و زۆرجاریش ناکۆکی شەخسیی ئەکرایە بیانوویەک بۆ ناکۆکی سیاسی‌و تووشکردن .

ئەو کاتەی لەئازادیی هەڵماندابوو، هەردوو دوو یان سێ سێ لەژێر چادرێکدا بووین، چادرەکەی کاک ئەنوەر شاکەلی شاعیرو لەتیف هەڵمەت‌و پێموایە سەلام محەمەدی شاعیر، نزیکی ئێمە بوو، وێنەیەکی گەورەی ماوتسی تۆنگ-یان هەڵواسیبوو، کاک ئەنوەر کە (دوایی ناوی خۆی گۆڕی بۆ فەرهاد) لەچەپە هەرە توندڕەوەکان بوو. هەر لەو ماوەیەدا دوو سێیەک لەوانە لەلایەن پاراستنەوە بانگکرابوون بۆ ئەوەی هاوکاریان بکەن. ئەوەی کە من بیزانم کاک سەلام محەمەد چووبووە ژێر ئەمکارە، کەهەرگیز کاری ئەو نەبوو، ناردبوویان بۆ بەغدا بۆ ئەوەی کاربەدەستێکی گەورەی میری لەناوبەرێت. بەڵام لەوێ دەزگای ئەمنی عێراق پێی زانیبوو. سەلامیان گرتبوو، بەڵام دواتر ئینجا ئەوان لەبەغداوە بۆ کارێکی خۆیان ڕایانسپاردبوو، کە لەناو شۆڕشدا بیکات. وەختێ دێتەوە پاراستن ئەیگرێ. سەلام محەمەد تاڕۆژەکانی دوایی هەرەس هەر لە زینداندا ئەبێ‌و دوایئەوەی هەموو شتێ کۆتایی پێدێت ئینجا بەریاندابوو!

لەکۆتاییەکانی شۆڕشی ئەیلولدا، ئێمە لەمەریوان بووین‌و ئەمانبیست کەزۆر لایەن‌و کەسایەتی ناسراو بەتەمای ئەوەن ئەگەر قیادەی بارزانیش وازبێنێ، ئەوان وازناهێنن‌و موقاوەمەت ئەکەن‌و ئەمێننەوە. ئەوەی لەهەموویان سورتر بوو لەسەر ئەم بەرگرییە کۆمەڵەکەی قیادەی مەرکەزی بوون کە کاک فاروقی مەلا مستەفا سەرکردایەتی ئەکردن. ئەمە جگە لەدەیان‌و بگرە سەدان پێشمەرگەو خەڵکی تر .

ئێمە لەمەریوان بووین، کە بیستمان کاک فازڵی مەلا مەحمود، بەمەبەستی مانەوەو موقاوەمەت بەتایبەتی لەدەرەوەی وڵاتەوە گەڕابۆوە بۆ هەماهەنگی کردن لەگەڵ قیادەی مەرکەزیدا. بەڕاستی خەلکەکە نەیئەویست هەروا بەئاسانی دەستبەرداری شۆڕش بێت. لەهەموو لایەکەوە جموجووڵ دەستپێکرد بوو. لەناوچەی پێنجوێنیش، پەیوەندییەکی زۆر بەکاک فەتاح-ەوە ئەکرا بۆ ئەوەی بمێنێتەوەو خەڵک‌و پێشمەرگەیش ئامادەبوون شوێنی بکەون. تەنانەت من بیستم، کە خاڵە شیهاب و کاک ئارام بەتایبەتی سەردانیان کردووە بۆ ئەوەی درێژە بەشۆڕش بدات‌و ئەمانیش هەموو هاوکارییەکی بکەن، بەڵام وەک سەرئەنجام ئەم قسانە هەمووی بوونە بلقی سەر ئاوو بارەگای بارزانیش بەتوندی هەموو نیازێکی لەو جۆرەی ڕەتئەکردەوە. وەک لەدواییشدا باسی

ئەکەم، ئەو کاتەی ئێمە گەیشتینەوە سلەیمانی، کاک فاروقی مەلا مستەفا چەند ڕۆژێ پێشتر گەیشتبۆوەو خۆم چووم بۆلای بۆ ماڵەوە.

هێشتا ئێمە لەمەریوان بووین، بیستمان لەگەڵ کۆتایی هێنان بەشۆڕشی ئەیلولو جاڕدان بۆ تەسلیم بوونەوە بەعێراق یان بە ئێران، ئاڵەو مەرگەساتانەدا تراژیدیایەکی کەم وێنە ڕوویداوە، ئەویش لەناوبردنی حەمەد ئاغای مێرگەسووریو فاخری کوڕیو کوڕەکانی تری بوون، کە ماوەیەکی دوورو درێژ بوو لەزینداندا بوونو کەچی ئاشبەتاڵێکی واگەورە نەبووە هۆی دڵپاکبوونەوەو لێبوردن! ئەمە لەوەختێکدا کە تروسکاییەک هیوا بۆ هیچ کوردێ لەهیچ ئاسۆیەکەوە بەدی نەئەکرا.

کۆست بوو؛ کۆستێکی گەورە، کۆستی میللەتێک، ڕۆژانە لە مەریوان هەر بەیەکدا ئەهاتین، چی بکەینو چی نەکەین؟ ڕوو لە کوێ بکەین؟ تەسلیم بەکام لا بینەوە؟!

پروپاگەندەی سەیر سەیریش بلاوبووبووە، لەوانە گوایە کۆمەڵێک بەرەو سلەیمانی گەڕاونەتەوەو بەلام لەسەید سادق هەموویانیان گوللەباران کردووە!. یان ئەوانەی بەرەو ئێران ئەڕۆن هەموویان ئەنێرن بۆ سەر سنوری ئەفغانستان! ئەو ڕۆژانە ڕۆژی شپرزەییو دڵەڕاوکێو گومان و نادڵنیایی بوو .

دوای نەورۆزی (١٩٧٥) بەبێ هیچ دوو دڵییەک گەیشتمە ئەو ئەنجامەی لەئێراندا نەمێنمەوەو ڕووبکەمەوە شارەکەی خۆم. بەو جۆرە مەریوانمان بەجێهێشتو هاتینە پێنجوین. ئەو ساتەوەختانە پێنجوین شاری بێ ساحێبو بۆنی خوێنی لێئەهات. ئای ج کارەساتو ج پاشا گەردانیو ج ڕاوو ڕووتێک بوو، بەچاوی خۆم ئەمبینی ج فڕان فڕانو کێشکردنی کەلوپەلی تالانکراوی دوا فرۆشگایە!. ج شەڕکردنو بگرەو بەردەیەکە، لەسەر پچڕاندنی گۆشت کەلاکی شۆڕشی ئەیلول!. هەر ئەوە نەبوو کوێراییم دانەیەت، وەختێ ئەمبینی پێشمەرگە چەکەکەی خۆی لێ تەوقەو دەستەو ئەژنۆ دانیشتووەو سەرلێشێواو و نازانێ چیبکات! هەر کاروانی ڕەوکردووی خەڵکی پەراگەندە بوو، ڕیزێ بەرەو ئێران و ڕیزێ بەرەو عێراق. پێنجوین خۆڵی مردووی کرابوو بەسەردا. کەس لەکەس دڵنیانەبوو. برا متمانەی بە برا نەئەکرد. زۆر کارێکی ئاسایی بوو، لەسەر قسەیەک سەرت ببڕن، کێ بەکێ بوو، کێ لەکێی ئەپرسییەوە؟!

بەرلەوەی مەریوان بەجێبێڵم، ئەو کەلوپەلەی هەمبوو بەپارەیەکی کەم فرۆشتم. دە دیناریشم بەقەرز لەخزمێ وەرگرت تاپێی بگەینەوە سلەیمانی. ئەوەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە دوایئەوەی گەیشتینەوە سلەیمانی، ئەو خزمە لەناخۆشترین کاتی لێقەومانو نەبوونیدا ناردبوویەوە بۆ دە دینارەکەی. ناچار دە دینارم لەیەکێکی تر قەرز کردوو ئەوی ئەوم دایەوە.!

لەپێنجوین-ەوە ماوەیەک بەسواری ئۆتۆمبێلو لەوەو دوایش ماوەیەک منداڵ بەکۆڵەوەو بەتوولە ڕێیەکی ئەملاو ئەولا بەئەڵغام چێنراودا ڕۆیشتینو ئینجا بەتراکتۆر تاگەیشتینە سەید سادقو لەوێ جاشەکان ئەهاتن بەپیر خەڵکەوەو لەماڵان دایانئەمەزراندن .!

ع دەورانێکە سەر بکەیتەوە بەکۆشی نامەرداو، بەدەستی خۆت چارەنووسی خۆت بەریتەوە لای خوێنخۆری خۆت.!

گەیشتینەوە سلەیمانی؛ بەلام سلەیمانی بەئاسمان و دارو بەردو شەقام و کۆلان و درەختو خەلکەکەیەوە، هەر هەموو غەمگینو پرسەدارو دەستەوئەژنۆ بوون. ئەمبینی سلەیمانی ئەگریا! ئەمبینی درەختەکان ئەگرین، شەقامەکان زەردو مەلولو ئەو خەلکەیش وەک خوێن گرتبنی، ئەبلەق بووبوونو بڕوایان نە ئەکرد، بەوەی کەبەڕاستی ڕوویداوە. پەناو دالدەی خۆم نەبوو. ڕوومکردەوە مالی خەزوورمو ژووریکیان داینێ.

ئەوانەی ئەگەیشتنەوە شار، ئەبوو بچنە مۆلگەیەک لەو مۆلگانەی بۆ "عائدون" تەرخانکرابوون، تا لەوێ ئەنکێتی تایبەتی بەتەسلیم بوونەوە پڕبکەنەوە، ئینجا بچنەوە مالی خۆیان. من هەر خۆم ڕوومکردە یاریگای سلەیمانیو ڕوومکردە چادرێک، تەماشام کرد کۆمەلێ برادەرو ناسیاوی نزیک لەوێ دانیشتوون، یەکێکیان لەوانە کاک سەروەت چاوشین (کوردۆ عەلی) بوو، لەگەل چەند هاوڕێیەکی تر. هەموومان ئەژنۆشکاو بووین، ئاپۆرەی خەلکەکە لەوەدا نەبوو، بۆیە من بێزار بوومو چوومە دەرەوە. بۆ سبەینێ "ئەژی گۆران"ی هاوڕێم بینی. ئەژی لەو ڕۆژگارەدا لەگەل "حزبێکی کارتۆنی سەر بە بەعسدا کاری ئەکرد". پێیوتم (با بڕۆین، شوێنی کەوتمو خۆیکرد بەئەمنی سلەیمانیداو لە پرسگەکە دەمانچەکەیان لێوەرگرتو چووینە ژوورەوە) .

دەیان کەسی تریش لەوێ بوون، ئیستیمارەیەکمان هەڵگرتو هەر ئەژی خۆی بۆی پڕکردمەوەو تەسلیممان کرد. ئیستیمارەکە بۆ زانیاری بوو لەسەر ئەو کەسە، ناوی تەواوی خۆی و دایکی و باوکی، پیشەی بەرلەوەی چووبێتە دەرەوە، ناونیشانی تەواوی لەم جۆرە زانیارییە ئاساییانەو هاتینە دەرەوە.

لەوکاتەدا بیرم ئەکردەوە: من "عائدون" و ئەژی سەر بەسوڵتەو هۆم کەوتۆتە ئەو و بەناچاری ئەبێ شوێنی بکەوم. کوڕی گەورەترین شاعیری کورد کەوتۆتە ناو ئەم زەلکاوەوە! خەفەتم بۆ ئەخوارد، بەڵام من لەدڵی خۆمدا، بڕوام وابوو، ئەم تەنگانەیە تاسەر نابێ‌و ڕەنگە ڕۆژێ لەڕۆژان، من لەشوێنێکی پڕ لەسەروەریی‌و سەربەرزیدا، بەفریای ئەژی بکەوم‌و لەدواییشدا هەروا دەرچوو!

ئەو دوو سێ مانگەی دوای هەرەس، لەبێ هیوایدا، هەموو شتێ لەبەرچاوم ڕەش ئەینواند، بەتایبەتی وەختێ ئەمبینی ئەو خەڵکە چۆن ورەیان ڕووخاوەو چۆکیانداداوەو چ پێوانەیەک بۆ ڕەوشت نەماوەو بەشێکیشیان بەئاشکرا بوونەتە چاوساغی بەعس‌و بەچوارپەل سەمای بۆ ئەکەن.

شیوعییەکانی ناو بەرەی نیشتمانی‌و پێشکەوتنخوازی، شەریکەکانی بەعس، گوڕەی داوێنیان بوو. چیشیان لەدەستهات لەڕاوەدوونانی پێشمەرگەدا لە (١٩٧٤)دا کردیان، لەتەمەنی هەرزەکاریی‌و سەرەتای لاوێتیدا، دوای شۆڕشی چواردەی تەمموز.. حەمە ساڵح، کە بە (حەمە ساڵح هیتلەر) ناوی دەرکردبوو، یەکێک بوو لەهاوڕێکانم، ئەم کوڕە: یەکێک بوو لەگەنجە خوێندەوارەکانی ئەو سەردەمە. بەردەوام خەریکی خوێندنەوە بوو، بەردەوام لەکتێبخانەی گشتی سلەیمانی ئەتبینی. لەو ڕۆژگارەدا، من کتێبی هیگڵ‌و شۆپنهاوەرو فیختەو ڕۆسۆم بەدەستەوە ئەبینی. هێمن‌و لەسەرخۆ بوو، لەقسەکردنیشدا، زمانی کەمێک فس بوو. قژی بەجۆرێک دائەهێنا، کە لەقژی هیتلەر ئەچوو. ناوبەناویش ئەهاتە چایخانەکەی حاجی ساڵح لەشەقامی مەولەوی‌و ناسیاویشی لەگەڵ عەبدوڵلا جەوهەردا هەبوو. خۆی مامۆستا بوو، لەچەنەبازو خۆدەرخەرەکان نەبوو. دوکانەکەی باوکی بەرامبەر دەرگای کۆنە شارەوانی سلەیمانی بوو، ناوبەناو ئەگەر باوکی لەوێ نەبووایە. دوکانەکەی بەڕێوە ئەبرد. من یەکدوو جارێکیش چووم بۆ ماڵیان. لەوکاتەدا بۆ خۆی کتێبخانەیەکی باشی لەماڵەوە پێکهێنا بوو، وەک ئەگێڕنەوە لەساڵی (١٩٧٤)دا بەڕاپۆرتی شیوعییەکان دەستگیرکراوەو دواییش هەر لەهەمانساڵدا بەعس لەسێدارەیدا.

عیزەت–ی مامۆستایش کە (بەعیزەتە خڕە) ناسراو بوو، ئەویش گەنجێکی خوێن گەرمی نەتەوەیی بوو، لەکاتی خۆیدا لەناو کاژیکیشدا بووە. وەک ئەگێڕنەوە ئەویش هەر لەسەر خەبەردانی شیوعییەکان دەستگیر ئەکرێو لەدواییدا لە سێدارە ئەدرێ.

دوای گەڕانەوەیشمان بەماوەیەکی کەم، موکەڕەم تاڵەبانی، وەزیری بەعس، وتارێکی بڵاوکردەوە بەنێوی "اشداء علی الکفار رحماء بینهم!".. ئەو وتارەی پەڵەیەکی ڕەشە بەنێوچەوانی خۆیو حزبەکەیەوەو بۆ ئێمەیش کولاندنەوەی برینێک بوو، لەسەروەختێکدا، کە هەرچی دەسەڵاتو چارەیەک هەیە نەمانبوو، لەوە زیاتر هەر هەناسەی بەدیارەوە هەڵکێشین.

ئەو دوو سێ مانگەی دوای هەرەس، هەر لەسلێمانی بووم. هەموو شتێ تەڵخو ڕەشو بێ ترووسکە بوو. بێزارو وەڕس .!

لەناچاریدا پەنام بردبووە بەر مەی خواردنەوەیەکی زۆر لەڕادەبەدەر. ئەو ماوەیە نەمئەتوانی نەبخوێنمەوە نەبنووسم، بەڵام زەریایەک لەئەندێشەو خەیاڵ لەسەرمدا پەنگیان خواردبۆوە. شیعریش ڕەشپۆشو بێ جریوەو زەردەخەنە بوو، وەک خۆم بیرمە دووسێ ڕۆژ بوو گەڕابوومەوە. شەوێکیان کاک محەمەدی کاکی حسەین عارف لەماڵی خۆیان دانیشتنێکی دروستکرد، ئەوو حسەینو من. وردە وردە ئەمانخواردەوە، من زۆر پەستو دڵتەنگ بووم، کاک محەمەد پێیوتم (گوێ مەدەرێ. دنیا هەروا نابێ، ڕۆژێکیش دێ بەپێچەوانەی ئەمڕۆوە دڵمان خۆشئەبێو پڕ ئەبینەوە لەهیوا، سەری ئاسمانیش بەپووش نەگیراوە!).

لەو ڕۆژگارانەدا، ئەوانەی فەرمانبەرو مامۆستا بوون، چاوەڕوانی ئەوەبوون کەی ئەخرێنەوە سەر وەزیفەکانیان. ڕۆژانەیش لیستی ئەو ناوانە بەدیواری سەرای سلەیمانییەوە هەڵئەواسران. منیش یەکێک بووم لەوانەی چاوەڕوانی ئەوەم ئەکرد کەی ئەگەڕێمەوە سەر کارەکەی جارانی خۆم، لەزانکۆی سلەیمانی. لیست لەدوای لیست هەڵئەواسرا، بەڵام ناوی هەندێکمانی تێدا نەبوو. هەتا ڕۆژێکیان پۆستێکی ڕەسمیم پێگەیشت، وەختێ کردمەوە بەئیمزای تەها یاسین ڕەمەزان ناوی دە فەرمانبەری زانکۆی تێدا بوو، کە هەریەکەو بۆ پارێزگایەکی خواروو نەقڵ کرابوون. منیش یەکێک بووم لەوانو هەڵدرابووم بۆ پارێزگای ڕووماد‌ی، قەزای هیت، ناحییەی بەغدادی. لەناو ئەو کۆمەڵە ئەدیبو نووسەرەدا

که ڕۆژی یانزەی ئازاری (١٩٧٤) پێکەوە ڕوومانکردە دەرەوە، سێ کەسمان دوورخراینەوە، مستەفا سالح کەریم و ئەمین میرزا کەریم و من.

کەواتە ڕۆژگارێکی نادیارو چارەنووسێکی تەمومژاوی چاوەڕێمە، ئەبێ خۆمی بۆ ئامادەبکەم‌و بەپێی خۆم بەرەو پیری بچم. چونکە ئەو شاخ و داخەیش نەمابوون کە پەناو پشتی ئێمە بوون لە ڕۆژگارە تاریکەکاندا، هیچ نەمابوو، ئەوە نەبێ کەتەسلیم بەقەدەری خۆت بیت.!

دەستمانکردەوە بەهاتوچۆی یەکێتی نووسەرانی کورد، کە لەو سەردەمەدا ئەویش ماتو خامۆش ببووەوەو دەستەیەکی تر ئەیانبرد بەڕێوەو ئەژی گۆران هەموو شتێ بوو.

ئەو دوو سێ مانگەی دوای هەرەس، پەنجەم گۆی نەئەکرد بنووسم و شەوانە بەزۆری لەگەڵ حسەین عارف-دا بوومو پێکەوە ئەچووین بۆ یانەی فەرمانبەرانو پەنایەکمان هەڵئەبژارد، تا کەسی نەمانبینێ. کاک حەمە سدیقی محامی هاوڕێی کۆنمان بوو، لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردییەوە یەکترمان ئەناسی، کوڕێکی قۆشمەو قسەخۆشو دەستودڵ ڕەنگین بوو. بەهۆی کاری پارێزەرییەوە باری ئابووری لەهەموومان باشتر بوو .

لەو سەردەمەدا ئەو خاوەن ئۆتۆمبێلی خۆی بوو، ئەوەی ڕاستیبێ حەمە سدیق گوێی نەئەدایە ماڵی دنیاو بۆ دڵخۆشی خۆیو ئێمەیش درێغی نەئەکرد. بۆ شەوانەمێژ، هەموومان قەرزاری ئەوین. چەندینجار پێکەوە سەفەری شارەکانی کەرکوکو هەولێرو بەغدامان کردووە. هەر کۆڕێ حەمە سدیقی تیابوایە پێکەنینو قسەی خۆش لەوێ بوو، دەرگای ماڵی کراوەبوو. یارمەتی هەژاران و لێقەوماوانی ئەدا. جۆرە گەرمو گوڕییەکی هونەریشی خستبووە ناو کۆمەڵی هونەر و وێژەوە. چەند دەقێکی تەنز ئامێزیشی نووسیو نمایشکرا "کێچ" یەکێک

بوو لەوانە. لەسەرەتای حەفتاکاندا، بەعس کەوتە کارکردن بۆ ئەوەی لەناو ڕووناکبیراندا جێ پێیەکی خۆی لەکوردستاندا بکاتەوە. پارێزگاری سلەیمانی "شکری الحدیثی" یەکێک بوو لەوانەی بەرەو ڕووی ئەمکارە کرابۆوە. حەمە سدیق کەوتە ناو ئەم ئەڵقەیەوە، بیرمە ئەو یەکێک بوو لەوانەی ئەیوت: "سەدام کاستڕۆی عێراقە" سەدام چەپی پێشکەوتووی ناو بەعسە"، لەو سەردەمەدا نەک ئەو، بەڵکوو چەندین نووسەری کوردی ناسراو لەبەغدا کەوتنە تەرجەمەکردنی نامیلکەکانی سەدام بۆ زمانی کوردیو تەنانەت دووسێیەکیان بەئاشکراو بێ هیچ پەردە پۆشیەک بەرکریان لەسەدامی کاستڕۆی عێراق ئەکرد .!

ئەو کاتەی شۆڕشی ئەیلول هەرەسی هێناو وەختێ ئێمە بووینە "عائدون"و گەڕاینەوە سلەیمانی، حەمە سدیق ئەندامی ئەنجوومەنی تەشریعیو لەدواییشدا بوو بە ئەمینداری گشتی کشتوکاڵ، ڕۆژی ئەو بوو .

بیرمە ئەهات بۆ یانەی فەرمانبەرانو لەهەر پەنایەکدا بووینایە، ئەیدۆزینەوە.

حەمە سدیق شیعری هەجوێشی ئەنووسی. ئەو ڕۆژگارانە بەئێمەوە گرتبووی. هەموو ڕۆژێ بەناوی گاڵتەوە شیعرێکی پڕ لەجنێوی پێشکەش ئەکردین. یەکێک لەو شیعرانە ئاوا دەستیپێئەکرد: "پار لەمارتا/ قوڕێکی خەست گیرایەوەو/ کرا بەسەری پارتا...هتد". لەهەجویەکی تردا ناوی من و کاکە مەم و خورشید شێرە ئەهێنێ و دامان ئەشۆرێو ئیتر بەمجۆرە بەرۆکی بەرنەئەداین .

شەوێکیان پێموت: (ئاخر کاکە خۆ منیش شاعیرم). پێیوتم: (ڕاست ئەکەیت بەڵام تۆ ناتوانی لەمجۆرە شیعرانە بنووسیت، من شێخ ڕەزای عەسریم). لەو دەقیقەیەوە، بڕیارمدا شیعرێک بنووسم .

حەمە سدیق لەهەولێر بوو، بەڵام زوو زوو ئەهاتەوە بۆ سلەیمانیو بەمنو حسەینی ئەوت: حەز ئەکەم سەردانی هەولێر بکەنو لەماڵەوە میوانداریتان بکەم. ڕۆژێکی هاوین بوو، لەژوورەکەی ماڵی خەزورما، دەستمکرد بەنووسینی شیعرێکی هەجوو بۆ حەمە سدیق. وەک بێتەوە بیرم هەشت نۆ لاپەڕەی فۆلسکاب ئەبوو، ئەوە یەکەم نووسینم بوو دوای هەرەسی ئەیلول. بەهەرحاڵ دوای ئەوەی تەواومکرد، بڕیارمدا جارێ بۆ کەسی نەخوێنمەوە تاکاتو شوێنی لەباری خۆی دێت. هەفتەیەک دواتر بەسەردان چووین بۆ هەولێر، ئەو ڕۆژە بە کاکە مەم و حسەینم وت شیعرێکی وام نووسیوەو لەوێ گوێتان لێئەبێ. بۆ ئێوارە لەماڵی حەمە سدیق بووینو لەچیمەنەکەیاندا مێزی ڕازاندبۆوە، ئێمە

ئەوەندە نەبوو دانیشتبووین، لەپڕێکدا بابەکر ئاغا–ی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەشریعی–ش هات. من لەوەوپێش ناسیاوییەکی وام نەبوو لەگەڵیدا، بەلام بابەکر ئاغا لەپیاو خراپان نەبوو. چەندیشی بۆ کرابێ لەو ئاخۆران‌و بخۆرانەدا، یارمەتی خەڵکیداوە. پەرداخەکانمان هەڵبڕی‌و دەستکرا بەخواردنەوە .

هێشتا لەنۆشی یەکەمدا بووین حەمە سدیق دەستیکرد بەباخەڵیاو کەوتە خوێندنەوەی شیعرەکانی خۆی، لەدووەم پەرداخدا، ڕوومکردە هەمووان‌و وتم (ئێ ئێتر منیش هەقی خۆم نییە شتێک بڵێم؟!). هەموو وتیان (بەڵێ هەقی خۆتە!). تەواوی هەجۆکەی خۆم خوێندەوە. بەداخەوە ئەو دەقە ئەوەندە ئەم دەست‌و ئەو دەستیکرد، ئێتر دەست خۆم نەکەوتەوە. مەحمود زامدار ئەڵێ، (بەڵێ ماوە)، بەلام من بۆ خۆم پێموایە بزربووە .

بەهەرحاڵ ئێستا تەنها چەند کۆپلەیەکی کەمیم لەبیرماوە. داشۆرینەکە بەمجۆرە بوو:

لە هەولێرا

هەر ئەندامی ئەنجوومەنەو

خۆی ئەگەڕێ بەشوێن کێرا

حەمە سدیق

ئێستە پێشڕەوی نەسرەوتی گاندەرانە

قنگی لەوەرگەو دەروازەی

حوکمی زاتی لمنطە کردستانە.!

حەمە سدیق خۆی ئەزانێ کێری ئێمە چەند چەتوونەو

قنگی ئەوان چەند جەیحونە

بەرەحەتی جێگەی هەزاران هەزاران

ئەلە سوورەی عائدونە!

*

هەروەها لە پارچەیەکی تردا ئەڵێم:

دوێنێ لە پشتی زیلێکدا

بینم قنگی حەمە سدیق

وەکوو تایە دابەستراوە

پرسیم چییە؟!

وتیان ئەبێ تەسفیرکرێ و تەهجیر کرێ

لەبەرئەوەی لە کەرکوک و خانەقیندا

گانی داوە!

*تەصەورکەن.. تەصەورکەن

هەرچی ستوونی چادری پەنا بەرانی ئێرانە

بوون بەکێرو بەشوێن حەمەدا ڕائەکەن.

*

یان:

کاکە حەمە ئەو ڕۆژە دێ

بەکێری بابەگورگوڕی ئێمە

قنگی ئێوە گەرمدابێ

*

دوای خوێندنەوەی ئەم پارچانە یەکەم کەس بابەکر ئاغا هەڵیدایەو بەحەمەی وت (حەمە سدیق ئەبێ تەسلیمبیت). هەروەها وتی (کاک شێرکۆ ئەمە هەر هەجوو نییە، ژێرکاسەیشی زۆرە). وتم: (بەڵێ وایە) .

پاش قەیرێ وتی: (من هەموو جارێ گوێم لەڕادیۆکە ئەگرت کە شیعری بۆ بارزانی‌ت ئەخوێندەوە). من پێموابوو ئەیەوێ پلارم تێبگرێ، بۆیە وتم: (کاک بابەکر جوانترین شیعر کە نووسیبێتم ئەو شیعرەیە!). لە وەلامدا وتی: (من مەبەستم لەهیچ نەبوو، ئەوە نەبێ بڵێم منیش پێمخۆش بوو).

ئەم هەجووە دەستاو دەست ڕۆیشتو لەبەری نووسرایەوەو گەیشتە ئەورووپاش، کەوتبووە لای د. کەمال فوئادیش، بەکورتی لەو کاتەدا زاخاودانەوەیەکی دڵ و دەروونی تێدابوو، چونکە نەک هەر هیچ نەمابوو، بەڵکوو دوژمنو هێزەکانی بەعس گەیشتبوونە دوورترین گوندی سەر سنووریش. خەڵکی نەفس نزمیش خۆیان ئەچوون و ئەبوونە بەعسی.

دوایئەوەی گەڕامەوە سلەیمانی، دووسێ ڕۆژی نەخایاند، فەرمانی نەقلەکەم خستە گیرفانمەوەو جانتایەکی سووکەڵەم بردوو بەرەو بەغدا کەوتمە ڕێ .

ئەو شەوە لای یەکدوو هاوڕێی خۆشەویست مامەوەو بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتمە ڕومادی، لەسەر شەقامە سەرەکییەکەی ڕومادی، هەندێ کوردی خەڵکی سلەیمانیم بینی. ئەوانیش فەرمانبەربوون‌و بۆ ئەوێ هەڵدرابوون. چوومە پاریزگای ڕوومادی‌و لەسەر ئەو فەرمانە، فەرمانێکی تریشیان بۆ دەرکردم و وتیان بچۆ بۆ "هیت ".

تا ئەوکاتە ناوچەی "هیت"م نەبینیبوو، گەیشتمە شارۆچکەی هیت. لەقەزا نەئەچوو، گوندێکی گەورە بوو. چوومە قائمقامییەت، فەرمانەکەیان بردە لای قایمقام. پاش تۆزێ بانگی کردم. پیاوێکی ڕەقەڵەی ڕەشتاڵە، پێیوتم: (تۆ فلانی و لەعائیدونی)، وتم (بەڵێ). شۆفێرێکی بانگکردو وتی: (بیبە بۆ بەغدادی) .

"بەغدادی" لە هیتەوە هەر نیو سەعاتێ دوورە، وەختێ گەیشتم دەمەو نیوەڕۆ بوو، بەسەر بەرزاییەکەوە، مەخفەرێکی گەورە قوت ببۆوە، بەڕێوەبەرێتی ناحیەیش هەر لەم قوللەیەدا بوو. لەبەشێکدا ژووری بەڕێوەبەرو ژووری مەئمور مال و ژووری کاتبی ناحیە، لەو لایشەوە ژووری پۆلیسەکان و ژووری تەوقیف و ژووری ئەمنی ناحیەکە. کە چوومە ژوورەوە، بەردەستێکی

عەگال بەسەر لێم وردبۆوە، لێم پرسی مودیر ناحیە لەوێیە؟ وتی: (نە ئیجازەیە)، بەلام "ئەبو سەعد" لەوێیە، کە مەئمور مال بوو، وەکیلی مودیریش بوو. خۆمکرد بەژوورەکەیدا، سەلامم کردو فەرمانەکەم دایە دەست. خوێندییەوەو بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم .

"ئەبو سەعد" تەمەنی لەسەروو پەنجاوە ئەبوو، قژ سپی و سوورکەلەبوو. وتی: (سبەینێ ئەبو نەوفەل دێتەوە). بۆ ئێوارە پێخەف و بەتانی و سەرینیان لە ماڵی ئەبو سەعدەوە بۆ هێنامو هەر لە ژوورەکەی خۆمدا (ژووری کاتب ناحیە)، کە بەڕۆژ کارم تێدا ئەکرد، بەشەو لەبەردەمی مێزەکەدا پێخەفەکەم ڕائەخستو ئەنوستم. وەک لەدواییدا زانیمو خۆی بۆیگێڕامەوە: (ئەبوسەعد لەشانەکانی سەرەتای دروستبوونی حزبی بەعسدا کاریکردبوو)، بەلام دواتر وازی هێنابوو، پیاوێکی ڕووخۆش بوو. بەلام قومارچییەکی بێ وێنە بوو. پێموایە نزیکەی دە دوانزە منداڵی هەبوو، هەموو شەوێ ئەیخواردەوە. هەموو خەڵکی ناوچەکەی ئەناسی. ئەم پیاوە بوو بەهاوڕێیەکی نزیکم و دووسێ ساڵ دراوسێی بووم .

نەوفەل؛ مودیری ناحییەکە کەناوی تەواوی (نهاد کاظم الدجیلی) بوو، خەڵکی دوجەیلی نزیک تکریت بوو. لە کۆلیجی قانون دەرچوو بوو. ئەمیش بۆ خۆی وەک نیمچە دوورخراوەیەک وابوو. لەدواییدا زانیم، خزمێکی نزیکی "حردان تکریتی"یە، بەلێدانو کوشتنی حردان تکریتی، ئیتر ئەمانیش پەرەوازە کرابوون. بەناچاری بووبوو بە بەعسی، دوای ئەوەی ئەیخواردەوەو هەر خۆم و خۆی ئەبووین. ئەکەوتە سکالاو دەردی دڵ هەڵڕشتن .

پیاوێکی قەڵەوو بەخۆە بوو. لەسییەکانی تەمەندا بوو. بەردەوام دوای دەوام دیزداشەیەکی ئاودامانی سپی لەبەر ئەکردو بەتەنیا پیاسەی ئەکرد. ناحیەی بەغدادی گوندێکی گەورەو بەربلاو بوو. خانووەکانی لەسەریفە دروستکرابوون و دوور لە یەکەوەو کەوتبوونە ناو پەلەدار خورماکانی سەر فوراتەوە. مەکینەی کارەبای خۆی هەبوو، بەلام ئاوی نەبوو. سێ چوار دوکانێکی تێدابوو، هەر لەسەر شەقامە سەرەکییەکە، چایخانەکەی "ئەبوحسون" بوو. چایخانەی سەر ڕێ بوو، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی بەرەو حەدیسەو قائیم ئەڕۆیشتن و لەوێ لایان ئەدا. ئەم چایخانەیە، تشریبیشی دروست ئەکردو بۆ بەیانیانیش هێلکەی هەبوو. ئیتر هیچی ترو ئەبوایە بەردەوام ئەم تریتە بخۆی .

من زۆربەی وەختم بەدانیشتنو خوێندنەوەو هەندێجار بەنووسینیش لەم چایخانەی سەرەڕێیەدا بەسەرئەبرد. خەڵکەکە بەشی زۆریان نەخوێندەوارو

عەشایرو سوونني مەزهبێكی دەمارگیر بوون. ڕێزی ئێمەیان ئەگرت لەبەرئەوەی شیعە نەبووین. كە قسەیان ئەكرد بەشی زۆریان شانازییان بەهۆزو خێڵەكانی خۆیانەوە ئەكرد. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەم ناحییەدا بووم. دەموچاوی ژنێکم بەچاكی نەدی. منیش یان لەژوورەكەی خۆمدا بووم لەقوللەكەدا، یان لەم چایخانەیە. عەریف ئەمنەكەی ناحیە ناوی "عەبد" بوو، گەنجێكی خڕیلە بوو، گەلێجار ئەهاتە ژوورەكەمو بەلاچاو تەماشای بەرگی ئەو كتێبانەی ئەكرد .

"ئەبو نەوفەل" بۆ من پیاوێكی باشبوو. چونكە زوو زوو مۆڵەتی ئەدامێ و هەموو هەفتەیەكیش ڕۆژی پێنج شەمموان لەسەعات دە-وە سواری ئەو پاسی مەسڵەحانە ئەبووم كەلە نێوان حەدیسەو ڕومادیدا كاریان ئەكرد. ئەچووم بۆ ڕومادی و لەوێشەوە بەرەو بەغداو بەیانیانی شەممموانیش لەبەغداوە دەرئەچووم و بەهەمانشێوە ئەگەڕامەوە بۆ بەغدادی. مانگی جارێكیش مۆڵەتێكی چەند ڕۆژەم وەرئەگرت و ئەگەڕامەوە بۆ سلەیمانی .

بەكورتی ئەبو نەوفەل بووبوو بەهاوڕێم. منیش كە لەكوردستان ئەگەڕامەوە بەدەستو دیاری باشەوە ئەهاتمەوە بۆلایان، بەتایبەتی هەنگوینو گوێز، چ بۆ ئەوو چ بۆ ئەبو سەعد. دەمەو ئێوارانیش بەتەنها ئەچوومە سەر فوراتو دائەنیشتم و لە زەردەی خۆرنشین و نێرینەی شەپۆل و ئەو نەورەسانە وردئەبوومەوە، كە بەپۆل و بەنزمیی بەسەر ئاوەكەدا هەڵئەفڕین. خەیاڵیش ئەیبردمەوە بۆ كوردستان و، بۆ ژیانی نێو شاخوداخ و بۆلای هاوڕێكانم و یادگاری ڕابوردوو. هێشتا مانگێک نەبوو لەبەغدادی بووم، هەر لەهەمان قووله و مەخفەردا، سەرەتای نووسینی قەسیدەی "كۆچ"م دەستپێكرد. وەک لەخەوێكدابم، بەوجۆرە ئەمنووسی. هەموو هەست و نەست و دڵۆپە خوێنێكی ناو لەشم لەگەڵ وشەكاندا ئەجولا. لەگەڵ قەسیدەكەدا ئەگریام و ئەملاواندەوە. تاق و تەنیا خۆم و شیعر. خۆمو كۆمەڵێ یادگارو دووكەڵی جگەرە. پێموایە نزیكەی مانگێک پێوەی خەریک بووم. چەند ڕەشنووسێكی هەبوو.

ئەو شەوەی تەواومكرد، تابەیانیی لەخۆشیاندا خەوم لێنەكەوت. بۆ سبەینێش مۆڵەتێكم وەرگرت و دەفتەری شیعرەكەم هەڵگرتو بەرەو بەغدا كەوتمە ڕێ. خواخوام بوو شەو دابێ و هاوڕێكانم بدۆزمەوەو بۆیان بخوێنمەوە، بۆ ئەوەی ئەو دەردە دڵەیان بۆ هەڵڕێژم كە لەگۆماوی قەسیدەی كۆچ-دا پەنگیان خواردبۆوە. شەوێک دواتر، لەباڕێكی هاوینەی سەر ئەبونەواس،

کۆبووبووینەوە، وەک بیتەوە بیرم دە دوانزەیەک ئەبووین، لەوانە (حسەین عارف، محیّدین زەنگەنە، کاکە مەم بۆتانی، مەحمود زامدار، سەلاح شوان، سەلام محەمەد، ئەنوەر قادر محەمەد)و چەند هاوڕێییەکی تریش، بەهەموو کوڵ و دڵێکەوە. قەسیدەکەم خوێندەوە، هەر هەموویان باوەشیان پێداکردمو لەبیرمە هەندێکیان فرمێسک بەڕوومەتیاندا ئەهاتە خوارەوە! قەسیدەکە دەستاو دەست ڕۆیشتو لەسەردانێکیشدا بۆ سلەیمانی لەماڵی "فوئادی مەجید میسری" تۆمارمانکردو ئیتر بەهەموو لایەکدا بڵاوبۆوە .

تا ئەوکاتە شیعری کۆچ درێژترین قەسیدەی درامی تازە بوو بنووسرێ. بەڵام لەچاپدانی دواکەوت تاسەرەتای هەشتاکان. ئەوسا لەگەڵ قەسیدەی "برایمۆک و گۆرانی بەفر و منداڵیم"دا لەدیوانی "دوو سروودی کێوی"دا بڵاوبۆوەو کەوتە بەردەستی شیعر دۆستان.

قەسیدەی کۆچ؛ وەرچەرخانێکی نەوعی بوو لەژیانی هونەری مندا. قەسیدەیەکی درامی فرە دەنگ بوو. گێڕانەوەی تراژیدیای هەرەسێکی گەورە بوو. لێوان لێو لەقوڵپی گەرمی دەروون. لەئەزموونی خۆمدا، بازدانێک بوو کە لەوەوبەر نموونەی وام نەبوو. زمان ڕەنگین ببوو. هەر ڕەش‌و سپییەکەی جارانم نەبوو. ئاوێنەکان یەک جۆر ئاوێنە نەبوون. داڕشتن‌و وێنەو ئیستیعارەکان ناباوو نەبیستراو بوون. وەک وتویانە "شاعیر یەکەم ڕەخنەگری خۆیەتی"، بۆیە دوای کۆچ هەستمکرد بەوەی شێرکۆی شیعرەکانی جاران نیم. لەگەڵ ئەو بارە دەروونییەی هەمبوو. بەغدادی بۆ من لەڕووی خوێندنەوەو نووسینەوە بەبرشترین قۆناغی ژیانم بووە .

هەر لەوێ بەشی هەرە زۆری شاکارە ڕۆمانەکانی دنیام خوێندەوە. هیچ ڕۆژێ لە (١٠-١٥) سەعات کەمترم نەئەخوێندەوە. هەر لەوێش یەکەم تاقیکردنەوەی نووسینی پۆستەرە شیعرم دەستپێکرد. هەر لەسەر فوراتیش شانۆنامەی "ئاسک"و بەدەیان قەسیدەی وەک "قەقنەس"و "هاودەمم" نووسیی.

هەموو سەفەرێکی بەغدام لەو سەرەوە بەکۆمەڵێ ڕۆمان و کتێبی چاکەوە، ئەگەڕامەوە. لەبەغدادی من خۆم نەناساندبوو بەکەس. بەڵام ڕۆژێکیان پێموایە لەڕۆژنامەی (العراق) دابوو، شیعرێکم تەرجەمەی عەرەبی کرابوو. ئینجا زانییان من کێم. ئێوارەیەکیان ئەوەندە نەبوو گەیشتبوومە بەغدادی. سێ قۆڵی مودیری ناحیەو مەئمور ماڵ-ەکەو من چووبووینە ناو ئاوی فوراتەوەو مەلەمان ئەکرد.

لەپڕێکدا ئەبو نەوفەل، پلارێکی تێگرتم و وتی (ئەبێ ئێستا بارزانی لە کوێ مەلە بکات؟!). زۆرم پێناخۆش بوو، بۆیە زۆر بەتوندی وەڵامدایەوەو پێموت: (ڕەنگە لەگەڵ ژنە سەرەک کۆمارێکی عەرەب یان لەگەڵ ژنی مەلیکێکی عەرەبدا ئێستە مەلە بکات!).. لەدواییدا کەهاتینە دەرەوە، داوای لێبوردنی کردو وتی (مەبەستم هیچ نەبووە) .

گوزەرانو ژیان لەبەغدادیدا ناخۆش بوو، بەتایبەتی نەچێشتخانەو نەحەمام و نەسەرتاشو هیچی تێدا نەبوو. سێ ژەمەیش هەر تشریبەکەی ئەبو حەسون-م ئەخوارد. چەند مانگێ بوو لەوێ بووم. "عەبد" زۆر بەوردی چاودێری ئەکردم، ئەهاتە ژوورەکەمو کتێبەکانی هەڵئەگرتو لێیان وردئەبۆوە. پیاوێکی گێل بوو. جارێک دەستیدایە ڕۆمانێکی دستۆفسکیو تەماشای وێنەکەی ئەکرد، لێیپرسیم: (ئەمە ستالین نییە؟!) وتم (نە .. بەڵام خزمێتی!) .

مۆڵەت وەرگرتنم زۆر ببوو، بەتایبەتی بۆ سەردانی بەغداو جاری وایش هەبوو شەممەیشم ئەخواردو یەکشەممە ئەگەڕامەوە. هەر لەو چایخانەیەدا چەند مامۆستایەکم ناسی، دوای قسەکردنو تێکەڵاو بوون، زانیم ئەمانە کۆمۆنیستنو لە(جوبەن) .

جوبەن؛ لەولای بەغدادییەوە بوو، گوندێکی گەورە بوو، ئەگەرچی لەگەڵ بەعسیشدا هاوپەیمان بوونو لەبەرەی نیشتمانیدا پێکەوەبوون. بەڵام ئەترسانو لەژێر چاودێریدا بوونو زۆرجاریش بەچرپە قسەیان لەگەڵدا ئەکردم.
لەیەکێک لەو سەردانانەی بەغدادا بەڕێکەوت کاک "دارا تۆفیق"م بینی، دوای دوو سێ ڕۆژێ لەئەبونەواس، لەگوێ دیجلە دەعوەتێکی بۆ منو ئەنوەر قادر محەمەد کرد. تادرەنگان پێکەوە دانیشتین. ئەگەرچی نائومێدیو تێکشکانی پێوە دیاربوو، بەڵام نەیئەویست ئەوە نیشان بداتو هیوای بەپاشەڕۆژ زۆر بوو. لەو سەردانانەی بەغدادا جگە لەهاوڕێ نزیکەکانم هەندێجاریش سەردانی ماڵی "د.کاوس قەفتان و د.ئیحسان و د.ئەورەحمانی حاجی مارف"م ئەکرد. لەماڵی د.ئەورەحمان بۆ یەکەمجار لەنزیکەوە لەگەڵ "زەبیحی عولەما"دا دانیشتم. بیرمە هەر لەو دانیشتنەدا باس لە شیعری تازەکرا، زەبیحی وتی: (ئەوەی ڕاستیبێ من حەز بەم شیعرە تازانە ناکەم!)، د. ئەورەحمان-یش وتی: (تۆ شیعری شێرکۆت خوێندۆتەوە؟) وتی: (کەم) .

هەر لەو کۆڕەدا کە پێموایە د.کەمال مەزهەر و مەسعود محەمەدیش لەوێ بوون. دە دوانزە پارچە شیعری کورتم خوێندەوە. بیرمە زەبیحی وتی: (بەڵێ ئەمانە شیعرن‌و دیارە من هەڵەبووم لەوەدا، کەهەموو شیعری تازەم خستە یەک ڕیزەوە) .

هەر لەو ساڵەدا کە ئەچووم بۆ بەغدا، سەردانی کۆڕی زانیاری کوردم ئەکرد، ئەو وەختەی "مەسعود محەمەد" سەرۆکی کۆڕبوو. هەر لەوێش "د. کەمال و ناجی عەباس و شوکور مستەفا و محەمەدی مەلا کەریم و فاتحی مەلا کەریم و ئەنوەر قادر محەمەد"ی هاوڕێم ئەبینی. ئەوەندە نەبوو شیعری "کۆچ"م نووسیبوو، چووم بۆ کۆڕی زانیاری کوردو لای مەسعود محەمەد. پێموت: (ئەگەر وەختت هەبێ حەز ئەکەم ئەم قەسیدە تازەیەمت بۆ بخوێنمەوە). ڕێگەی دام و شیعرەکەم خوێندەوە. دوای خوێندنەوە، ئیعجابێکی زۆری دەربڕی و وتی: (ئەم شیعرانە، شیعری دنیاکەی گۆران نین). لە قەسیدەکەداو لەچەند شوێنێکدا ناوی لۆرکاو سەیاب هاتوون. مەسعود محەمەد وتی: (تۆ پێویستت بەوە نییە ناوی کەس بێنی و خۆت بەواندا هەڵواسی) .

دوای تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر ئەم قسەیەداو لەتەلەفزیۆندا "ئیبتیسام عەبدوڵلا" لە بەرنامەکەی خۆیدا، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ مەسعود محەمەد-دا کرد. پێموایە ساڵی (١٩٨٤) بوو. دوای قسەکردنێکی زۆر دەربارەی شیعری نالی "ئیبتیسام" خەریک بوو بچێتە سەر بابەتێکی تر، بەڵام مەسعود محەمەد قسەکەی پێبڕی و وتی: (بۆ ئەوەی قسەکانم تەواوکەم، شاعیرێکی تریش ماوە پێویستە باسی بکەم، ئیتر لەوێدا هاتە سەر من). شریتی ئەو چاوپێکەوتنەم هەتا ئێستا لەلایەو هەڵمگرتووەو پاراستومە.

هەر لەو ساڵانەدا کە لە بەغدادی بووم و هاتوچۆی بەغدام ئەکرد، گەلێجار ئێواران سەردانی بارەگای یەکێتی نووسەران و ئەدیبانی عێراقم ئەکرد لە"بیت البیض" ئامادەی کۆڕو کۆبوونەوەکان ئەبووم. هەر لەوێش لەنزیکەوە تێکەڵاوی شاعیرە ناودارەکانیان بووم. یەکێک لەوانە "حسب الشیخ جعفر"ی شاعیر بوو. زۆرجار بەدوو قۆڵی لەسەر یەک مێز دائەنیشتین، باسی تاقیکردنەوەی شیعری خۆی بۆ ئەکردم .

حسب؛ هێمن و لەسەرخۆ بوو، زۆر کەمدووبوو. تازە دەستمکردبوو بەنووسینی پۆستەرە شیعرییەکان، بۆ یەکەمجار "مەحمود زامدار" لەلای خۆیەوە کۆمەڵێکی لەوانە تەرجەمەی عەرەبی کردبوو. شاعیرە عێراقییەکان لەڕێی ئەو کورتە شیعرانەوە منیان ناسی. حەسەب ئەو شیعرانەی پێ جوان بوون و لەوەختی قسەکردندا وتی: (ئەم شیعرانە لەدنیای شیعری ژاپۆنییەکانەوە نزیکە. کورتو چڕو سروشت تەوەری سەرەکییانە) .

هەر لە باخچەکەی یەکێتی ئەدبیان و نووسەرانی عێراقدا بوو، شەوێکیان لەگەڵ "سەعدی یوسف" یەکترمان ناسی، کەلێی پرسیم لەکوێی، وتم: (بەغدادی)، پێکەنی‌و وتی: (تۆ ئەزانی ئەو شارۆچکەیەی کە مایکۆفسکی لێی لەدایک بووە ئەویش ناوی بەغدادییە!) .

من پێشتر فازیل عەزاوی و خالید عەلی مستەفا و عەبدولستار ناسرو هاشم شەفیق و فەوزی کەریم-م ناسیبوو. لەگەڵ چیرۆکنوس "موسا کرێد"دا ئاشنایەتیمان هەبوو، بەتایبەتی ئەو سەردەمەی کە گۆڤاری (الكلمه)ی دەرئەکرد. لەیەکێک لەژمارەکانی ئەم گۆڤارەشیداو لەتەرجەمەی سامی شۆڕش شیعرێکم بڵاوکرابۆوە .

"یوسف الحیدری" چیرۆکنووس، کەکوردیش بوو، زۆرجار لەچایخانە بچکۆلەکەی (باب الشرقی) یەکترمان ئەدی. هەر لەو سەردەمانەیشەوە لەگەڵ شانۆنووس و چیرۆکنووس "محێدین زەنگەنە"ی هاوڕێمدا یەکترمان ناسیو هەتا ئێستەیش ئەو خۆشەویستیو پەیوەندییە بەردەوامەو درێژەی هەیە .

لەڕۆژنامەی "طریق الشعب"یشدا کە بەشە ئەدەبیەکەی لەلایەن "سەعدی یوسف"ەوە سەرپەرشتی ئەکرا، لەوێشدا دوو سێجار شیعرم بڵاوکرایەوە. هەر لەسەرەتای حەفتاکانیشدا بوو. حەزم کرد لەنزیکەوە "عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی" شاعیر بناسم، ئەوسا لەوەزارەتی ڕاگەیاندن بەناوی "موستەشارەوە" ژووریکیان دابوویە. بەدوو مانگ سێ مانگ جارێک سەردانم ئەکرد. بەیاتی شاعیر؛ هەمیشە باسی خۆی ئەکرد کەچی لەسەر نووسراوەو چەند دکتۆرای لەسەر وەرگیراوە. کەم کەسی بەشاعیر ئەزانی! یەکێک لەوانەی خۆشی نەئەویست "ئەدۆنیس" بوو، هەموو جارێ ئەیوت: (ئەو پیاوە فری بەسەر مەسەلەی تازەکردنەوە شیعرەوە نییە!). هەروەها باسی هاوڕێیەتیو پەیوەندی خۆی لەگەڵ "گۆران"دا بۆ ئەکردم. هەموو جارێکیش هەواڵی (د.عیززەدین)ی لێ ئەپرسیم، کە دیار بوو، دکتۆری لەدەمێکەوە ناسیبوو.

هەر لەسەرەتای حەفتاکانیشدا بوو لەبەغدا، لەوەختی بەستنی کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کورددا لە کافتریاو چێشتخانەی "لۆلۆە"دا لەسەر بانگهێشتی یەکێتی نووسەرانی کورد، هەردوو شاعیری ناودار "جەواهیری" و "عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی" بانگکرابوونو ئێمەیش دەورمان ئەدان و پرسیارمان لێئەکردن و ئەماندوانن.

هەروەکو لەلاپەڕەیەکی پێشوودا ئاماژەم بۆ کرد بوو، مۆڵەت وەرگرتن و سەردانی بەغدا و سلەیمانیم زۆر ببوو. لەیەکێک لەو سەفەرانەمدا بۆ سلێمانی، لەڕۆژگارێکی ئێجگار تاریک و ناخۆشدا، پێموایە ساڵی (١٩٧٦-١٩٧٧) بوو، ئەو سەردەمەی بەعس لەکوردستاندا تەنها دەسەڵاتو ببڕو بکوژ هەر خۆی بوو، کەس نەیئەوێرا لەپێستی خۆیشیدا بجووڵێتەوە. لەهۆڵی نەقابەی مامۆستایانی

سلەیمانی کۆڕێکیان بۆ "هێمن موکریانی" ڕێکخستبوو، کامەران موکری کۆڕەکەی بەڕێوە ئەبرد. سەرەتا کامەران باسی ئەوەیکرد لە کەیەوە ئەو ناوی هێمنی بیستووە. ئاماژەی بەشیعری "گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن/ قەت لەدەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن" کرد، ئێمەیش لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکاندا حەمەی حەمە باقی و ڕەووف بێگەرد چووبووین بۆ کۆڕەکەو گوێمان گرت. وردە وردە کۆڕەکە گەرمتر بوو، خەڵکی داخ لەدڵو بێزارو نائومێد بوون، بەشوێن تروسکاییەکدا ئەگەڕان .

بیرمە دەربارەی شیعری تازە، کامەران موکری پرسیارێکی لەهێمن کرد. ئەویش لە وەڵامدا وتی: (ئەگەر شیعری تازە وەک ئەم شیعرەی شێرکۆ بێ، پارچە شیعری (کەمانچە)ی خوێندەوە "مەدالیای کەمانێکی بچکۆلانەت دابوو لەسنگ/ کە هاتوچۆت بەبەردەمی مندا ئەکرد/ گوێم لێئەبوو/ کەمان ئەکەوتە لێدانو/ ئەیشمبینی/ مەمکەکانت/ ورد ورد سەمایان بۆ ئەکردا". نازانم چۆن بوو، بەڵام وەختێکم زانی حەمەی حەمە باقی چووە سەر شانۆو شیعرەکەی خۆی "سەما لەسەر پشتی دوپشک"ی خوێندەوە. دوای ئەوە هۆڵەکە خرۆشاو داوای منیشان کرد. منیش هەر لەشیعرەکانی دیوانی (کازیوە) کە تا ئەوکاتە هەر دەستنووس بوون، کۆمەڵێ شیعرم خوێندەوەو بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو. وەختێ هاتینە دەرەوە سەر شەقامەکە، ئیتر کوڕو کاڵانو گەنجی خوێن گەرمو چاو نەترس، کردیانە جۆرە خۆنیشاندانێک ئێمەیش لەبەرئەوەی زۆر لەبەرچاوبووین، خۆمان دزییەوەو بەکۆڵانی پشتەوەدا چووینەوە سەر شەقامەکەی ئەودیوو خۆمان ونکرد.

وەختێ گەڕامەوە بۆ (بەغدادی)، ڕۆژێ دواتر، عەبد هاتو زەرفێکی دایە دەستم، کردمەوە، نوسرابوو: (کە پێویستە دەستبەجێ سەردانی ئەمنی قەزای هیت بکەم)و لەگەڵ عەبددا ڕۆیشتین. چووینە لای قایمقامو پێیوتم: (پێویستە بچیت بۆ ئاسایشی گشتی لە بەغدا)، هەر لەوێوە، بەتەنها خۆم سوار بوومو چووم بۆ بەغدا، پێموایە "حسەین عارف"م بینی و مەسەلەکەم تێگەیاند. ئەوەی ڕاستیبێ ئەو شەوە خەو نەچووە چاوم. ئاسایشی گشتی لەو ڕۆژگارەدا، ناوێکی ترسناک بوو، چونکە ڕۆژی دەیان کەسی تێدا سەرەونگون ئەکرا. بەسەدان چیرۆکی خوێناویشمان لەبارەیەوە بیستبوو. ئەو شەوە زانیم کە ئێمەی کورد لەو قۆناغەدا چەند بێداڵدەو بێکەسو بێ پەنایینو ئەوەتا ئەبێ بەپێی خۆمان بچین بۆ لای جەللادەکانمان !

جاران لەهەموو لیقەومانێکدا ڕوومان ئەکردە شاخو داخو باکمان نەبوو چی ئەبێو چی نابێ، بەڵام ئەوەتا وائێستە، نەشاخو داخو نەئەشکەوتێکو تەنانەت پەنا بەردێکیش نەماوە بمانگرێتە خۆو خۆمانی لەژێریدا حەشار بدەین. ڕۆژ بۆوەو لەگەڵ دەستپێکردنی دەوامدا گەیشتمە ئاسایشی گشتی .

لەپرسگەی سەرەکیی لێیان پرسیم ناوت چییە؟! ئینجا بەدوو پرسگەی دیکەدا تێپەڕیم. دواتر یەکێکیان لەگەڵدا ناردم، بە چەندین ڕاڕەوی کپو بێدەنگدا تێپەڕیمو لەبەر ژوورێکدا ڕایانگرتم. ئەم هۆبەیە هۆبەی سێی ئاسایشی گشتی بوو، کەسەرپەرشتی ئاسایشی هەموو کوردستانی لەئەستۆ بوو. لەو بەردەرگایەدا نزیکەی بیست دەقیقەیەک ڕاوەستام، تا دەرگا کرایەوەو چوومە ژوورەوە. ژوورێکی فراوان و ڕازاوە، لەپشت مێزەوە، پیاوێکی قژ ڕەش کەهەر لەچلەکانی تەمەندا ئەبوو، دانیشتبوو، سەری هەڵبڕیو وتی: (دانیشە!) .

زۆر بەنەرمی لەسەرخۆ دەستیکرد بەقسەکردن، سەرەتای قسە لەوێوە دەستیپێکرد، کە بۆچی وامان بەسەرهاتو مەلا مستەفا چۆن بوو بەپیاوی ئێرانو شاو چیرۆکی کابرای شمشاڵژەنی گێڕایەوە، کە هەموو مشکەکانی لەکون هێنایە دەرەوە تاشوێنی کەوتنو ئەویش بەرەو زەریا بەدەم شمشاڵ لێدانەوەو مشک بەدوایەوە تاهەموویانی خستە ناو زەریاوە!. من بێدەنگ بووم. لەدواییدا وتی (تۆ لای دارا توفیق کارت ئەکرد). وتم (بەڵێ لەڕاگەیاندن بووم). ئینجا پرسیی بۆچی ئەوەندە هاتوچۆی بەغدا ئەکەم. پێموت (من شاعیرم و پێویستم بەوەیە بێم بۆ بەغدا بۆ کتێب و گۆڤار کڕین و ئەمە هەفتەی جارێکە بۆ بیست و چوار سەعات).

لێی پرسیم لەناو شاعیرەکانی عێراقدا کێ ئەناسم. وتم: (زۆربەی هەرە زۆریان لەجەواهیرییەوە بۆ عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی.

بەمەزەنەی خۆم لەوە ئەچوو، ئەم کەسە بەرپرسی هۆبەی سێ خۆی بێ. وتی: (بچۆ دەرەوە). کەهاتمە دەرەوە لەپڕ لەبەر دەرگاکەدا "کەمال پشدەری"م بینی. ئەو وای نیشاندا ئەم بینینە ڕێکەوتە..! بەڵام پێئەچوو هەر سیناریۆی خۆیان بێ. کەمال زابتی ئەمن بوو، برای ڕەفیق پشدەری. لەسەردەمی لاوێتیدا (١٩٦٠-١٩٦١) هاوڕێمان بوو. گەلێجار لەگەڵ "بەکری مام ڕەزا و جەلال دەروێش قادر"دا یەکمان ئەبینی. وابزانم دوایی هەر لەڕێگەی کاکییەوە چووە ناو دەزگای ئاسایشەوە. لەڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانیشدا لەساڵی (١٩٩١)دا ئەفسەری ئاسایش بوو لەسلێمانی، کەوتە بەر دەستی خەڵکی ڕاپەڕیوو، هەلا هەلایانکرد.!

کەمال خۆی گێل کردبوو، ئاخر بۆو لەسەرچیو بۆ لێرەیتو منیش وتم: (نازانم، رەنگە راپۆرتی درۆم لێدرابێ). پێیوتم: (لێرە راوەستە). خۆیکرد بەو ژوورەدا کە منی لێبووم. پاش قەیرێ هاتەوە دەرێو قسەی نەکرد. بردیانم بۆ ژوورێکی تر، ئەم ئەفسەرەیان گەنجێکی ئەسمەری رووگرژو مۆن بوو. لەیەکەم وشەیەوە تادوایی هەمووی هەرەشەو گورەشە بوو. دەفتەرێکیشی لەبەر دەستابوو، زوو زوو سەیریئەکرد. پێیوتم: (برۆ لەو ژوورەی ئەودیو کورتەیەکی ژیاننامەی خۆت بنووسە). منیش چووم‌و لە دوو فولسکابدا، ژیاننامەی خۆم نووسی، لەکوێ لەدایکبووم و باوکم کێبووەو چیم خوێندووەو چەند دیوانم چاپکردووەو ئێستا لەکوێ کار ئەکەم و تادوایی. کە بۆمهێنایەوە بێئەوەی سەیری بکات، خستیە ناو فایلێکەوە .

ئەوەندەی پێنەچوو کەمال-یان بانگردوو وتیان بچۆ لەگەڵیدا ئەم شیعرانە تەرجوومە بکە. چووینە ژوورێکی تر، وەختێ کەمال دەستیکرد بەخوێندنەوە. شیعری کۆچ بوو. دیارە شیعرەکەیان لەرێگەی یەکێکی دەسەنگەخۆری خۆیانەوە کەنزیک بووە لەئێمەوە دەستکەوتووە. کەمال نەیئەزانی شیعر چییەو فری بەسەر لێکدانەوەی شیعرەوە نەبوو. شیعرەکەیش ئاماژەی راستەوخۆی زۆر کەم تێدایە. لەبەرئەوە هەر خۆم بۆم تەرجەمە ئەکردو ئەویش ئەینووسی. دوایئەوەی چەند لاپەرەیەکمان کرد، کەمال وتی: (ئینجا ئەمە چی تێدایە تاتۆی لەسەر بانگبکەن!). دەفتەرەکەی پێچایەوەو چووینە دەرەوە. چووە لای ئەفسەری دووەم، هەر خۆی چوو. نزیکەی نیو سەعاتێ لەبەر دەرگای ژوورەکە راوەستام تا کەمال هاتە دەرێو ئەوسا پێیوتم: 'بچۆرەوە بۆلای بەرپوەبەر'. چوومەوە ئەو یەکەم ژوورەی کە لەسەرەتادا چووبووم. ئەفسەرەکە پێیوتم دانیشە. ئەمجارە قسەکانی توندتربوون. تا ئەو شوێنەی، کە وتی: (ئەگەر هاوکاریمان بکەی یارمەتیت ئەدەین).

ئیتر لێرەدا ئەوەی راستیبێ نەترس‌و نەدڵەراوکێو نەئاسایشی گشتیم لەبیرنەماو منیش توند وەلاممدایەوەو پێموت: (یەعنی ئەتەوێ ببم بەجاسوس؟! من پیاوێکی شاعیرم‌و هیچی تر.. بەداخەوە ئێوە باس لەئازادی ئینسان ئەکەن‌و کەچی بەمجۆرە هەڵسوکەوت لەگەڵ شاعیرێکدا ئەکەن!). کەمێ بێدەنگ بوو. دواجار وتی: (ئەبێ لەماوەی یەک هەفتەدا ماڵو منداڵت بەری بۆ بەغدادیو لەوێ جێگیربیت). ئەگەر ئەمە نەکەیت خۆمان ماڵو منداڵەکەت ئەبەین بۆ ئەوێ. ئێستا ئەتوانی برۆیتەوە بۆ شوێنی خۆت.!

دوایئەوەی لەئاسایشی گشتی هاتمە دەرەوە، هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو لەدڵی خۆمدا وتم: (ئەمجارەیش ڕزگارمان بوو). ئەو شەوە چووم بۆلای حسەین‌و لەنووکەوە چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە. کەواتە لەئێستە بەدواوە چار نییە ئەبێ نەسرین‌و منداڵەکانیش بەرم بۆ بەغدادێ. پاش دوو ڕۆژ مۆڵەتم وەرگرت‌و گەڕامەوە سلەیمانی بۆ ئەوەی خۆمان کۆبکەینەوەو بەرەو خواربینەوە.

لەبەغدادێ خانوویەکی چۆڵی حکومی هەبوو، خراپ نەبوو. دوو ژوورو موبەقێک‌و هەیوانێک. نزیکەی سەد مەترێک لەڕووباری فوراتەوە دووربوو. بەڕێوەبەری ناحییە ئەو خانووەی دامێ بەو سیفەتەی من کاتب ناحیە بووم. بەغدادێ تۆڕی بۆری ئاوی نەبوو. لەبەرئەوە ئەبوو لەفوراتەوە خۆمان ئاو بێنین .

"عەزیز" ؛ مێرد منداڵێ بوو، هەموو ڕۆژێ بەگوێدرێژەکەیی‌و کرێیەکی کەم، چەند جارێ لەفوراتەوە ئاوی بۆ ئەکێشاین‌و بۆ ئاوی خواردنەوەیش مەرکانەیەکمان هەبوو، ئاوەکەی لێڵ‌و لیخن بوو، بۆیە هەموو جارێ زاخمان تێئەکرد تاڕوون‌و پاک بێتەوە. لەدەستە ڕاستمەوە دراوسێمان نەبوو. خانووی دەستە چەپیش ماڵی ئەبو سەعد بوو.. تەندورەکەی (أم سعد)یش کە ڕۆژانە نانی تازەی پێئەکرد هەر لەولای ئێمەوە بوو. بەمجۆرە ئیتر هاتوچۆی بەغداو سلەیمانیم کەمبۆوە یان هەر نەما. ئیتر تەواوی وەختم بۆ خوێندنەوەو نووسین تەرخان کردبوو، کاروباری ئیداری ناحیەکەیش زۆر کەمبوو. جاری واهەبوو لەهەفتەیەکدا سێ چوار نوسراوێکمان ئەگەر هەبوایە، شەوانەیش لەماڵەوە گوێم لەڕادیۆ ئەگرت‌و ناو بەناویش ئەچووم بۆ ماڵی ئەبو سەعدو کوڕی قوماریان. دائەنیشتم‌و سەیری دەستم ئەکردن. پێیان سەیربوو کە من یاری نازانم، ئەوەی ڕاستیشبێ تائێستەیش نەک یاری کاغەز بەڵکو تاوڵەو دۆمینەیش نازانم‌و حەزیان لێناکەم.!

هەر لەساڵی یەکەمدا لەبەغدادێ، جگە لەدوو سروودی کێوی، شانۆنامەی شیعری "ئاسک"یشم نووسیی. جگە لەدرێژەدان بەنووسینی پۆستەرە شیعرو زۆر بەرهەمی تر. ئەتوانم بڵێم: لەو قۆناغەی بەغدادیدا، هەموو ڕۆژێ کتێبێکم ئەخوێندەوە. هەموو ڕۆمانەکانی "دستۆفسکی" تەرجوومەی سامی ئەلدروس، ڕۆمانەکانی تۆلستۆی، تورجنیف، شیعری پوشکین، ئەدەبی ڕۆمانسی ئینگلیزی‌و جاک لندەن و ڕۆمانی مووی‌ریک و بەدەیان شاکاری ترم لەوێ خوێندەوە. هەر لەگوێ فورات‌و لەوێ فێرە مەلە بووم .

چەند جارێکیش لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەداو بەبەلەم سەردانی ئەوبەر فوراتمان ئەکرد، سەرەک هۆزو شێخە عەرەبەکان، بۆ (عەزیمە)کانی خۆیان داوەتیان ئەکردین. جارێکیان لەوبەری فورات بانگکرابووین. شێخی هۆزەکە پیاوێکی پیری ڕیش سپی کورتە بالا بوو، وەختێ زانی من کوردم، زۆر بەڕێزەوە باسی شێخ مەحمودی حەفیدی کرد. وەک قارەمانێکی گەورە ناوی ئەهێناو پەیوەندی خۆیانو شێخی ئەگێڕایەوە، هەموو جارێکیش ئەیوت "الشیخ الکبیر" وایکردوو وای وت. ئەو قسانە لەو ڕۆژەگارەدا وەک ئەوە وابوو ئاوڕشێنی دڵم بکەن. بەدوو مانگ جارێکیش ئەگەر مۆڵەتم وەربگرتایە ئەوسا پێکەوە لەگەڵ نەسرینو منداڵەکاندا ئەچووین بۆ بەغداو هەندێجاریش میوانی خانمو حسەین عارف ئەبووین.

لەبەشی سەرەوەی "بەغدادی" ماوەیەک بوو میری لەڕێگەی "عەمەل شەعبی"یەوە خەڵکی خۆی کۆئەکردەوە بۆ دروستکردنی دەیان ڕیزە خانووی دوو ژووری، کونە گورگانەو ئەیویست بەزوویی‌و لەماوەی یەک دوو مانگێکدا ئامادەیان بکات. کارەکان بەپەلە ئەنجام ئەدرانو هەر چۆنێک بوو تەواویان کرد. بەیانییەک زوو جموجوڵو ژاوەژاوێک کەوتە ناو بەغدادییەوە، بەدەیان زیلی عەسکەری هاتبوونو وتیان: (کوردەکانیان هێناوە). وەختێ چوومە سەر شەقامەکە، بەدەیان خێزانی ڕەش و ڕووت و داماوی کورد، کۆمەڵ کۆمەڵ، بەدیار شڕو شیتاڵو شتومەکو کەلوپەلی هەژارانەی خۆیانەوە تروشکەیان کردبوو .

ئەمانە هەموو خەڵکی گوندی کالێ دەوروبەری ڕەواندزو ناوچەی هیرانو نازەنین بوون. خستیاننە ئەو خانوانەوە کە بەعەمەل شەعبی‌و هەڕەمەکی دروستیان کردبوون. وەک ناسین من هیچ کامیانم نەئەناسی. خێزانێک لەوانە لەدواییدا بوون بەئاشنامان. "کەمال مستەفا" وەک کاتبی مالییە بەخۆی‌و خاوو خێزانەوە ڕەوانەی ئێرە کرابوون. تەمەنی لەچلەکاندا بوو، سەری سپی و خۆیشی پیاوێکی سوورو سپی چاوشین بوو. سێ منداڵی هەبوو یەکێکیان هەر بەزگماک کەڕەواڵە بوو. خەڵکی هیران بوونو لەبنەماڵەی صافی شاعیر بوون. ئیتر هەندێجار ڕۆژانە ئەهات بۆ لامو لەژووری ناحیەداو لەقوللەکەدا پێکەوە دائەنیشتینو زوخاوی خۆمان بۆ یەکتر هەڵئەڕشت .

کەمال مستەفا؛ بەیتو بالۆرەی کوردی زۆری لەبەربوو. من زۆرجار داوای ئەو شتانەم لێئەکردو بۆ وشەو زاراوەی کوردی پەتی سوودم لێوەرئەگرت.

بارودۆخی ژیانی ئەو کوردە ئاوارانە گەلێ سەختو دژوار بوو. ئەو سەردەمە ئیتر شوێنێ نەمابوو نە لەڕۆژهەلاتو نە لەڕۆژئاواو نە لەخوارووی عێراق، کوردی بۆ "تەرحیل" نەکرابێ.!

هاوڕێیانی نزیکو دایکمو خوشکەکانم، چەند جارێک سەردانیان کردین. لەیەکێک لەو سەردانانەی دایکمداً هەواڵی گرتنی خاڵە شیهابو هاوڕێکانی بۆ گێڕامەوە. لەدیدەنییەکی تردا پێیوتم: کە ئەوو جەعفەرو ئەنوەر لەژووری ئیعدامدانو چاوەڕێی مردن ئەکەن .!

خاڵە شیهاب،هەر لەڕێگەی ئەو خزمانەوە کە ئەچوون بۆلای بۆ "ئەبو غرێب" سەلامی تایبەتی بۆ ناردبووم! نزیکەی سێ ساڵێ لەبەغدادی مامەوە. کەمە کەمە دەستکرابۆوە بەنەقڵکردنی فەرمانبەرەکان بۆ شارەکانی خۆیان. منیش لەڕێی خاڵە ئەنوەرمەوە، کە لیوا پزیشک بوو، هەوڵێکمدا، بەلام سەری نەگرت. دواجار بابەکر پشدەری هەوڵی بۆ دامو نەقلبوومەوە بۆ سلەیمانیو لەبەڕێوەبەرێتی ئاوو ئاوەڕۆی سلەیمانی دانرام.

کاک "حەسەن تەیب"ی ئەندازیاری جیۆلۆجی بەڕێوەبەرمان بوو، خەڵکی شارو لەکورە باشەکان بوو. کاک هۆشیار غەنی شاڵی-ش لەوێ بوو.

سالی ١٩٨٦؛ سالی شیعرەکانی منو
زمانە زیندووەکانی جیهان..

لەساڵی (١٩٧٨)دا دیوانی "کازیوە"م لەچاپخانەی زانکۆی سلەیمانی چاپکرد، دیوانەکە بەخەتە خۆشەکەی کاک شەهاب عوسمان نووسرابۆوە، ئەم دیوانە بریتی بوو لەتاقیکردنەوەی پۆستەرە شیعر یان کورتە شیعرەکان. ئەو سەردەمە، ڕەقابەی دەوڵەت چاوی تیژکردبۆوە، شاعیرو هونەرمەندی کوردیش ئەبوو پەنابەرێتە بەر گەلێ قەیاغی پەڕینەوە بۆ دەربازکردنی شیعرو بەرهەمەکانیان. گەلێ لەو پۆستەرە شیعریانەی لەدوو توێی ئەم دیوانەدان بەقەیاغی ناو هێنان‌و جێ‌و شوێنی تر، وەکوو فەلەستین‌و ڤێتنام‌و ئەریتریاو یان بەپێشکەشکردنی شیعرەکان بۆ جونبلاتو غەسان کەنەفانی‌و قوربانیانی تر، بۆ ئەوەی بەتیرێ دوو نیشان بپێکین‌و هەم شیعرەکان لەڕەقابە قوتار بکەین‌و هەم ئەو قەیاغانەیش بۆ ئێمە نەبێ بەخەوشت‌و جێی تانەو توانج.

ئەو کاتانە من وەک شاعیرێکی کوردی دورخراوە ڕۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییەکان بەتایبەتی "الأقلام" و "الافاق عربیە" و "ألف با" و "فنون"، مەبەستیان ئەبوو بەرهەمەکانم بلاوبکەنەوە بەبروبیانووی جیاجیا ئەیانخستە پشتگوێ. خۆ هەندێ سەرنووسەری ئەو گۆڤارانەیشم ئەناسی، بەلام دیاربوو خۆیان لەشیعری من لائەداو نەئەچوونە ژێر باری شکستی ئەو ڕۆژگارانەی منی تێدا ئەژیام. دواتریش لەیەکەم دیداری چیرۆکی عێراقیدا کە لەهاوینەهەواری

"سەلاحەددین" بەسترا، شاعیری ناسراو "عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی" خۆی پێیوتم کە کورتەیەک لەژیانی خۆمو چەند نموونەیەک لە شیعرەکانی بۆ وەربگێڕدرێ تائەویش لەکتێبی "السنوات الضوئیە"دا بلاوی بکاتەوە .

بەیاتی؛ سالانە بەو ناوەوە ئەم کتێبەی دەرئەکرد، هەر خۆیشی هەمووجارێ چەند شاعیرێکی ولاتانی ئاسیاو ئەفریقای بەخوێنەرانی عەرەب ئەناساند. ئیتر ئەوسا بەیارمەتی هاوڕێم "ئەنوەر قادر محەمەد" ئەوەی پێویست بوو نووسیمان. بەلام کاتێ تەواومانکرد بەیاتی ڕۆیشتبووە دەرەوەی عێراقو نووسینو شیعرە وەرگێڕدراوەکانیش هەر لەلای ئەنوەر قادر مانەوە. پێموایە هەر لەسالانی (١٩٧٥-١٩٧٨)دا بوو کە د.عیززەدین مستەفا ڕەسوول لەیەکێک لە گۆڤارەکانی "بیروت"دا دەربارەی بزووتنەوەی شیعری تازەی کوردیو هەولدانی منو چەند شاعیرێکی تر وتارێکی دوورو درێژی بلاوکردبۆوە.. هەروەها ناوبەناو لەگۆڤاری "الثقافە"دا هەندێ لەهەلبژاردەی شیعرەکانم بلاوئەبوونەوە .

پێموایە لەسالی (١٩٧٩-١٩٨٠)دا بوو، هاوڕێم هونەرمەند، فازیل جاف لەگۆڤاری "الثقافة الجدیدة"دا کە ئەو سەردەمە لەبەیروت دەرئەچوو، ژمارەیەکی باشی لەکورتە شیعرەکانم وەرگێڕابوو. یەکجاریش لە گۆڤاری "الافاق عربیة"دا نموونەیەک لەشیعرەکانی منو کۆمەلێ لە شاعیرانی هاوچەرخ لەپال لێکۆلینەوەیەکی زانستییانەدا کە هاوڕێم ئەنوەر قادر محەمەد وەریگێڕابوونو نووسیبووی، بلاوکرایەوە. دواجاریش، هەر لەو سالانەدا، هاوڕێم چیرۆکنووس "مستەفا سالح کەریم" بەشێکی تری لەکورتە شیعرەکان وەرگێڕابوو. هەروەها کاک "ئازاد عەبدولواحید"یش لەکتێبەکەی خۆیدا "الشعر الکردی الحدیث" کەبریتی بوو لە وەرگێڕانی کۆمەلێ شیعری هەلبژاردەی نوێی کوردی، لەوێشدا، بەشێک لە پۆستەرەشیعرەکان بلاوبوبوونەوە .

کاک "فوئاد عەبدولڕەحمان"یش چەند لێکۆلینەوەیەکی بەزمانی عەرەبی نووسیبوو، تا ئەو کاتە واتە: تاسەرەتای هەشتاکانیش هیچ شیعرێکم بۆ زمانە زیندووەکانی دنیا وەرنەگێڕدرابوو. تەنیا یەکجار لەڕۆژنامەی "بەغداد تۆبزێڤەردا" هاوڕێم چیرۆکنووس "شێرزاد حەسەن" کۆمەلێ پۆستەرە شیعری وەرگێڕابووم. بەلام لەدوای (١٩٨٦)ەوە وەک لەدوایییدا باسی ئەکەم، هەلبژاردەی شیعرەکانم بۆ چەندین زمانی جیاجیای دنیا وەرگێڕدرانو بلاوبوونەوە.

لەسلێمانی چووینەوە لای دایکم و خانووەکەی ئیسکان، کاروباری فەرمانگەم ئەوەندە نەبوو. بۆیە لەوێش بەزۆری خەریکی خوێندەوەو نووسینی خۆم بووم.

زابت ئەمنێکی کەتەی عەرەبمان هەبوو، پێموایە خەڵکی بەسرە بوو، پیاوێکی بێوەی بوو. زیانی بۆ کەس نەبوو. وەختێکیشزانی من شاعیرم، لەجاران زیاتر ڕێزی لێئەگرتم. تا ئەو لەبەڕێوەبەریتی بیری ئیرتیوازی سلەیمانی بوو، هیچ ڕووداوێکی ناخۆش لەو بەڕێوەبەرایەتییەدا ڕوویندەدا، هەموو جارێ کەخۆمان ئەبووین ئەمانوت: (باشە ئەم پیاوە بەڕاست بەعسییە؟!) لە هەمان وەختدا کاک ئاوات عەبدولغەفور'یش لەم بەڕێوەبەرایەتییەدا بوو، پێموایە لەپاشماوەیەک دیار نەماو چووە دەرەوە ناو پێشمەرگەو شۆڕشی تازە هەڵگیرساو!

ئەو وەختەی هێشتا لەبەغدادی بووم، بیستم، مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ دروستبوون‌و کەوتوونەتە جموجووڵ‌و بینراون، بڕوام نەئەکرد .!

لەکۆتایی حەفتاکان‌و سەرەتای هەشتاکانداو ئەو وەختەی چووبوومەوە سلەیمانی، ڕۆژانە دەنگوباسی تازەمان، پێئەگەیشت، تروسکاییەک کەوتەوە ناو گیانی تاریکمان، هەواڵەکان بەچرپە بڵاوئەبوونەوە.

ئێوارە کۆڕەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد لەسلێمانی‌و چیمەنی بارەگاکەدا، هەر لەدوای هەرەسەوە، بەردەوام بوو. بەشێکی زۆری ئەم کۆڕانە بەورەیەکی بەرزو گیانێکی پڕ لەهیواوە ئەبەسترا. بەدەیان پارچە شیعرو کورتە چیرۆکی ئازایانەی تێدا ئەخوێنرایەوە. بەشی هەرە زۆری نووسەرانی کورد لەو ڕۆژگارە تاڵ‌و تاریکانەدا، هەر لەپاڵ گەلەکەی خۆیانداو لەبەرەی ڕووناکیدا بوون. نووسەری نەفس نزم‌و دەروون لاوازو نووسەری بێباک‌و دەست بەکڵاوە گرتوویشەوە هەر هەبوون، بەڵام لەڕاستیدا ئەمانە کەمبوون. شاعیرو چیرۆکنووس یان ڕەخنەگری کوردی بەعسی بەمانای وشە، کەجێ دەستی لەئەدەبی کوردیدا دیارو لەبەرچاو بووبێ و داهێنەر بووبێ، لە جێی نەبووان بوو. ئەم پێوانەیەش لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەگۆڕدرا. لەناو نووسەرانی دهۆکدا نووسەری کورد هەبووە، ئینتیمای حزبی هەبووە، بەڕێژەیەکی زیاتر بە بەراورد لەگەڵ سلێمانیدا یان هەولێردا، هەیشبووە بەعسی نەبووە، بەڵام بێبار بووەو لەسەر چەند پەتێ یاریکردووە! ژێراوژێر خۆی لەبەڵاو موسیبەت پاراستووە. ئەوانەی بۆ قادسیەی سەدامیان نووسی یان لەڕاگەیاندنی بەعسدا کاریان ئەکرد، بەشی هەرە زۆریان کۆلکە نووسەرو کۆلکە شاعیر بوون. ئەوەندەی من ئاگاداربم لەسلەیمانیدا بەعس نەیتوانی کەسانی وا دەستەمۆ بکات کە بەڕاستی ئەدیب‌و نووسەر بووبن‌و بەئاشکرا بوێرن جاڕ بۆ بەعسیتی خۆیان بدەن. هەروەها هونەرمەندانیش بەشی هەرە زۆریان پاک و بێگەرد بوون و

کارەکانیان چ لە بواری شانۆ و هونەری شێوەکاریدا بەگشتی، کاری جوان و پاک بوون. لەبواری گۆرانی و موزیکدا، جگە لەچەند گۆرانیبێژێکی پلە دوو سێ، ئیتر ئەوانیتر دەنگی خۆیان کپکردوو شاردەوە بۆ ئەوەی نەکەونە ناو داوەکانی بەعسەوەو تەنانەت هەندێکیان لەماڵیش نەئەهاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی لەبیر بچنەوەو ناچار نەکرێن گۆرانی بڵێن.

ئەو کاتەی گەڕامەوە بۆ سلەیمانی، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەواڵی گەرمبوونی موقاوەمەتی ناو شاخ زیاتر ئەبوو، لەو ساڵانەدا، سەردەمی "مولازم موحسین"ی جەللاد بوو لەسلێمانی، ئەو دڕندەیەی بەئاشکراو تەنانەت لەسەر شەقامە گشتییەکان گوللەبارانی خەڵکی ئەکرد. ڕاپۆرت نووسینو خەبەر لێدانی شوێنو گەڕانەوەی پێشمەرگەو کەمینەکانی مولازم موحسینو هێزەکانی، کەم هەفتە هەبوو، نێچیری خۆیان نەبێو لەدواییدا لەسێدارە نەدرێنو لاشەکانیان نەنێرنەوە.

بەسەدان لاوی کورد گیرابوونو لەزیندانەکانی موسڵو ئەبوغرێب-دا چاوەڕێی مەرگی خۆیان ئەکرد، بەڵام جوامێرانەو بەدەم سروودی ئازادییەوە بەرەو ڕووی مەرگ ئەبوونەوە. تەنانەت بەر لەسێدارەدانیان شاییان ئەکردو هەڵئەپەڕین .

من لەسلەیمانی نەبووم ئەو کاتەی تەرمی خاڵە شیهاب-یان هێنابۆوە. سەردەقشکێنی مەرگو زەماوەندگێڕی شایی خوێن لەوانەوە دەستپێکردو ئیتر دوای ئەوان ئەو چاونەترسیو جوامێرییە بوو بەنەریت بۆ شەهیدانی دوای خۆیان. من لەو پیاوە ئازایانە نەبووم بوێرم بچمە ناو ئەو جۆرە ڕێکخراوانەوەو کاری تێدا بکەم. یان بتوانم لەو ڕۆژگارانەدا بچمە دەرەوەو بەرگە بگرم، نەمئەتوانی جگە لەو سرودانەی قەڵەمەکەم ئەیڵێ هیچی تر بکەم.

کۆمەڵێ هاوڕێ بووین، بەڕۆژ خەریکی کاری خۆمانو سەر لەئێوارەیش لەیانەی مامۆستایان یەکمان ئەگرتەوە. هەموویشمان، یان نووسەرو شاعیر بووین یان ئەکتەرو دەرهێنەرو هونەرمەند. مێزەکەی ئێمە لەیانەی مامۆستایان بەهاوینان لەناو چیمەنەکەدا یان بەزستانان لەناو هۆڵەکەدا. بەتەنها مێزی خواردنەوە نەبوو، مێزی هونەرو ئەدەبو دیالۆگو خوێندنەوەی دوا ڕۆمانو بینینی دوا شانۆنامەو دوا پێشانگەو باسکردنی تازەترین پارچە موزیک بوو. هاوڕێکانمان لەشاخ خەریکی دروستکردنەوەی مێژوویەکی تازە بوونو ئێمەیش لەشار خەریکی گەڵاڵە کردنی چەندین پڕۆژەی ئەدەبیو هونەری بووین. ئەو

ئازیزانەی سەرمێزی شەوانەی یانەی مامۆستایان کەم نەبوون، هەندێکجار تاکو تەرای وایشی تێئەکەوت کەدڵمان پێیان نەکرێتەوە، تەنانەت ئەوانەشی لەگەڵماندا ناپاک نەبوون، بێگەردو فازیل جافو جیهاد دڵپاکو مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیمو فازیل قەسابو شێرزاد شەوقیو عوسمان چێوارو کەمال سابیرو حەمەی نێرگزو ئازادی حەمە بچکۆڵو عەلی کەریمو ئەژی گۆرانو دڵشاد مەریوانیو شەهاب عوسمانو ناوبەناو مستەفا سالح کەریمو حەمە ڕەشید فەتاحو سەلام مەنمی و هەندێجاریش زێوەر فەندییەکانی وەک حەمەی حەمە باقیو ئەنوەر قەرەداغ-یشی تێئەکەوتن، بەڵام ئەم ناوانە نەهەموو پێکەوەو نەهەموو شەوێکیش، هەمیشەییەکانیش: مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیمو شێرزاد شەوقیو من بووین. واتە ئەگەر بەردیش بباریایە ئەو سیانەی هەر لێبوون. یەکەم کەسیش بەردەوام مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم بوو، بەخۆیو جامانە قوتەکەیو فەقیانەکانییەوە. زستانان ئەو شەوەی بێگەرد بهاتایەو جیهاد دڵپاک بیخستایە سەر هەوای گۆرانیوتن ئیتر ئەبوو بەچریکەو بەزمی گەرمی یارانو تادرەنگو دوامێز ئێمە بووین کە هەڵئەساین. خواردنەوە دەرمانی ئەو خەمانە بوو کەدەرزی ئاژنی ڕۆحیان ئەکردینو بۆ ئەوەی لەدواییدا بتوانین بنووین .

خواردنەوە لەبەر خواردنەوە نەبوو، لەبەر ڕۆژگاری دوای هەرەسو لەبەر سوکناییەکی ئازاری قوڵی سەردەمەکەو لەبەرئەوە بوو هیچ نەبێ بۆ چەند سەعاتێ ئێمەیش بێهۆش بینو خەوێکی خۆش ببینین. ئێمە سەرخۆشی خەمەکان بووین بەر لەوەی سەرخۆشی مەی بین. من بۆ خۆم سنووورێکم هەبوو لەخواردنەوەدا، هەروەها مامۆستا عومەرو هاورێکانی تریش، بەڵام ئەوەی سنووری نەبوو شێرزاد شەوقی بوو.. ئەم پیاوە قسەی خۆشی تیا هەڵئەقولا، خۆی هونەرمەندی شێوەکار بوو، بەڵام دەمێک بوو هیچی وای نەبوو، مەگەر ئێمە بیرمان بخستایەتەوە. هاوینان بەخۆیو کراسە قۆڵ کورتەکەیەوە دائەنیشتو جاربەجار مامۆستا عومەری توورە ئەکردو ئینجا ئاشتی ئەکردەوەو پرسیاری ڕاوە کەوی لێئەکرد .

مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم؛ لەمامۆستا دێرینەکانی ئەم شارە بوو، شیعرو چیرۆکی بۆ منداڵان ئەنووسی. گەنجینەیەک بوو بۆ فۆلکلۆری کوردی. لەهەمانکاتیشدا ڕاوچیەکی دیار بوو. لەماڵیشەوە چەندین قەفەزی کەوی هەبوو، چەندینجار لەکاتی خۆیدا وەک ئەیگێڕایەوە لەگەڵ بێکەسدا دانیشتووە،

نوکتەکانی ئەوی ئەگێڕایەوەو قاقا پێیەکەنی. تەنانەت جارێک خۆی گێڕایەوە وتی: (یەکەمجار بوو لەگەڵ بێکەسدا بخۆمەوە) دوای پێکی یەکەم پێیوتم: (تۆ ڕاویت؟!) وتم: (بەڵێ)، وتی: (دەباشە فجووقێ بکە!). کە باسی گەنجێتی خۆیشی ئەکرد، ئەیوت: (ئەو کاتەی بەڕەپێک دووانم لەسەر یەک ئەکرد!) .

یەکێک لەو شەوە خۆشانەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، لەچیمەنەکەی یانەی مامۆستایاندا چوار کەس بووین لەسەر مێزەکە، مامۆستا عومەر و شێرزاد و ئەژی و من. مامۆستا عومەر باسی ڕاوە کەوێکی خۆیکرد کەچەند کەوی گرتووە. ئەژی هەڵیدایە، کە ئەویش هەر ڕاوچییەو جارێک پێنج شەشێکی گرتووە. مامۆستا عومەر مات بوو!. بەلام شێرزاد هەڵیدایەو وتی: (مامۆستا دڵ لەدڵ مەدە، ئەو کەوانەی ئەژی باسیان ئەکات لەکەوەکانی تۆ نەبوون. کەوی مەسلەحە بوون!). شێرزاد شەوقی هاوڕێمان، هەموو شەوێ دوایئەوەی زیاد لەنێو قاپی ئەخواردەوە، داوای چارەکێکی تریشی ئەکرد بۆ ماڵەوەو چارەکەکەیشی ئەخستە ناو گۆرەویەکانییەوەو ئینجا هەڵئەسا. بەداخەوە ئەو کاتە، من لەشاخ بووم شێرزاد نەخۆش ئەکەوێ‌و نەخۆشییەکەی کوشندە ئەبێ‌و لەهەفتەیەکدا لەپەل‌وپۆی ئەخات‌و کۆچی دوایی ئەکات.!

هەر لەیانەی مامۆستایان و سەر ئەو مێزە، سەروەختێ بوو یاری دەنکە شقارتەمان ئەکرد. دوو دوو یان بەگروپ. یارییەکە بەمجۆرە بوو: دە دەنکە شقارتەم ئەخستە بەردەمت، هەر دەنکێک و بۆ پرسیارێ، تۆ ئەبوایە بە دە پرسیار ئەو کەسەی من خستوومەتە دڵی خۆمەوە تۆ بیدۆزیتەوە. جائێتر پیاو بێ یان ژن. مردوو بێ یان زیندوو. شاعیر بێ، سیاسیی بێ، هونەرمەند بێ و یان هەر شتێک تر بێ، بەمەرجێ ئەو کەسە لای هەردووکمان ناسراوبێ. بۆ نموونە من "شکسپیر"م ئەخستە دڵی خۆمەوە. تۆ پرسیاری یەکەمت ئەکردو ئەتوت: پیاوە؟! من ئەموت: بەڵێ. دووەم پرسیارت ئەکردو ئەتوت: ماوە؟! من ئەموت: نەخێر. سێهەم، کوردە؟! من ئەموت: نەخێر. چوارەم: لەڕۆژهەلاتە؟! ئەموت: نەخێر. پێنجەم: لەئەوروپایە؟! ئەموت: بەڵێ. شەشەم: شاعیرە؟! ئەموت: بەڵێ، حەوتەم لەئینگلتەرە بووە؟! من ئەموت: بەڵێ. هەشتەم دەمێکە مردووە؟! ئەموت: بەڵێ. نۆیەم: باشە شکسپیرە؟! ئەموت: بەڵێ خۆیەتی .

دیارە هەندێجار ناوی وامان دائەنا. دۆزینەوەی زەحمەت بێ. جیهاد دڵپاک و فازیل قەساب هەندێجار مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم-یان توڕە ئەکردو ئەویش بەچاکی لەیارییەکەی نەئەزانی. مامۆستا ئەیپرسی: خاڵەکەم پیاوە؟!

ئەوانیش ئەیانوت بەڵێ. ئەی خاڵەکەم. لەژیاندایە؟! ئەوانیش ئەیانوت: نەخێر. ئەی خاڵەکەم هونەرمەندە؟! ئەوانیش ئەیانوت بەڵێ "لێرەدا بۆ ئەوەی سەری لێتێکبدەن فازیل قەساب لەبەر خۆیەوە ئەیوت هایل هیتلەرە" مامۆستا عومەر ئەیپرسی: خاڵەکەم هیتلەرە! ئیتر ئەبوو بەپێکەنین. کەمال سابیریش هەندێجار مامۆستا عومەری تووڕە ئەکرد. شەوێکیان وتی: (مامۆستا ئەترسم ئەم کەوانەی باسی ئەکەن لەژێر پردەکە بیانکری؟!) مامۆستایش لچ و لێوی شۆڕکردەوەو وتی: (هەستە بڕۆ هەستە بزنی دیلێژە! تافڕێم نەداویتە دەرەوە).

لەشوێنی زستانەی یانەیشدا، لەسەرو دەمێکدا، ژوورێکی شووشەبەندو جامخانە دروستکرابوو. ئێمە ئەچووینە ئەو ژوورەوە، ئەگەر بێگەرد لەوێ بوایە، دوای ئەوەی جیهاد بەشێوازی خۆی بێگەردی ئەجوڵان، ئەوسا بێگەرد تێی ئەچریکان. بێگەردی چیرۆکنووس‌و هاوڕێی هەرە نزیکم یەکێکە لەدەنگ خۆشەکانی ئەمشارە، بەتایبەتی لەوتنەوەی گۆرانیەکانی مامڵێ-دا بێ وێنەیە.

ژیان؛ بێدەنگی خۆش بیابانە، لەسلەیمانیداو لەهەموو سەردەمەکانیدا کەسانی دەنگخۆش هەر هەبوون .

من لەمنداڵییەوە گوێم بەدەنگی خۆشی دایکم زرنگاوەتەوە، دایکم قوڕگێکی ئەفسوناوی پێوە بوو. وەختێ ئەو لەبەرخۆوە گۆرانی بوتایە، من بێدەنگ ئەبووم هەندێجار گۆرانییەکانی ئەوەندە غەمگین بوون منیان مات وکڕ ئەکرد. دایکم گۆرانی سەفەری زۆر چاک ئەوت. هەروەها هەندێ لەگۆرانییەکانی عەلی مەردان و سەید عەلی ئەسغەر. پێموایە چوار ساڵ ئەبووم کە جارێکیان گۆرانی "سەبری بەچاوی مەستەوە"ی بۆ ئەوتم، تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە ئەڵێت "سەبریان برد بۆ تانجەرۆ/ کراسیان بۆ کرد لەگوڵە هێرۆ" چەند وێنەیەکی شیعری جوانە، وەختێ ژنێکی جوانم ئەهێنایە پێشچاو، کراسی گوڵە هێرۆی لەبەردایەو هاتوچۆ ئەکات. ئەم وێنەیە یەکەم وێنەی شیعرییە کە لەزەینی مندا لەڕێی دەنگی خۆشی دایکمەوە مابێتەوە. کۆنترین گۆرانیبێژێکی سلەیمانی، کە من ناوم بیستبێ وەک باسی ئەکەم "ئەحەی ناسر" بووە. دیارە پێش ئەحەی ناسریش دەنگخۆش هەر هەبووە بەڵام کێ بوون؟! نازانم .

ئەو دەنگانەی پێش قەوان تۆمارکردن هەبوون فەوتاون و لەبیرچوونەتەوە. "مەلا کەریم" لەدەنگخۆشەکانی سەردەمی خۆی بووە. من نەمدیوە. هەروەها "دایکی جەماڵ" یەکێک بووە لەژنە گۆرانیبێژە پێشەنگەکان. وەک باسیش ئەکەن شاعیری ناسراو "شێخ نوری شێخ ساڵح" لەپیاوە هەرە دەنگخۆشەکان بووە.

شێخ نوری؛ شاعیر بووەو نووسەرو ڕەخنەگرو ڕۆژنامەوان بووەو دەنگخۆش بووە، یەکێکیش بووە لەکوڕە هەرە قۆزەکانی شاری سلەیمانی. بەرودواش، ڕەشۆل و دیلان و چالاک و مەحمود تۆفیق و ئەحمەد مەحمود و شەمال سائیب و کەریم کابان و قادر کابان و حەمەی نێرگز و هتد...

چەند دەنگخۆشێ لەمانە بەهای گەورەی خۆیان هەیە، من لەسەر سێ چوارێکیان زۆرتر ئەوەستم، چونکە کاریگەری زۆریان لەسەر هەستو نەستو ژیانی من هەبووەو تەنانەت لەشەستەکاندا بەدیار دەنگییانەوە گریاوم .

یەکەمیان: حەمە سالح دیلان؛ شاعیرو دەنگخۆش‌و نیشتمانپەروەر. من بۆ خۆم لەچەندجار زیاتر لە کۆڕو لە میوانداریی ماڵاندا دانیشتووم و دیلان تێی چریکاندوە، لە ساڵی (١٩٧٠) دوای لەدایکبوونی "هەڵبەست"ی کچم، بانگهێشتی ماڵەوەم کردو شەو بەیەکەوە بووین‌و بەدەنگە خۆشەکەی لەدایکبوونی هەڵبەستی پیرۆز کرد. دیلان تەنها لە کۆڕی یاران و هاوڕێی خۆیدا گۆرانی ئەوت. دەنگی دیلان دەنگێکی بەهەشتی و بەسۆز و پڕ لەچریکەی تەزووهێنەر بوو بەدڵ‌ودەروووندا. لە ئاستی ئەم دەنگەدا پیاو سەرسام ئەبوو. دیلان ڕووناکبیربوو ئاگای لەئەدەبی فارسی‌و شیعری فارسی‌و سەبکەکانی بوو. ئەیزانی چی ئەڵێ. تەنها خەوشی ئەم پیاوە ئەوە بوو، نرخی ئەم دەنگەی خۆی نەئەزانی، پێی ناخۆش بوو، توورە ئەبوو، ئەگەر پێتبووتایە "گۆرانیبێژ"، جارێکیان لەیانەی مامۆستایان "د.مارف خەزنەدار" لە هەولێرەوە هاتبوو، مستەفا سالح کەریم داوەتی کردبوو. دیلان لەوێ بوو، باسیکراو من وتم: (دەنگخۆش و گۆرانییەکانی دیلان لەشاعیریەتییەکەی گەورەترن). ئەم قسەیەی بیستبۆوەو تا دوو ساڵ مەرحەبای نەکردم!

گەلێجاری تریش لەسەر ئەم قسانە چۆتە سەر خەڵکی ترو لێیان زویر بووە!
من زۆرجار لەدەرەوەی وڵاتو غوربەتدا بەدەنگی دیلان خۆم مەست ئەکردو ئەگریام. دەنگی ڕەسەن ئەو دەنگە بوو کە لەقوڕگ و هەناسەی ئەم پیاوەوە ئەهاتە دەرەوە.

دووەمیان: شەماڵ سائیب؛ من بۆ خۆم زۆرم حەز بەدەنگی نەئەکرد، بەڵام شەماڵ ڕێچکەشکێن بوو، نوێخوازبوو، لە وەختێکدا ئەو گۆرانی کوردی تازە کردەوەو ڕۆحێکی سەردەمیانەو هاوچەرخی بەبەردا کردەوە، خەڵکی بەگشتی، بۆیان هەزم نەئەکرا. بەڵام شەماڵ بۆ نەوەی تازەی سەردەمی خۆی گۆرانی

ئەوت‌و پۆلی ئاوازی تازەی هێنایە ناو دنیای گۆرانی کوردییەوە کە لەوەوپێش نەبینراوو نەبیستراو بوون.

سێهەمیان: ڕەفیق چالاک؛ لەسەرودەمێکدا بەتایبەتی لە شەستەکانی سەدەی ڕابوردوو‌داو لەقۆناغێکدا کە من تەواو نائومێدو ڕەشبین‌و تەنیاو گۆشەگیر بووم. دەنگی چالاک هاودەمی شەوانە بوو، دەنگێکی خەماوی‌و سیحراوی‌و گریاناوی، تاسەر ئێسقان کاری تێئەکردم .

چالاک ئەیزانی کام شیعر ئەکا بەگۆرانیی، لەساڵی (١٩٦٣-١٩٦٤)دا، ماڵی چالاکیش هەر لەگەڕەکی ئیسکان بوو. بەینمان خۆش و زوو زوو ئەچووم بۆلای. ئەو یەکەم کەس بوو کە شیعری "باوکی شەهید"ی منی کرد بەگۆرانییەکی غەمگینی پڕ لە تام و سۆزی پڕ لەهەنیسک‌و فرمێسکاوی. چالاک ئاواز دانەرو یەکەم هونەرمەندیش بووە کەگۆرانیی ئۆپەرێتی وتوە، بەدەر لەگۆرانیبێژانی سلەیمانی .

ئێمە هەر لە زووەوە "عەلی مەردان" شەیدای دەنگی خۆی کردبووین. دواتریش "زیرەک" و "حەمەی ماملێ" و "ڕەزازی" لەو دەنگە خۆشانە بوون کە گۆرانیی کوردیان جوانترو شیرینتر کرد، بەلام ئەو دەنگخۆش‌و گۆرانیبێژەی لەهەموویان زیاتر من ئالوودەی دەنگی بووم "مەزهەری خالقی" بوو. گەلێ دەنگی خۆش لەیەکتر ئەچن و یان ئەچنەوە سەریەک، بەلام لەوێنەی دەنگی مەزهەر نەبووەو ڕەنگە نەیشبێتەوە. ئەداو ستایلێکی تایبەت‌و بێ هاوتا. من بۆ خۆم جگە لەگۆرانیی کوردی، ئەوەندەی گۆرانی‌و مەقامی تورکیم پێخۆشە، ئەوەندە مەیلم ناچێ بەلای گۆرانی فارسیدا. نازانم بۆچی. لەگۆرانی بێژانی عەرەبیشدا تەنها دەنگێک کەگوێم لێئەبێ و سەرسامم ئەکاو هەموو جارێکیش وەک یەکەمجار بێ کەمەندکێشی خۆیم ئەکات دەنگی "فەیروز"ە.

پیاوی ئەوەنەبووم بچمە سەنگەرەوە؛
یان بڵێ ترسنۆک بووم!..

هەر لەو سەروەدەمەدا واتە لە (١٩٨٠-١٩٨٣)دا یەکێک لەو ئەدیبو ڕووناکبیرانەی لەیانەی مامۆستایان ئەهاتە لامان "دڵشاد مەریوانی" بوو .

گەنجێکی باریکەلەی کەلەگەت، ڕۆژگارەکەی ڕۆژگاری سەرهەڵدانەوەی موقاوەمەتو باس باسی کۆمەڵەی مارکسی- لینینی ڕەنجدەرانو گەرمەی چالاکی ئەوان بوو. لەو قۆناغە ترسناکەدا ئەبوو نهێنییەکانی خۆت بەچاکی بپارێزییو نەهێڵی هیچ کەس، تەنانەت هاوڕێیەکانیشت پێبزانن .

من و بێگەردو یەکدو هاوڕێی تر هەر لەو ساڵانەدا بەهۆی هاوڕێمان کاک "حەمەی حەمە باقی"یەوە دواتر بەهۆی کاک "شەهاب عوسمان"ەوە، خەتێکی ئاڵوگۆڕی نامەمان لەگەڵ کاک نەوشیروان مستەفادا دروستکردبوو. من بەشێکی زۆری ئەو شیعرانەی کە دوایی چوونە دووتوێی دیوانەکانی "کەشکۆڵی پێشمەرگە"وە هەر لەسلەیمانی نووسیبوومن. ناوی نهێنی "جوامێر"یشم بۆ خۆم هەڵبژاردبوو. هەر بەو ناوەیشەوە نامەو شیعرەکانم ئەگەیاندە دەرەوە. قەسیدە درێژەکەی "داستانی هەڵۆی سوور"یشم هەر لەسلێمانی نووسی. کاک حەمەی حەمە باقی هاوڕێمانو هاوسەرەکەی "نەجیبە"خان، بەماوەیەکی زۆر پێش ئێمە چوونە ناو پێشمەرگەو شۆڕشی تازەوە. من بەشێک لەو شیعرانەو ئینجا "داستانی هەڵۆی سوور"م بۆ یەکەمجار لەڕێی ئەوانەوە گەیاندە شاخ. شیعرەکانیش لەڕادیۆی شۆڕشەوە، بڵاوئەکرانەوە .

کاکە حەمەی حەمە باقی؛ چەند جارێک بەنهێنی خۆی ئەکردەوە بەشارداو منو چەند هاورێیەکی نزیکی خۆی ئەبینی. لەو سەرودەمەدا، کاکە حەمە، وەک خۆی بۆی باس ئەکردین لەمام جەلال و کاک نەوشیروان و برایانی سەرکردایەتی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانییەوە، زۆر نزیک بوو. تەنانەت ئاگای لەوردەکاری بەرنامەکانیشیان بوو.. چونکە جێی بڕوایان بوو. ئەمە لەسەرودەمێکدا بوون، کەسەرکردایەتی شۆڕش، لەناو زەنگ بوون، لەو کاتانەیشدا بوو کەهێزەکانی پێشمەرگە لەڕۆژهەلاتی کوردستاندا، لەپاڵ هێزەکانی حزبی دیموکراتو ئۆپۆزسیۆندا شەڕی هێزەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیان ئەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە دواتر، وەک نوێنەری یەکێتیو بەنامەی تایبەتی مام جەلال خۆی بۆ چارەسەری کێشەکانی ناو یەکێتی نووسەرانی کورد لەپەیوەندیدا بوو لەگەڵ ئێمەدا. لەقۆناغێکی دواتریشدا بوو، کە کاکە حەمەو کاک محەمەدموکری و فەرەیدون دارتاش بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی سەردانی هەموو ناوچەکانی کوردستانیان کردو لە نزیکەوە لەگەڵ نوێنەری حزبەکاندا دانووسانیان کرد. لەساڵی (١٩٨٤)ی سەردەمی موفاوەزاتی یەکێتیو حکومەتیشدا بوو، بەیەکەوە لەگەڵ کاکە حەمەو چەند هاورێیەکی تردا بۆ پەیوەندیکردن بەچەندین ڕووناکبیرو ئەدیبی ناسراوەوە چووین بۆ بەغداو بینیمانن.

لەوەختێکدا ولاتەکەت نوقمی شەوە زەنگی بەعس بووبێتو لەولایشەوە تروسکایی موقاوەمەتی دیاربێ، منی شاعیر، ئەبوو چیبکەم؟ یان چیم پێبکرێ؟ لەوە زیاتر قەڵەمەکەم لەگەڵیاندا بجەنگێ. من نەمئەتوانی یان پیاوی ئەوە نەبووم، بچمە سەنگەرەوە و شەڕ بکەم. یان تۆ بڵێ ترسنۆک بووم، نەمئەوێرا ئەو هەڵوێستە هەڵبژێرمو ببمە پێشمەرگەی تیپەکان .

کەواتە ئەوەی بەمن ئەکرا نووسین بوو.. نووسینی شیعری تازەی بەرگری بوو لەوجودی نەتەوەیەک. ئەمە سیاسەت کردن نەبوو بەمانای حزبایەتیو ناو شانەی ڕێکخستن و بارگاوی کردنی شیعر بەو مانایە. بەڵکو ڕۆژگارەکەی وابوو. وا دوژمن هاتۆتە سەرتو ئەیەوێ لەناوت بەرێ، تۆ ئیتر لەو کاتەدا چیت بەدەستەوە بێ ئەیکەیتە چەکێ بۆ پارێزگاری لەخۆت، ڕۆژەکەی وابوو. ئەگینا منو کۆمەڵەی مارکسی لینینی ڕەنجدەرانی کوردستان وەک ڕێکخراوێکی سیاسی کوجا مەرحەبا!! چونکە من بڕوام بەمارکسییەت نەبووەو ڕۆژێ لەڕۆژانیش لەهیچ حزبێکی مارکسی لینینیدا کارم نەکردووە، بەڵام بۆ من وەک شاعیر "کۆمەڵە" لەو سەرودەمەدا وەک فریادڕەسی نێو دارستانێک ئەهاتە

بەرچاوم، وەک پاڵەوانێکی نموونەیی. وەک کۆمەڵە مرۆڤێ کە لەودیو خەونەکانەوە هاتبنە ناو ئەم واقیعە تاڵەوە. من ئەوەم ئەدی، نەک پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە، من چ کارم بەوە نەبوو، مەبەستیشم نەبوو، بیانخوێنمەوە .

کۆمەڵە؛ ئەو ڕووناکییەی لەگەڵ خۆیدا هێنا، جا ئیتر ڕووناکییەکە بەهەر ناوێکەوە بێت، بۆ من جێی بایەخ نەبوو. ئەمە شۆڕشگێڕانەو ئەوەیان خەتی پانەو ئەمیتریان کۆمەڵەی ڕەنجدەرانە، من لەو ڕوانگانەوە شیعرم بۆ مقاوەمەت نەنووسیوە. من شیعرم بۆ کوڕەکانی داستانێ ئەنووسی کە ئەیانویست ئەژدیهاکە بکوژن، بۆ ئەوەی سەرچاوەی ئاوەکە بەربدەن. ئەو وەختەی من لەهەندێ شیعری ئەو سەردەمەدا ناوی "کۆمەڵە" یان "یەکێتی" یان "عەلی عەسکەری" یان "ئارام" و "جەمال عەلی باپیر" و "شیهاب" و.. هتد، ئەهێنم و ئاماژەیان بۆ ئەکەم، ڕێکخراوەکانیان دواشت بووە من بیرم لێکردبنەوە. من ئەو کەسانەم وەک قارەمانانی داستانو فریادڕەسو عاشقی گەورە تەماشا کردووە. ئەگەر ئەو هێزە سیاسیانەیشم خۆشویستبێ، لەبەر ئەو سومبولانە بووەو هیچی تر .

ئەگەر ئەو جوامێرانە لەو سەردەمەدا بۆ نموونە پارتی بوونایە یان شیوعی لای من هیچ شتێکی لەمەسەلەکە نەئەگۆڕی. ئەو ڕۆژانەی من بەشێکی زۆری ئەو شیعرانەی کەشکۆڵی پێشمەرگەم تیا ئەنووسی، قەسیدەی "داستانی هەڵۆی سوور"م تیا نووسی. نە مام جەلال و نە نەوشیروان و نەیەک ئەندامی سەرکردایەتی ئەوانم لەنزیکەوەو ڕووبەڕوو نەناسیبوو. لەگەڵیان دانەنیشتبووم. من لەدوای نووسینی بەشێک لەو شیعرانەو داستانی هەڵۆی سوورەوەو بۆ یەکەمجار لەساڵی (١٩٨٣)دا ئینجا ئەوانم لەنزیکەوە بینی.
شیعرەکانی کەشکۆڵی پێشمەرگە؛ تەرزێکی تازەبوون لەشیعری موقاوەمەت کە لەوەوبەرو بەو ستایلە نەنووسرابوونو نەبوون. شیعری پێشتر، شیعری نیشتمانیی بوون، بەڵام شیعرەکانی کەشکۆڵی پێشمەرگە شیعری ژیانی ڕۆژانەی پ.م و داستانەکانیان بوون. شیعر بۆ نانەوایەکی پ.م، بۆ تەتەرێ. بۆ هەگبەی پێشمەرگەیەک، بۆ ئاوێنەیەک، بۆ ڕادیۆیەکی خشەخشکەر. بۆ هەرەسی شۆڕشێ، بۆ شەهیدەکانی، بۆ ڕاگوێزانو وێران کردنی گوندێ، شیعرەکان ڕەنگدانەوەی ئەو موقاوەمەتە بوون، کەپێشتر بەحوکمی ئارودۆخە سیاسیو کۆمەڵایەتیو جوگرافییەکە نەبوون .

"پ. م"ی دوای هەستانەوە، "پ. م"ی شۆڕشی ئەیلول نەبوون، لەو ڕۆژگارانەدا سەرکردەکان نە ئەم سەرکردانەی ئێستا بوون و نەزووتر. هەر لەبەر ئەوەیش چ شیعرەکان و چ زمانی دەربڕینیان تازەبوون. شیعرە نیشتمانییەکانی لەوەوبەر گشتی بوون، بەڵام شیعری کەشکۆڵی پێشمەرگە تایبەت و ئاوێنەی ژیانی ڕۆژانەو هەڵمەتەکانی ئەوان و داستانەکانیان بوو. ئەزموونی پ. م بوون و نەبوون بەشیعر. ئەو ئەزموونانەی کە لەئەزموونی جەنگاوەران و (پ. م)ی بۆ نموونە سەردەمی شێخ مەحمود نەئەچوون. بڕۆ شیعری (میوان) بخوێنەرەوە کەپێشکەشی شەهید جەمیل ڕەنجبەری شاعیرم کردووە، من لەماڵەوەم و ئەویش دێت بۆلام.

خەوێکەو گفتوگۆیەک لەنێوانماندا دروست ئەبێ. زیندوبۆتەوەو باسی خۆیم بۆ ئەکات. بەرلەوەی بەجێمبێڵێ دائەکاتە باران و پێی ئەڵێم: (چەترەکەم لەگەڵ خۆیدا بەرێ نەبادا تەڕبێ!). لەم جۆرە شیعرە درامیانە پێشتر نەبوون.

بەکورتی من ئەمویست لەو ساتەوەختە دژوارانەدا " بەشیعر بەشداریی لەموقاوەمەتدا بکەم و بیکەمە چەکێک". من بۆ خۆم دواتریش کە چوومە ناو شۆڕشی نوێ و پێشمەرگەوە. هەروام بەباشزانی درێژە بەهەمان خەتی ئەو شیعرانە بدەم. ئەگینا وەکی تر، منیش خەوش و ناتەواوی زۆرم ئەبینی. بەڵام پ. م پشتوپەنایەکی ناو ئەم دنیایەی نەبوو، هیچی نەبوو. لەچەکەکەیی و خوێنی خۆی بەولاوە، بۆیە بەلای منەوە، ئەبوو نائومێد نەکرێ و ورەی نەڕوخێنرێ و شیعری موقاوەمەتی بۆ بنووسرێ. لەگەڵ ئەمانەیشدا، من تائێستایش بڕوام وایە شیعر هونەرەو پەیامیشە. چرایشەو ڕێگەیشە، شێوازەو ئامانجیشە. من هەرگیز شیعرم هەر لەبەر شیعر نەنوسیوە. جا ئیتر ئەو شیعرە بۆ هەرچییەک بووبێ! بۆ کۆترێ بووبێ یان بۆ جۆگەلەیەک یان بۆ ژنێ یان بۆ شەهیدێ. شیعر ناکەوێتە دەرەوەی مانا. هەروەکو چۆن ناکەوێتە دەرەوەی زمان. زمانەو مانایشە، ناوەڕۆکەو فۆرمیشە. وەک چۆن وشەی ناشیعری نییە، بەمەرجێ شوێنی خۆی بدۆزێتەوە. هەروەهایش بابەتێ نییە، ژانرێ نییە، شاعیری وەستا، شاعیری داهێنەر، نەیکا بەشیعر دڵداری بێ یان سیاسی، بۆ غوربەت بێ یان بۆ سێکس یان بۆ تەسەوف و هەر شتێ.

ئێمە وەک سەرئەنجام شیعرمان ئەوێت، هەروەکو لەکاتی خۆیدا وتبووم: (شاعیر هەیە شیعر بۆ خوا ئەنووسێ و نابێ بەشیعر، شاعیریش هەیە شیعر بۆ مشکێ ئەنووسێ و ئەبێ بەشیعر). باشیعرێ بابەتەکەی یان بیرۆکەکەیشی

"مەقەدەس" بێ، ئەمە ناکاتە ئەوەی ئیتر ئەبێ شیعربێ، بەڵکوو ئەوە زمانو هونەرو وێنەیە ئەیکا بەشیعر یان نا؟. لەئەدەبی ئێمەدا بەهەزاران شیعر بۆ جوانیو خۆشەویستیی نوسراونو نەشبوون بەشیعر.

من؛ پێموایە شیعری خراپ ئەگەر بۆ مەسەلەیەکی پیرۆز نوسرا لەبەهاو پیرۆزی ئەو مەسەلەیە کەم ئەکاتەوە، یان ئازاری ئەدا یان لەڕێزی ئەهێنێتە خوارێ.

دڵشاد مەریوانی؛ کەسێکی بەهرەدار بوو، لەدەرچووانی کۆلێجی پەروەردە-بەشی زمانی کوردی بەغدا بوو، بۆ شیعرو چیرۆکو هەندێجاریش وتاری رەخنەیی ئەنووسی. لەبواری ئارشیفو کەلەپووریشدا کاری ئەکرد. دانیشتن لەگەڵ "دڵشاد"دا خۆش بوو، قسەی دانار دانار بوو. بەڵام دڵشاد تەمومژاویش بوو، نەتئەتوانی بەچاکی بیخوێنیتەوە. هەر لەسەرەتای هەفتاکاندا بوو، شەوانە تۆزێ لەئێمە درەنگتر ئەهات بۆ یانەی مامۆستایان، دوو ئەوەندەی ئێمەی بەماوەیەکی کەم ئەخواردەوە، شەوێکیان لەژێر مێزەکەوە قاچێکی دا لەقاچمو تەماشای ژێرەوەم کرد لوولەیەکی پێچراوە بوو، لێموەرگرت. بەرلەوەی بڕۆمەوە، لەتوالێتەکە تەماشام کرد. لوولەکە هەمووی پڕبوو لەبەیاننامەو بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی ڕەنجدەران. پێم سەیربوو، ئەم پیاوە لەخۆیەوە ئەمانە ئەداتە دەست من، دووجاری تریش، ئەمەی دووبارە کردەوە.
وەریئەگرم، هەروەیی‌و نازانیت چۆن ئەبێ‌و چیت بەسەردێ؟ وەریناگرم ئەوسا ئەڵێ کابرا ترسنۆک بوو، لێی وەرنەگرتم! ئیتر ناچار بووم، هاوڕێیەکی نزیکی هەردووکمان ڕاسپێرم تاپێی بڵێ واز لەم هەڵسوکەوتە سەیرە بێنێ‌و ئەو چووزانێ منیش ئەو بڵاوکراوانەم دەست ناکەوێ. هەر لەو دوو ساڵەدا، کۆمەڵە، لەشاخ کۆنفرانسی گرتبوو. لەشاریشەوە نوێنەرەکانیان بەنهێنی‌و بەدەمامکەوە چووبوون .

برادەرێک بۆیگێڕامەوەو وتی: (دڵشادیش لەوێ بوو). وتم: (چۆنت زانی؟!)، وتی: (باشە دڵشاد با لەباتی دەمامکێ دووانیش بکات بەقەدو بالآیا کێ نایناسێتەوە!). هەر لەو وەختانەدا، گوایە ئەم خۆی تۆڕی ڕێکخستنی خۆی هەبوو، ئەیانویست پارێزگاری سلەیمانی؛ شێخ جەعفەر لەناوبەرن. گێڕایانەوە چۆتە دەرەوەو کاک نەوشیروانی بینیوەو مەسەلەکەی لەگەڵدا باسکردووە. کاک نەوشیروان پێیوتوە: (کاک دڵشاد تۆ شاعیری و ئەدیبی کوا ئەمە کاری تۆیە؟!). ئەویش لەوەلامدا وتویەتی: (ئێستا ئێوە ناتانەوێ ئێمە شێخ جەعفەر لەناو بەرین؟!) ئەویش وتبووی: (با.. فەرموون چیتان ئەوێ با بتاندەنێ!). لەدوایشدا وەختێ ویتسبوویان کارێکی وائەنجامبدەن، هەر لەناو خۆیانەوە، هەنگاو بەهەنگاو ئاسایش ئاگای لەجووڵەیان بووەو لەژێر چاودێریدا بوونو ئاکام ژنبرایەکی خۆیشی سەری تیاچوو! بەڕاست ئەم کارانە کوا کاری شاعیرو نووسەرو هونەرمەندە. لەمفاوەزاتی (١٩٨٤)دا هێشتا شەڕ نەببۆوە، وتیان دڵشاد لەماڵی کاک شەهاب عوسمان-ە .

من و بێگەردیش حەزمانکرد سەرێکی لێبدەینو چووین بۆ لای، وەختێ دڵشاد-مان بینی یەک پارچە لەفیشەکدا زەردی ئەکردەوە. کلاشینکۆفو دەمانچەو ئەتوت تائێستە ناتۆزێکی تر لەوناوە ئەبێ بەجەنگی مەغلوبە. ئەم دیمەنەمان زۆر پێ سەیر بوو، شیرین خانی هاوسەریشی لەوێ بوو. دوای قسەکردن شیرین خان بەمنی وت: (بەخوا کاک شێرکۆ ئەمجارەیان ئەبێ پێشمان کەویتو پێکەوە بین). منیش لە وەلامدا وتم: (با کاتی خۆی بێ بزانین چۆن ئەبێ). دیمەنەکان دراماتیکی بوون، ئەم پیاوە بۆ وائەکات؟! هەر لەو سالانەدا، دیسان هەر لەیانەی مامۆستایان، لەتەنیشت بارەکەیەوە، ژوورێک هەبوو، چۆڵ بوو، بەئیدارەمان وت و ئیتر شەوانە بۆ خۆمان لەو ژوورەدا دائەنیشتین دوور لەهەمووانو سەرمان ڕەحەت بوو. تەختەیەکی ڕەشیش بەدیوای ژوورەکەدا هەڵواسرا بوو .

شەوێکیان دڵشاد؛ خۆیکرد بەژووردا‌و دوای چارەکە سەعاتێ هەستایە سەرپێیان و کلۆ تەباشیرێکی گرت بەدەستەوەو وەک لەپۆلی قوتابخانەدا بێتو دەرس بلێتەوە. بەو جۆرە کەوتە نووسین لەسەر تەختەکە..

مارکسی لینینی یەعنی چی؟ و ئێستا کۆمەڵە پێکهاتووە لەچەند باڵ؟ و هەر باڵەی لەچی؟و چی پێکهاتووە؟! لەم قۆناغەی ئەمڕۆدا ئەبێ چیبکرێ؟و چی نەکرێ؟و نزیکەی چل دەقیقەیەک خۆی قسەی ئەکردو ئێمەیش سەیرمان

ئەکردو ئەیشترسایین لەپڕێکدا یەکێکی نەیار خۆی بکات بەژووردا‌و لەخۆڕایی هەموومان تووش بین. بەهەرحاڵ ئەو شەوە سەلامەت بووین‌و بەڵام بۆ سبەی شەو کەهاتینەوە یەک قفلی گەورە لەدەرگاکە درابوو .

دلشاد چووە دەرەوە بۆ شاخ، هەروەها منیش، دواتر ئەو تەسلیمبۆوەو بوو بەسەرۆک یان سکرتێری یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلەیمانی‌و چوو بۆ مەربەدی بەسرەو لەجموجوڵدا بوو. لەمانگی پێنجی (١٩٨٥)دا من لەسێروان بووم، هاوڕێم کاک عومەر عەبدوللا "مولازم عومەر"، هەر لەناو بارەگاکەی خۆیدا ژوورێکی دابوومی‌و لەوێدا ئەژیام. هێشتا نەچووبووم بۆ ڕاگەیاندن و ڕادیۆ لەبەرگەلو. ڕۆژێک کاک عومەر شەش حەوت لاپەڕە فۆلسکابێکی دامی‌و وتی: (ئەمە بخوێنەرەوە). کە دەستمکرد بەخوێندنەوە. هەر تەواو سەرسام بووم. ڕاپۆرتێکی دوورو درێژی دلشاد بەخەتی خۆی بۆ ئاسایشی گشتی، کۆشکی کۆماری، لەخواریشەوە وێنەی لێدابوو بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو یەکێتی هتد.. ئەی خوایە ئەمە چییە؟ !

ڕاپۆرتەکە باس لەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان‌و ڕێکخستنەکانی بوو. خەتی ئارام‌و خەتی خاڵە شەهاب‌و بۆ ئەوە ڕوویداو دواتر چی بەدواداهات‌و لەم بابەتە. بەکورتی تەفسیرکردنی بارودۆخی سیاسی کوردو لێکۆڵینەوەیەک بوو لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵە !.

باشە ئەمە بۆچی وێنەی لێدراوە بەیەکێتی؟! مەبەست لەم ڕاپۆرتە چییە؟! ئایا بۆ سەرلێشێواندنی ئاسایشی عێراقە؟! یان چی؟! ئێستاو ئەوسایش من بۆم هەڵنەهات ئەم ڕاپۆرتە چی بوو؟! یان بۆ ئەمەی نووسیوە. دواتر کاک دلشاد گیرا، من ئەو کاتە لە دەرەوەی وڵات بووم. دەنگ بڵاوبۆوە وەڵلا لەسەر ئەوە شەهید کراوە، چونکە لە قوتابخانەدا دەرسی بەپیتی لاتینی وتۆتەوە! من ئەمە نەئەچووە عەقڵمەوە. بەڵام وەختێ شەهیدکرا، من یەکسەر خەیاڵم چووە لای ئەو ڕاپۆرتە. ڕەنگە ویستبێتی یارییەکی وا ترسناک لەگەڵ بەعسدا بکات!. بەعسیش ئەو گەمانە قبوڵ ناکاو هەرگیز بوارنادا خاوەنەکەی دوو سەرە پەکڵۆزبێ و لەسەری ئەدا.

بەداخەوە دلشاد لەتەمەنێکدا بوو هێشتا زۆری پێبوو بۆ ئەوەی لەبەهرەی جوانی خۆی ببەخشێ. بەتایبەتی لەبواری ئەدەب و کەلەپووردا. من بۆ خۆم وێڵی ئەوەم ڕۆژێ لەڕۆژان لەهەر لایەکەوە بێت پەردە لەسەر چۆنییەتی گرتن

و شەهیدبوونی هاوڕێمان دڵشاد مەریوانی هەڵبدرێتەوە، بۆ ئەوەی ڕاستییەکان چۆنن وەک خۆیان بکەونە ڕوو!

یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلەیمانی لەکاردا بوو، جموجووڵو کۆڕبەستنی بەردەوام بوو. من ئەو کاتە تەنها هەر ئەندامی لقەکە بووم، بەڵام هاوبەشی چالاکییەکانم ئەکرد، هاموشۆی بارەگاکەم ئەکردو پێشنیازی خۆشم ئەدانێ. لێرە بەدواوە ئەوەی پەیوەندی بەیەکێتی نووسەرانی کوردەوە هەیە، تاهەڵوەشاندنەوەی، چەند ڕووداوێکی ئەدەبیو ڕۆشنبیری گەورەن، کە لەڕێبازی پڕ لەشانازی نووسەرانی کورددا لەبەرچاون، پێویستیان لەسەر وەستانو ڕوونکردنەوە هەیە:

*لەساڵی (١٩٧٨)دا سەرۆکی لقی یەکێتی نووسەرانی کورد لەسلەیمانی ئەژی گۆران بوو. بۆ بەستنی کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتی لەهەولێر حکومەت خۆی لیژنەیەکی ئامادەکاری دروستکردبوو. لەمانگی نۆی هەمانساڵدا کۆنگرە گیرا، زۆرینەی ئەندامان بەشدارییان تێدا کرد. سەرئەنجام بڕیاری باشی تێدادرا. لەم کۆنگرەیەدا کۆمەڵێ لەئەندامانی یەکێتی سەر بەدەوڵەت، کە لە دە دوانزەیەک تێپەڕیان نەئەکرد ویستیان یەکێتی بخەنە ژێر ڕکێفی (عەبدولغەفار سائیغ)ەوە، کە لەو سەردەمەدا ئەمینی گشتی ئەمینداریێتی ڕۆشنبیریو لاوانی هەولێر بوو. غەفارو پیاوەکانی ئەیانویست هەرچۆنێک بێت دەست بەسەر یەکێتیدا بگرنو ئەدیبانو نووسەران دەستەمۆ بکەن، بووکە سەماکەرەکانی غەفار بەڵێنی درۆیان بەغەفار دابوو، تەنانەت یەکێکیان وتبووی من هەر خۆم پەنجا ئەدیبتان لەسلەیمانیەوە بۆ ئەهێنم! بەڵام کۆنگرەی پێنجەم بەپێچەوانەی خواستو ئارەزووی ئەوانەوە لەیەک ڕیزی پتەودا ڕووبەڕووی غەفارو ئەو دەستەیە وەستایەوە کەلایەنگیری پلانەکانی حکومەت بوون. ئەو ڕۆژانەی کۆنگرە، ئەندامانی یەکێتی بەچاوی خۆیان هەڵوێستی ترسنۆکانەی ئەو کەسانەیان بینی. هەڵوێستی هەردوو برایان د.عیززەدین و کاکە حەمەی مەلا کەریم پیاوانەو بوێرانەبوو. هەروەکوو چۆن دواتریش لەبەردەمی خالید عەبدو عوسمانی وەزیری دەوڵەتدا هەڵوێستی ئازایانەو ئەدیبانەی خۆیان لەو ڕۆژگارە سەختەدا نیشاندا .

دوای چەند ڕۆژ کۆڕی بەیانیانو ئێوارانی کۆنگرە بۆ تەعدیلی پەیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆی یەکێتی، دوای تەنسیق بۆ دەرکردنی بڕیارەکان، ئینجا هەڵبژاردنێکی دیموکراتیانە ئەنجامدراو دەستەی بەڕێوەبەری باڵای یەکێتی

هەڵبژێردرا، کە من یەکێکیان بووم‌و لەدەستەی بەڕێوەبەریشدا بووم بەسکرتێری ڕۆشنبیری یەکێتی نووسەرانی کورد.

ئێمەی ئەندامانی سلەیمانی دوای گەڕانەوەمان ئیتر خۆمان ئامادەکرد بۆ هەڵبژاردنی لق. هەر لەو سەردەمەدا، کۆمەڵێ نووسەری تر کە تائەوکاتە نەبووبوون بەئەندام، ئەوانیش ئەنکێتی بوون بەئەندامیان پڕکردەوەو بەر لەهەڵبژاردنی لق هاتنە ناو یەکێتییەوە. لەکۆنگرەی یەکەمی یەکێتی نووسەرانی کوردەوە تائەوکاتە، ئێمە نزیکەی نۆ ساڵ بوو لەکاردا بووین. نۆ ساڵ بوو ئەو خاکە بەپیتەمان ئەکێلا، لەتەمەنی خۆمان ئەخستە سەر تەمەنی ئەو. ئەمانەیش هەر بۆ سەربەرزی قەڵەم‌و خۆشەویستیی وشەی کوردی بوو. ڕۆژێکیش لەڕۆژان بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵانە منەتمان بەسەر کەسدا نەکردو ڕەنجی کەسیشمان بەبای بێوەفایی بەبا نەکردو، نەمانوت هەر ئێمە بووین‌و کەسێتر نەبوو. نەمانوت لەفلان میهرەجان‌و فیسار کۆنگرەو کۆڕدا ئاوا چەپڵەیان بۆ لێداین. بەو جۆرە پەنجەمانکرد بەچاوی کەسانی تردا، ئاوایش ئازا بووین!. بەدرێژایی نۆ ساڵ ڕۆژێ لەڕۆژان ئەرکی سەرشانی خۆمان، بەخۆ هەڵکێشانی قەڵەمی خۆمان‌و بچووککردنەوەی قەڵەمی کەسانی تر، لە قەڵەم نەدا. بێگومانە بیروباوەڕی سیاسی‌و ئینتیمای حزبی نزیکەی دە ساڵ قەوارەی یەکێتی و ڕیزەکانی یەکێتیمان پاراست. هەڵەمان ئەکردو بەڵام ڕاستمان ئەکردەوەو کەسیشمان لەبەر هەڵەی هەڵوێستێکو لەبەر فیکری سیاسی‌و ئایدیۆلۆژی، ئەویتری نەئەخستە قەفەزی تاوانباری‌و ئیدانەکردنەوە. هەمووومان یەکێتی نووسەرانمان بەماڵی خۆمان ئەزانی. جا ئیتر کوڕانی ئەو ماڵە هەریەکەو بیرکردنەوەی سیاسی خۆیان چۆن بوو، سەربەست بوون، بەڵام لەناو ماڵدا، بەرژەوەندی و سەربەخۆیی ماڵەکە، ئامانجی هەموومان بوو. بەڵێ گەلێجاریش لەناو یەکدا ڕەخنەمان لەیەکتر ئەگرت .

بەڵام لە سنووری ڕەخنەدا دوور لەبریندار کردن‌و سڕینەوەی شەخسییەتی کۆمەڵایەتی یەکتر و دوور لەگفت و دەم و دووی نادیموکراسیانە. خۆ ئەو کاتەی ژمارەیەکی زۆر لەنووسەرانی کورد ڕوویان کردە شاخ‌و چوونە ناو شۆڕشی ئەیلوولەوە، کێشەی نێوان نووسەران‌و یەکێتی هەر هەبوو. جیاوازی ئایدیۆلۆژی‌و فیکری سیاسی جیاجیا هەر هەبوو. کەم و زۆر نەگونجاندنی نێوان ئەندامان هەر هەبوو. ئەو نووسەرانەی هەڵوێستی چوونە پاڵ شۆڕشیان هەڵبژاردو مانەوە هەر هەبوون. تەنانەت ئەندامانی یەکێتی وا هەبوون سەنگەری

دژ بەشۆڕشی ئەیلولیان هەڵبژاردو لەجەبهەی وەتەنیو تەقەدومیدا بوونو لەڕۆژنامەکانیاندا ئەیاننوسی "ڕێکخراوەکانی حزبەکەمان شان بەشانی سوپای دلێرمان لەنەبەردە چەکدارییەکاندا بەشدار بوون و هەر لەو نەبەردانەدا هەشتا شەهیدماندارەو دووسەد بریندارێشمان هەبوو" یان "یاسای ئۆتۆنۆمی کەزادەی پێشنیازی بەرەی نیشتمانی و پێشکەوتووخوازەو لە (١١)ی مارتی (١٩٧٤)دا ڕێکخراو لەلایەن دەوڵەتەوە دەرچوو، زادەی پێکەوە سازانی حزبەکەمان و حزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب بوو!" تا لەو کاتانەدا ئەندامی یەکێتی نووسەران هەبوون لەڕیزی ئەو حزبەدا بوونو لەوەیش زیاتر چەکدار بوونو شوێن مەفرەزەکانی پێشمەرگە ئەکەوتنو شان بەشانی هێزەکانی بەعس ئازادیخوازانیان دەستگیر ئەکرد. ئەم قسانەم هەر بۆ ئەوە بوو بڵێم، کەسێک ماڵی لەشووشە بێت ناکرێ بەرد بگرێتە ماڵی کەسانی تر .

لێرەدا لەجێگەی خۆیدایەتی ئاماژە بەوە بکەم قەڵەمی دەم پیسو نەخۆشی وا هەیە، ئەوە سی ساڵ زیاترە بەسەر مندا ئەڕشێتەوە. بەدەیان جنێونامەو شیعرۆکەی لەسەر داناومو تەنانەت هێرشی زۆر بێ شەرمانەی کردۆتە سەر خاوو خێزانو پەیوەندییە تایبەتییە شەخسییەکانی ژیانم، بەڵام من بێدەنگ بووم. چونکە نەمویستووە دابەزمە ئەو ئاستە نزمانە، زۆریش پەشیمانم لەوەی کە لەساڵی (١٩٨٤)دا و تەنها جارێک لەگەڵ دەستەیەک نووسەرانی هاوڕێ، ڕاستەوخۆ تووشی وەڵامدانەوەیەک بووم. کە ئیتر ببڕای ببڕ دووبارە نەبۆوەو نایشبێتەوە! با ئەوە بۆ خەڵکیو پاشەڕۆژو بەرهەمەکانمان بەجێبهێڵین.

لەشارەکانی هەولێرو دهۆکو سلەیمانیدا، لەبەر ڕۆشنایی بڕیارەکانی کۆنگرەی پێنجەم، لقەکان هەڵبژاردنی تازەی خۆیان کرد، خۆ پاڵاوتنو هەڵبژاردنەکان سەربەست بوونو هیچ دەستێکی تێوەرنەدرا. لە سلێمانی ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران خۆیان بۆ لقی سلەیمانی پاڵاوت. لەئەنجامی دەنگداندا، دەستەی بەڕێوەبەری تازەی لق هەڵبژێردرا. کە بەشی زۆری کارگێڕانی بریتی بوون لەو ئەندامانەی لەخولەکانی پێش (١١)ی ئازاری (١٩٧٤)یشدا ئەندامی لقی یەکێتی بوون، لەسلەیمانی جموجوڵو چالاکییەکی زۆر ئەدەبی، ڕوویانکردەوە باخچەکانی بارەگای یەکێتی نووسەران.

دەستەی بەڕێوەبەری مەرکەزیش، لەبەرنامەی کارەکانی داهاتووی خۆیدا پلانی گەلێ میهرەجان و کۆڕی ئەدەبیو دیداری بۆ ڕۆژگاری داهاتوو دانا. یەکێک لەو بڕیارانە بەستنی "میهرەجانی دووەمی شیعری کوردی" بوو لەشاری سلەیمانی.

میهرەجانی یەکەم‌و دووەمی شیعری کوردی بەرلەوەی جێی شانازی تاکەکەس یان کۆمەڵێ بێت، جێی شانازی هەموو نووسەرانی کوردە. چونکە زادەی بڕیارەکانی یەکێتی بوون. ئەگەر ئەو بڕیارانەو ئامادەکارییەکان نەبوونایە ئەو میهرەجانانەیش نەئەبوون. میهرەجانی دووەمیش خۆپیشاندانێکی گەورەی شاعیرانی سەر بە بەرەی گەل‌و ئازادیخوازان بوو. ڕاپەڕینێکی تری ئەدەبیی بوو. من خۆیشم یەکێک بووم لەو شاعیرانەی بەشداریم تێدا کردوو شیعری "برایمۆک و گۆرانیی و بەفر و منداڵیم" تێدا خوێندەوە. برا شاعیرەکانی تریش گەلێ شیعری حەماسییان تێدا خوێندەوە، بەلام زۆریان شیعر نەبوون‌و دروشم بوون .

شاعیری هونەرمەند، ئەو شاعیرەیە هەژێنی دڵ‌و وردبوونەوەی فیکرو سادەیی دەربڕین‌و قووڵی ناوەڕۆک لەیەک تەنی یەکگرتوودا قاڵ بکات. خۆ شیعری شۆڕشگێڕی هەر بەهاوارو نەڕەنەڕ نابێ بەشیعر .

خۆ ئەگەر لەگۆشەی ئەو ڕۆژگارە سەختەی میهرەجانەکەی تێدا گێڕاو لەڕوانگەی ئەو سەردەمەوە بڕوانینە ئەو شیعرانە، گومان لەوەدانییە دڕک بوون‌و ئەچوون بەچاوی بەعسییاندا، لەباشترین حاڵەتدا شیعری خوتبە ئاسابوون‌و بەلام شیعریەتیان زۆر کەم تێدا بوو.

یەکەمین دیداری چیرۆکی کوردی کە لەهەولێر بەسترا، چالاکییەکی گەورەو دیکەی یەکێتی نووسەرانی کورد بوو. زۆربەی زۆری چیرۆکنووسان‌و ڕەخنەگران بەشدارییان تێداکرد. یەکەمجار بوو لەمێژووی یەکێتی‌و ڕۆشنبیری کورددیدا دیداری وا بۆ چیرۆک ڕێکبخرێ. چیرۆکەکانی عەبدوللا سەڕاج و ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل و ڕەووف بێگەرد چیرۆکە دیارەکانی ناو ئەم دیدارە بوون .

لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانی د.عیززەدین و ئەکرەم قەرەداخی و حسەین عارفیش بونە مایەی لێدوان‌و گفتوگۆیەکی زۆری ئامادەبووان. لەم دیدارەدا من چیرۆکەکانی کاک "ڕەووف بێگەرد"م هەڵسەنگاند. ئەگەرچی من لەبواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا وتارو وردە باسێکم نووسیوە، بەلام بۆ خۆم نایانخەمە ڕیزی وتارە باشەکانەوە. ناوی لێکۆڵینەوەیان لێنانێم‌و لەباشترین حاڵەتدا ڕەنگە بۆ لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی یان هەفتانە دەستبدەن.

لەسلەیمانی، لەدوای کۆنگرەی پێنجەوە، چەند ئەندامێکی گێرەشێوێن‌و موزایەدەکەر بوونە هۆی ئەوەی کە تەبایی‌و خۆشەویستیی نێوان نووسەران‌و شاعیران تێکبدەن. ئەو گونجاندن‌و هەلکەوتەی جاران لەگەڵ یەکدا هەبوو تێکچوون. لەپاشملە قسەو قسەلۆکی بێ سەروبەر زۆر بووبوون. لەبەرئەوە، دەستەی بەڕێوەبەر بۆ ساڵی تازە خۆیان هەڵنەبژاردەوە، چونکە هەر تەواو دڵیان ڕەنجاندبوون و تاقەتی کارکردنیان نەمابوو.

دوای پێنج ساڵ لە نووسین‌و دانانیان، لەساڵی (١٩٨٠)دا "دیوانی دوو سروودی کێوی" کەوتە بازاڕەوە، دیوانەکە بریتی بوو لەدوو قەسیدەی درێژ، یەکەمیان کۆچ کە لەناوەڕاستی مانگی حوزەیرانی (١٩٧٥)دا لەبەغدادی نووسیبووم‌و ئەویتریشیان قەسیدەی "برایمۆک و گۆرانی بەفر و منداڵیم" بوو تابلۆی بەرگ‌و وێنەی ناوەوەی دیوانەکە لەلایەن هونەرمەند عەلی مەندەلاوییەوە کێشرابوون. ئەم دیوانە لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (الطليعة)ی کەرکوک بوون. هەروەکوو پێشتریش ئاماژەم بۆ کردبوو. هەردوو دیوانی "کازیوە" و "دوو سروودی کێوی" وەرچەرخان و گۆڕانێکی نەوعی بوون لەژیانی ئەدەبی مندا.

دوابەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولو ئەو شکستە گەورەیەی تووشیی کورد بوو، ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەعس هارترو دڕتر ئەبوو. یەکەم ئامانجی شۆڤێنییەتی عەرەب ئەوە بوو بزووتنەوە چەکدارییەکە لەناو بەرێت، ئینجا دوایئەوە وردە وردە هەموو دەسکەوتە کەلتووری‌و ئەدەبی و هونەرییەکانی تر پووچەڵ بکاتەوە. بەم پێیە، یەک لەدوایییەک هەموو ڕێکخراوە کوردستانیەکانی وەک مامۆستایان و قوتابیان و ئافرەتانی هەڵوەشاندەوە. دوایی قانونی ژمارە (٨٠)ی دەرکرد کە تیایدا "یەکێتی نووسەرانی کوردی" هەڵوەشاندەوەو لەجیاتی ئەو قانونێکی تری دەرکرد بۆ دامەزراندنی "یەکێتی نووسەران و ئەدیبانی عێراق" بۆیە بەکێردی ئەم قانونەیش یەکێتی نووسەرانی کوردی سەربڕی !

لەدوای دەرکردنی ئەم قانونەو بڵاوکردنەوەی ئیستیمارەی بوون بەئەندام جگە لە(١١) کەس، کەهەندێکیان نەئەدیبو نە لەوەوبەر ئەندامیش بوون، لەیەکێتی نووسەراندا، ئیتر هیچ نووسەر و ئەدیبێکی تر نەچوون بەپیر ئەم قانوونەوە. ئەم کێشەیە نزیکەی سێ ساڵی خایاند. تا لەئەنجامدا ڕژێم ناچار بوو، جۆرە تەعدیلێکی قانونەکەی خۆی بکات. دوای ئەم تەعدیلە ئیتر ئەدیبانی کورد بەجیاوازی بیروباوەڕی سیاسییەوە لەسەر ئەوەڕێکەوتن کە بچن بۆ هەولێرو لەوێ نوێنەری ئەدیبانی عێراق ببینن‌و دەربارەی ئەم کێشەیە گفتوگۆ بکەن .

تکایه لێرەدا سەرنجی ئەوە بدەن، ئەگەر ئەدیبێ نەیەوێو ڕەفزی ئەوە بکات جگە لەیەکێتی نووسەرانی کورد، بچێتە ئەم یەکێتییەوە، دوای ئەوەی دڵنیاشبێ کە ڕژێم یەکێتی نووسەرانی کوردی هەڵوەشاندۆتەوەو تازە یەکێتییەکەی جاران ناداتەوە. ئیتر بۆ ئەبێ لەو کۆڕەدا ئامادەبێو زۆر بەجیدیش موناقەشە بکات! من بەشبەحاڵی خۆم ئەگەر ڕام وابوایە ڕەفزی ئەو بارودۆخە تازەیەی دواتر بکەم، هەرگیز ئامادەی ئەو کۆبوونەوانە نەئەبووم. لەهەولێر کۆبوونەوەکە کرا، نوێنەری یەکێتی نووسەرانی و ئەدیبانی عێراق، ئامادەبوون. گفتوگۆیەکی زۆر کرا. داوای هەندێ تەعدیلی تازەتر کرا، تکایە لێرەیشدا هەر سەرنج بدە، هەندێ لەو برادەرانەی کەدواتر لەئێمە جیابوونەوە، لەو کۆڕەی هەولێردا هەڵئەسانو زۆر بەگەرمی موناقەشەی ئەوەیان ئەکرد: کە ئایا تەعدیلە تازەکان دوای کۆنگرە ئەبن یان پێش کۆنگرە؟! جا یەکێک کە لەبنەڕەتدا ڕەفزی ئەوە بکات کەبەهیچ جۆرێ، بەهیچ شێوەیەک، بەتەعدیلی تازەتریشەوە بێتە ناو ئەم تەجروبە تازەیەوە، ئیتر پێش کۆنگرەو دوای کۆنگرەی چی؟!!.. بەکورتی لەئەنجامی کۆبوونەوەکەی هەولێر، هەر هەمووان بەبێ هیچ موعاریزێک، واتە موعاریزی نەهاتنە ناو یەکێتییەکەوە، دوای جێبەجێکردنی ئەو تەعدیلە تازانەی داوا کرابوون، هەر هەموو ئامادەبووان، دوا بەیانی کۆبوونەوەکەیان پەسەند کرد. ئەم بەیانەیش بەزمانی عەرەبی لەگۆڤاری "الثقافە"ی "سەلاح خالس"دا لەدواییشدا بە کوردی لە "نووسەری کورد"دا بڵاوکرایەوە.

لە سلەیمانی و بەئامادەبوونی سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد د.عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ و جێگرەکەی کاک محەمەدی مەلا کەریم، لەهۆڵی یانەی ئەزمڕ کۆبوونەوەیەک بۆ دابەشکردنی ئیستیمارە بەسەر ئەنداماندا ڕێکخرا، ئێمە، کەزۆربەمان پێکئەهێنا لەهەولێر چیمان بڕیاردابوو هەروامانکرد! بەڵام کەمایەتییەکەی تر، ئەو بڕیارانەی کە لەهەولێر وەک سەرئەنجام موعاریزیش نەبوون. لەسلەیمانی پەشیمان بوونەوەو وتیان "ڕای ئێمە وایە کە هەر ئەبێ، یەکێتی نووسەرانی کورد هەبێو سەربەخۆ بێت" ئێمە ئەمانزانی کە ئەم قسانە، قسەی پاش باران کەپەنکیان پێ ئەوترێ. چونکە بەعس بەقانونی ئەوەی هەڵوەشاندەوەو ئەمیتری لەجێگە دانا .

ئێمە وتمان: کام ئەدیب و نووسەر هەیە حەز بەوە نەکاتو لەگەڵ ئەوەدا نەبێت یەکێتی نووسەرانی کورد سەربەخۆ نەبێت، بەڵام ئەمڕۆ، دوای ئەم تەعدیلەو دوایئەوەی تەعدیلەکانی تریشمان بۆ بکەن و بەڕەسمی بڵاوی بکەنەوە، بەلای

ئێمەوەو لەم ڕۆژگارەدا، نیوە دەسکەوتێ باشترە لەهیچ. ئیشکردن باشترە لەئیش نەکردن. گۆڤارێکت هەبێ باشترە لەوەی هیچت نەبێ‌و وتمان: ئێمە بۆ ئەم بارودۆخە نالێین یان هیچ یان هەموو شتێ‌و ئەمە هەڵەیە. لەکاتێکدا لەحاڵەتەکەی تریشدا ئێمە هەر خۆمانین‌و خۆمان کاروبارەکان ئەبەین بەڕێوە.
یەک مانگی نەخایاند لەسەدا نەوەدی ئەندامانی یەکێتی لەهەموو لقەکاندا، ڕاوبۆچوونی ئێمەیان پەسەند کرد. دوای چاوەڕوانی، تەعدیلەکان نەکران! لەپڕێکدا لەبەغداوە داوای کۆبوونەوەیەکیانکرد. کەناویان لێنابوو کۆنگرە، بۆ ئەوەی دەستەی بەڕێوەبەری مەرکەزی هەڵبژێرن، ئێستا لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە هەڵوێستی ئێمە چی بوو؟! بێگومان ئێمە ڕەفزی ئەوەمانکرد بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە بکەین کەکردیان بە کۆنگرە. لە هەولێر جاڕی کۆنگرەیەکیاندا، ژمارەی ئەوسای ئەندامانی یەکێتی لە(١٠٠) ئەندام زیاتر بوون، بۆ ئەم کۆنگرە داتاشراوەی هەولێر تەنها (٣٠) کەس ئامادەبوون‌و بەمجۆرە دوور لەویست‌و خواستی نووسەرانی کورد، بەعس ئەو یەکێتی نووسەرانەی خۆی ئەیویست، ئەوەی دروستکردو هێندەشی پێنەچوو ڕوومکردەوە شاخ.!
ئیتر ئەوانەی دواتر کەوتنە موزایەدەکردن‌و هەڵوێست فرۆشتن‌و خۆ گیفکردنەوە، لەوە زیاتر کەکۆمەڵێ درۆو دەلەسەیان چنی‌و بەشان‌و باڵی خۆیاندا هەڵیانداو هەر خویان لەناو خۆیاندا کەوتنە شاباشی یەکتری، شتێکی زیاتر نەبوو، وەک وتوشیانە ئەوانە بەشوێن شتێکدا ئەگەڕان‌و قرەقرِی بوونیان لەسەر ئەکرد، کە لەخۆیاندا نەبوو (ئەویش هەڵوێستی کوردستانییانە بوو). ئێمەومانانێ، کە لەهەرزەکارییەوە کوردستانی بوونمان لەگەڵ خۆماندا هێنابوو، لەسەردەمی عێراقچێتی کۆمۆنیستەکانەوە لەشەڕدا بووین لەگەڵ ئەواندا، تازە ئیتر کێ بڕوای بەقسەیەک ئەکرد بنەمای نەبێ‌و ئێمە بکەوینە خانەی (عێراقچێتی) و ئەوان "کورستانی"یەوە، ئێمە سەربەخۆیی یەکێتی نووسەرانی کوردمان نەوێ‌و ئەوان بیانەوێ!. بەڵام ئێمە لەو ڕۆژگارە سەختەدا بوونی پەنجەرەیەکمان پێباشتر بوو لەهیچ. دەسکەوتێکی بچووکمان لاباشتر بوو لەهیچ، کە ئەوانەیش نەبوون‌و نەکران. ئەوسا ئێمەیش وتمان: (نە..)!
لەساڵی ١٩٨٢دا "پیرەمێردوزەریا"م لە عەرەبییەوە بۆ کوردی وەرگێڕا. کاک کەمال میراودەلی؛ لەگەڵ ئەسڵی دەقە ئینگلیزییەکەیدا بەراوردی کرد، مامۆستا شوکر مستەفا پێیداچوویەوەو لەدواییدا بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کوردی

لەبەغدا چاپیکردو بڵاویکردەوە. لەنێوان ساڵانی (١٩٨١-١٩٨٣)دا چوومە ناو ئەزموونێکی تری شیعریو ئەدەبییەوە. ئەویش نووسینی چیرۆکە شیعر بوو .

"داستانی مامەیارە" و "بەردە قارەمان"، دوو هەوڵی تازەبوون. سەردی شیعری بوون. ئاوێتەکردنی زمانی مەجازو زمانی مەنتیقی چیرۆک بوون، نەشیعری پوخت بوون و نە چیرۆک، پێکهاتەیەک بوون لەهەوێنی هەردوو هونەرەکە. وێنەی شیعر بوون لەفەزای چیرۆکدا. یان تێکستێکی والابوون بۆ هەردوو ژانرەکە. یان، جەستەیان شیعرو فەزایان چیرۆک بوو، چیرۆکە شیعر دیاردەیەکی کۆنە لەئەدەبی میللەتاندا، بەڵام نووسینیان لەسەردەمی تازەدا و بەبینینێکی تازەو دارشتنێکی هاوچەرخانەوە ئەفراندنێکی جیایە لەکۆندا زیاتر لە"نەزم"ەوە نزیکبوون، بەڵام لەئێستادا شیعریەتی گێڕانەوە، لەبیناکردنێکی درامیدا، جەوهەری ئەم هونەرەیە. ئەمە جگە لەوەی ئەم هونەرە لەڕۆحی خەڵکەوە نزیکترە، چونکە مێژووی کەلتوری لەپشتەوەیە، کارکردنە لەناو مێژوودا. نەک وەک گێڕانەوەی مێژوونووس بەڵکو وەک گێڕانەوەی پاراو بەشیعر. لەحاڵەتی یەکەمدا زمان بێ باڵو خەیاڵو لەدووەمدا لەفرین و بەرزبوونەوەدایە، ئەو کاتەی ئەدەب مێژوو بەسەر ئەکاتەوە، ناوەوەی مرۆڤو قوڵایی ڕووداوو بەسەرهاتەکان ئەخوێنێتەوە. لەنهێنییەکان ئەگەڕێت بۆ دۆزینەوەی جوانیو حەقیقەتە شاراوەکان .

لەداستانی مامەیارەو بەردەقارەماندا، هەوڵمداوە ئەو پەنهانانە ببینم، کەمێژوونووس بەدوایاندا ناگەڕێ لەم ئەزموونەدا، چەند چیرۆکە شیعرێکی ترم نووسیو بۆ یەکەمجار لەساڵی (١٩٨٣)دا بەناوی "ڕووبار"ەوە چاپمکرد و بڵاوبۆوە. دوای ئەم بەرهەمەو لەکۆتایی (١٩٨٤)دا چوومە شاخ، ئیتر ئەوە دوا کتێبی ئەو سەردەمە بوو کە لەشاردا نووسیبووم.!

لەکۆتایی حەفتاکاندا پەساپۆرتێکم دەرهێناو لەگەڵ هاورێم "ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل"دا سەفەرێکی رۆمانیامان کرد. دیناری عێراقی ئەو کاتە نزیکەی سێ دۆلار بوو. لەبەرئەوە سەفەرێکی بۆ وڵاتەکانی رۆژهەڵاتی ئەوروپا پێئەکراو سەرو زیادیشی بوو. سەفەرەکەمان لەبەغداوە بەپاس تاموسڵو لەوێشەوە بەشەمەندۆفێر تا ئەستەمبوڵ .

رێگەیەکی دوورو درێژ بوو، کاک ئەحمەد لەوەوبەر (بوخارست)ی دیبوو، جگە لەوەیش بۆ ناو تورکیا زمانی تورکیشی ئەزانیو پەکمان نەئەکەوت. پێموایە دوو رۆژێ لەئەستەمبوڵ ماینەوەو چووینە بسفۆرو لەوێشەوە بەکەشتی گەشتیاری چووینە پێنج دوورگەی هاوینەهەواری ناو دەریاو دنیایەکی ترمان بینیو دواییش لەئەستەموڵەوە بەفرۆکە سەعاتە رێیەک گەیشتینە بوخارست .

دیارە ئەوە یەکەمجار بوو لەژیانمدا سواری فرۆکە ببم. لەناو فرۆکەکەدا بەکاک ئەحمەدم وت: (ئەوە ئیتر من زەریاشم دیو سواری فرۆکەیش بووم، لەبەرئەوە ئیتر "د.مارف" ئەو پرسیارە لەمن ناکات، کە ئایا زەریام دیوەو سواری فرۆکە بووم؟! واتە ناشارستانی نیم). پێموایە لەکۆتایی پەنجاکانو سەرەتای شەستەکانی رابووردوودا بوو، ئەو کاتەی کۆمۆنیستەکان تەپڵیان بۆ وڵاتە سۆشیالیستەکان لێئەداو یەکێتی سۆڤیەتییان بەقەڵای گەلان ناو ئەبردو

نووسەرێکیشیان لەڕۆژنامەی "ژین"دا وتارێکی بەناوی "ڕۆمانیای تێرو تەسەل"ەوە بڵاوکردەوە. وەختێ لەفڕۆکەخانە دابەزین، من ئەو وتارەم بیرکەوتەوە. جارێ هەر لەفڕۆکەخانەکەوە پەڕپووتیو پیس و پۆخڵیم بینیو دوای ئەوە گەیشتینە لای کابینەی پەساپۆرت پشکنین، من نەمئەزانی مەسەلە چییە، کابرای ناو کابینەکە، زۆری ڕاگرتم تومەز چاوەڕوانی ئەوەیە شتێکی بخەمە دەستەوە، ئیتر قسەکەی ئەحمەدیشم بیرکەوتەوە کە ئەبێ دەستبکەم بەخۆمدا، ئەوسا دوو دۆلارێکم خستە بەردەمیو کابرای ڕۆمانیای تێرو تەسەل پێکەنیو مۆرەکەی لەپەساپۆرتەکەداو تێپەڕیم .

واتە هەر لەیەکەم هەنگاوەوە، تێگەیشتم کە ئەمە ڕۆمانیای بەرتیلو فڕوفێڵە. دوای ئەوەی تاکسیەکمان گرت، چووینە ناو پایتەختەوەو بەرەو ژوورر بووینەوە. تا گەیشتینە گەڕەکێ هەموو ئاپارتمانی بەرز بەرز بوو. ئەحمەد پێشتر لەشوقەیەکداو لە پیرێژنێ ژوورێکی بەکرێ گرتبوو. شوقەکە ناخۆش نەبوو. هەر ئەو شەوە خۆمان گۆڕیو سواری پاسی حکومی بووینو چووینە سەنتەری پایتەخت. من لە پاسەکەدا، هەموو شوێنەکانم لەزەینی خۆمدا دەست نیشان ئەکرد. پیاسەمان کردو چووینە باڕێکو دانیشتین. شەو درەنگان، وەختێ گەڕاینەوە، سواری پاسیی هەمان خەت بووینەوە، بەلای ئەحمەدەوە سەیر بوو کەوتم بالێرەدا دابەزین، چونکە ئەوەیان ئەپارتمانەکەی خۆمانە! دوای دوو سێ ڕۆژ، کاک ئەحمەد وتی: ئەم شوێنە چەپەکەو دوورەو بابچین بۆ بەشی ناوخۆی کۆلیجەکانی زانستگەی (بوخارست)، ئێستا هاوینەو وەختێ پشووەو بەپارەیەکی کەم دوو ژوورر بەکرێ ئەگرین. هەروایشبوو. دوو ژوورمان دەستکەوت. کاک ئەحمەد ناسیاوو هاوڕێکانی خۆی دۆزییەوە، ژنە هاوڕێکەی کاک ئەحمەد، لەگەڵ خۆیدا هاوڕێی خۆی هێنابوو. بەمجۆرە دوو قۆڵی بوو بەچوار قۆڵیو دانیشتنەکانمان گەرمترو جوانتربوون. کاک ئەحمەد؛ کەمێکیش ڕۆمانی فێرببوو. لێرەو لەوێش بەئینگلیزییەکی شەقو شڕ، هەرچۆنێک بوو پینەدۆزی خۆمان لەزمانێکدا ئەکرد کە لەهیچ نەئەچوو .

کاک ئیبراهیم؛ (بلە ڕەش)ی هاوڕێمانو خەڵکی سلەیمانی، لەدەمێکەوە لەڕۆمانیا بوو، هەر لەوێش خوێندنی تەواو کردو هەر لەوێش ژنی هێنا. کاکە بلە زۆربەی زۆری شوێنە خۆشەکانو مۆزەخانەو باخچە گەورەکانی گێڕام. تالەوێ بووم دوو سێ جار یەکتریمان بینی، یەکێک لەخۆشترین باخچەکانی بۆخارست ناوی "هیرۆسترۆ" بوو، دواتر بوو بەئەستێرەی شیعرێکم. نزیکەی بیست ڕۆژێ

لەبوخارستماینەوە لەو ماوەیەدا دوای تێکەڵاوبوون لەگەڵ ڕۆمانییەکاندا، لەوە گەیشتم، کە ئەو میللەتە چەند برسیو ڕووتو ڕەجاڵە. مووچەیەکی کەمو گرانییەکی زۆر. کەسمان نەبینی لەژیانی خۆی ڕازی بێ! هەموو خەویان بەوەوە ئەبینی بگەنە ئەڵمانیای ڕۆژئاواو نەگەڕێنەوە. گاڵتەیان بەزاراوەی سۆشیالیستی ئەکرد، بەڵام هەر هەموو تۆقێنرابوون، دنیاو دارو بەرد پۆلیسی نهێنی بوون. وێنەکانی "شاوشیسکۆ" بەهەموو شوێنێکدا هەڵواسرابوون. ڕۆمانیا هەر لەوێنەی ئەو دیکتاتۆرەدا تێرو تەسەل بوو! خەڵکێکی کڕو بێدەنگ. وەک لەوێ شەوێکیان حسابیانکرد. پارەی یەک دەعوەتی تێروتەسەلی سەر مێزەکەی ئێمە بەدۆلار پێمانبوو، ئەیکردە مووچەی مانگانەی فەرمانبەرێکی بچووک .!

لەناوەڕاستی پایتەخت بترازایتایە، ئیتر گەڕەکو ناوچەکانی تر کۆنو داڕزاو بوون. ژنانی لەشفرۆش ڕێژەیەکی ئێجگار زۆریان لەڕۆمانیای تێروتەسەلدا هەبوون!. کە وەختمان تەواو بوو بەهەمان ڕێگەدا گەڕاینەوە .

بەڵام بارمان تەواو قورس بووبوو، چونکە بەپارەیەکی کەم دوو سێ جانتا جلوبەرگو پێڵاوو شتومەکی ترمان وەک دیاری کڕیبوو. شەو لەشەمەندۆفێرەکەدا قەرەباڵغییەکی زۆرو وەک ئەڵێن: یەکێک لەسەرترمان وەک دیاری کڕیبوو. لەتەماشاکردنێکی بەرپێی خۆمدا، جزدانو دەفتەرێکی بچووکم بەرچاو کەوت، کە هەملگرتەوەو تەماشام کرد، بینیم پەساپۆرتێکو نزیکەی دوو هەزار دۆلارێ بوو، ناوی خاوەنەکەی حسین بوو. دیارە لێی کەوتبوو. هێندەی پێنەچوو، پیاوێک بەشڵەژاوی زەرد هەڵگەڕاو، بەناو خەڵکەکەدا ئەگەڕا، شێت بووبوو. نەیئەزانی چیبکات. هەستامە سەرپێو چوومە لایەوە پێموت: (تۆ حسەینی) وتی: (بەڵێ)، وتم: (ئەوە پەساپۆرتو پارەکەت من دۆزیمنەوە). کابرا لەخۆشیاندا باوەشی پێداکردمو سەد ماچی کردم. وتی: (تۆ منت کڕیەوە) .

دوای گەڕانەوەم، ئەم گەشتە بوو بەقەسیدەیەک بەناونیشانی "لە یەکەم سەفەر"دا، پێموایە بۆ یەکەمجار، لەگۆڤاری نووسەری کورددا بڵاوکرایەوە، وەک چۆن ڕاکردنو هەڵاتنی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول ئێمەی تووشی نائومێدیو چۆکدادانو ڕەشبینی کردو هەموو خەونەکانی بەجارێ کوشتینو من بۆ خۆم ئیتر بڕوام بەو قیادەیەو سومبولەکەی نەماو هیچ پاساوێکیش نەیئەتوانی لەئاستی ئەو ڕاکردنو خۆبەدەستەوەدانو بەزینە گەورەیەدا هیچ قەناعەتێکی کۆنم بۆ بگەڕێنێتەوە. پێچەوانەکەیشی ئەو هەڵسانەوەو دڕ بەتاریکی دانو ورە بەرزی و خۆبەختکردنە بوو، کەکوڕانی کون لەجەرگا نەبووی

شۆڕشی تازە کردیانو سەرلەنوێ هەتاویان بۆ گیانی تاریکی ئێمەو ورەیان بۆ باوەڕو هیوایان بۆ ئایندە هێنایەوە .

من ئالێرەوە لەم ڕوانگەیەوە تەماشای ئەوانم کردوو بەم هۆیەوە لێیان نزیکبوومەتەوەو خۆشم ویستوون. خۆشەویستیی من بۆ ئەوان، دوورو نزیک پەیوەندی بە ئایدیۆلۆژێتیکەوە نەبووە، کە ئەوان هەڵیانبژاردووە. من هیچکام لە سەرکردەکانی ئەوانم پێشتر نەناسیووە. بگرە نەیاریشیان بوومو دژایەتیشم کردوون، بەتایبەتی لەجومگەی جیابوونەوەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی لەقیادەی بارزانیو لەهەلاتنیاندا بەرەو هەمەدان .

موقاوەمەت دروستبوونەوە لای من ئامانج بوو. ڕاپەڕین لەبەعسو چوونەوە بەگژ سوپای داگیرکەردا، جا ئیتر هەموو شتەکانی دیکەی لای من دوای ئەوە لەپلەی خواروتردا بوون. بۆیە وەختێ مەفرەزە سەرەتاییەکان هاتنەوە مەیدانو بێدەنگیو زەبوونیو نائومێدیان ڕووخان، من ئیتر بوومە عاشقیانو کەوتمە نووسین. ئەوە پەیامێکی من بوو بۆ موقاوەمەتو هەڵسانەوەو هەر ئەوەندەیشم لەدەست ئەهات. بەلام ڕۆژگاری خۆکوژی نێوان ئازادیخوازانیش لەناویەکدا، شەڕی ناوخۆی حزبەکانیش لەگەڵ یەکدا، کوشتنی دەیان ڕۆڵەی خۆمان بەدەستی خۆمان، جارجارە ئەبووە هۆی ئەوەی تەمومژێکی ئەستوور بخاتە سەر هیواو ئامانجو بڕواکانو بەچاوی خۆیشمان ئەمانبینی چۆن چونی دوژمن لەناو ئەو خوێنەدا شایی خۆی ئەگێڕا .

ناخۆشترین کاتی ئێمە وەختێ بوو، کە ئەمانبیست، ئەو شەڕانە دروستبوون. ئەوەی بەئێمەیش ئەکرا ئیدانەکردنی هەموو لایەکیان بوو. شەڕی ناوخۆ، کوژاندنەوەی ئەو چرایانەبوو کە لەتاریکستانی دوای هەرەسدا هەڵکرابوونەوە. کوشتنی هەر جەنگاوەرێکی ناو ئەو حزبانەیش، ناڕاستەوخۆ کوشتنی دوژمنێکی بەعس بوو. هەموو شەڕێکی ناوخۆ، چۆنیەتی هەڵگیرسانو هۆو هۆکارەکانی هەرچییەک بن. تاوان لەئەستۆی هەموو چەکدارانەو هەموویان بەرپرسن لەو خوێنانەو کەسی لێدەرناچی "قوربانیی گەورەی ئەم تراژیدیایەیش بەردەوام میللەتە هەژارەکەمان بووە."

لەنێوان (١٩٨٢-١٩٨٤)دا چەند جارێک سەفەری بەغدام کردوو هاوڕێو ناسیاوەکانی خۆم بەسەرکردەوە. زۆربەی هەرە زۆری ئەو شاعیرو ئەدیبە عێراقیيانەی من ئەمناسینو لەبەغدا مابوونەوە. چووبوونە سەر خوانی سوڵتانو چۆکیان دادابوو. هەر لەشاعیرو نووسەرو هونەرمەندەوە تاشانۆکاران. بەشی

هەرە زۆریان بووبوونە سەماکەری بەردەمی دیکتاتۆرو تەواوبوون. ئەدەب و هونەریان خەساندبوو، بارودۆخ لەکوردستاندا ئەو دنیا بێدەنگکراوەی ئەوێ نەبوو. بەشێک لە نووسەران و شاعیرانی کورد لەشاخ بوون و بەشەکەی تریش زۆربەیان سەربەرزانە خۆیانڕاگرتبوو .

ئەو سەردەمە تێپەڕیبوو، کە ئەبوایە بەپێی خۆمان بچووینایە بۆلای جەللادەکانمان، ناوچەی ئازادکراو دروستبووبۆوەو جارێکی دی شاخ ببۆوە بەپەناو دالدەی ئازادیخوازانی ئەدایەوە. لەناوەڕاستی حەفتاکاندا، سەدام حسەین وتبووی: (ڕەنگە دارخورما لەسەری مندا بڕوێ بەلام ئەوان جارێکی دی پەنجا کەسیان بۆ کۆنابێتەوە!)

چەند ساڵێک بەسەر ئەم قسەیەدا نەڕۆیشتو لەقەندیلدا ئاگرێکی تر کرایەوە، دوای ماوەیەکی کەمیش بەدەیان و دواتر بەسەدان و ئینجا هەزاران مرۆڤی تازە دروستبۆوەو موقاوەمەت زەنگی لێدایەوە. منیش درێژەم بەنووسینی شیعری موقاوەمەت دابوو. شیعرەکانی کەشکۆڵی پێشمەرگە زیادیان ئەکردو بەنهێنیش ئەمناردنە دەرەوەو لە ڕادیۆوە ئەخوێنرانەوە.

لەبەغدادی بووم کەبۆ یەکەمجار لەڕێگەی نامەکانی هاوڕێم ڕەووف بێگەردەوە، جموجووڵ و چالاکییەکانی (پ. م)م پێ ئەگەیشتو منیش لەخۆشیاندا هەر ئەوە نەبوو بەسەر فوراتا نەفڕم !.

ڕەووف بێگەرد سی و پێنج ساڵ زیاترە یەکێکە لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانم و هەتا ئێستەیش. ڕەنگە یەکێک بێت لەوانەی لە هەموو کەسێ زیاترو باشتر من بناسێ. نالێم هەموو شتێ، بەلام ئاگاداری لەبەشی زۆری ژیان و ژیانی تایبەتی و شەخسیم بووە. لەخۆشی و ناخۆشیدا هەر پێکەوە بووین. ئەگەر لەیەکیش دووربووبین نامەمان لەیەکتر نەبڕیوە. وەک دوو خێزانیش تێکەڵی یەکترین. لەدوای بەیاننامەی ئازاری (١٩٧٠) یەکترمان ناسی. شیعرو چیرۆک ئەمسەروئەوسەری ئەو پردەبوون ئێمەیان بەیەک گەیاند، نەک سیاسەت و حزبایەتی، بەلام هەردووکمان هەمیشە کوردستانییانە بیرمان کردۆتەوەو ئەو چرایە لەکوێ بووبێ ئێمەیش لەوێ بووین .

بێگەرد ئەدیبەو دڵپاکە، نازانێ ڕق و کینە بەری بەکوێوەیە، ژیانی سادەیە. بۆ ئەو ڕۆژە ئەژی کەتیایەتی و تەواو لەکۆڕی یاراندا پەروانەی دەوری بادەیەو دەنگە

خۆشەکەیشی هەمیشە سوکنایی داوە بەگیانمان. ڕەنگە من هەندێجار دڵی ئەوم زویر کردبێ بەڵام ئەو نا .!

بێکەرد؛ ئەتوانێ لەمنداڵێکەوە تاپیرەمێردێ بکا بەهاوڕێی خۆی. نەفس بەرزەو وەک ئەڵێن: (هاوڕێی ڕۆژی تەنگانەیە). بەڵام بەپێچەوانەی منەوە فزولییەو حەز ئەکا هەموو شتێ بزانێ. بەهرەیەکی گەش و زمانێکی پاراوی هەیەو خوێندنەوەی زۆرباشەو بەڵام بۆ نووسین تاڕادەیەک تەمەڵەو هەناسەی زۆردرێژ نییەو تاقەتی ئەچێ و تەنانەت هەندێجار لەبەر دیدارو دانیشتنێکی خۆش کەژیانی ئەو چەند سەعاتەی خۆش بکاتو دڵی بکاتەوە، ڕەنگە نووسینی چیرۆکێکی بۆ دوابخات .!

"ئاری" تاقە کوڕێتیو لەڕۆژگارە هەرە سەختەکانی موقاوەمەتدا چووە دەرێو بوو بە پ.م و لەناو ئەو هێزانەدا، کە ئەوسا "حەمە ڕەش" لەناوچەی قەرەداغو گەرمیان سەرپەرشتی ئەکردن .

لەدەرەوە (ڕزگار)یان پێئەوت، لەسەردەمێکدا، لەبەر دژواری ژیانو هەڵنەکردن لەناو ئەو مەترسییە زۆرانەدا، تەسلیم بوونەوە هەبوو. بێکەرد جوابی بۆ ئاری ناردبوو، (با لاشەکەتم بۆ بێتەوە، بەڵام هەرگیز نابێ تەسلیم بیتەوە!).

چۆن مەشخەڵان-م نووسی؟
بێگەرد چۆن ڕاستیکردا!..

هەروەکو لەلاپەڕەکانی پێشتردا ئاماژەم پێدا بوو، من لەناو بەرپرسانی کۆمەڵەو یەکێتیدا یەکەم کەس، کە لەڕێی ئاڵوگۆڕی نامەوە پەیوەندی لەنێوانماندا دروست بوو کاک "نەوشیروان مستەفا ئەمین" بوو. دوای ئەو بەماوەیەک ئاڵوگۆڕی نامە کەوتە نێوان منو "مام جەلال"یشەوە .

یەکێک لەو کەسانەی ئاگاداری تەواوی ئەو نامانە بوو کە لەبەیندا هەبوو بێگەردی هاوڕێم بوو. دوای ئەوانیش لەگەڵ کاک فەرەیدون عەبدولقادرو هەروەها کاک مەلا بەختیاردا نامەمان لەبەیندا هەبوو. ئێمە لەڕێگەی ئەوانەوە ئاگامان لە هەموو ڕووداوەکان بوو. تەنانەت هەندێجار، ئێمە بەر لەشانەکانی خۆیان ئاگامان لەهەندێ بڕیاری سیاسیو هەواڵو دەنگوباس ئەبوو. نامەکانی کاک نەوشیروان دوورو درێژتر بوون، ئێمە شاعیرانەو ئەدیبانە نامەکانمان ئەنووسی. هەندێجار لەو نامانەدا، ڕاستەوخۆ، ڕەخنەمان لێئەگرتن! بەتایبەتی لەو کاتانەدا، کە شەڕی ناوخۆ لەشاخ هەبوو. ئێمە بەتوندی ئەو کارانەمان لەنامەکانی خۆماندا ئیدانە ئەکرد. بیرمە جارێک لەڕادیۆوە گوێم لەوتارێک بوو، زۆر خراپو ناشیرینو نابەجێ دەربارەی شەهید "فەتاحی حەمەمین ئاغا" نوسرابوو. منیش نامەیەکی زۆر توندم بۆ نووسین .

هەروەها بێگەردو پێموایە کاک "عەبدوڵلا ئاگرین"یش بەهەمانشێوە. دواتر داوای لێبوردنیانکرد. هەرگیز خۆم لەئاستێکدا نەبینیوە ماستاوو مامەیی بۆ هیچ کەسێ بکەم. چونکە نە پێویستم پێبووەو نەهەرگیز نەفسیشم قبوڵی کردووە. جا ئەو کەسە لەهەر شوێنو پلەو پایەیەکدا بووبێ. یان لەڕێگەی ئەو پەیوەندییانەوە خوانە خواستە چاڵم بۆ هیچ کەسێ هەڵکەندبێ. من ئامادەم تائەو ڕۆژەی لەژیاندام هەر کەسێ ئیدیعاو وەهمێکی وای هەبێت بابێت و بەبەڵگەوە قسەی خۆی بسەلمێنێو ئەگەر من درۆمکردبێ چی ئەکات پێی ڕازیم؟! جاحوکمەکەی هەر سزایەک بێت .!

من؛ بەدانیشتنو قسەکردنو تێکەڵاوبوون تاکۆتایی ساڵی (١٩٨٣) نە "مام جەلال" و نە کاک "نەوشیروان"م نەناسیوە. بەرلەوەی کۆمەڵەو یەکێتیش دروست بێ. من شاعیر بوومو شوێنی ئەدەبیو کۆمەڵایەتی خۆم هەبوو. چوار پێنج دیوانە شیعرم هەبووە. تەنانەت بەرلەوەی موقاوەمەت دروست بێتەوە. من شیعری "کۆچ"م نوسیوە. لەساڵی (١٩٨٢-١٩٨٣)دا لەهاوڕێیانی شاخەوە، داوای ئەوەیان لێکردم شیعری سروودێکی تازە بۆ پ. م و شۆڕش بنووسم. لەو کاتانەدا سروودێکی وا پێویست بوو. بۆ منیش نووسینی شیعری سروودێ گران نەبوو. کەدڵی هەزاران (پ. م)ی پێخۆشبکەمو ئاگری موقاوەمەتەکە خۆشتر بکەمو ئەو شیعرانەیش بخەمە هەمووماڵێکی کوردستانەوە. شیعرەکەم نووسیو ناومنا "مەشخەڵان"و هەڵمگرت بۆ ئەوەی لەدەرفەتێکدا خۆم بیاندەمێ.

دوای شەڕی بێتواتەو سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ناوچەی بالیسان بەشی زۆری ئازادکرا، جگە لەوەیش بەنهێنیی پەیوەندیکردنو دانووسان لەگەڵ نوێنەرەکانی حکومەتدا دەستپێکرد بوو، ڕەنگە زووتریش. لەڕێگەی کاک شەهاب عوسمانەوە جوابمان ناردوو حەزمان کرد دیدەنییەکی "مام جەلال و کاک نەوشیروان" بکەینو لەگەڵیاندا دانیشین .

من و بێگەرد؛ پێکەوە ڕۆیشتین، ئەوکاتە ئەو خەتەی کارێزەو بێتواتە هاتوچۆی ئاسایی بوو. گەیشتینە گوندی بالیسانو دابەزین. پێموایە شەهاب لەچاوەڕوانیدا بوو. دیمانو بردینی بۆ ماڵەکانی خوارەوەو لەماڵێکدا دانیشتینو میوانداریيان کردین. ئەبوو کەس نەمانبینێو نەناسرێینەوە. لەبەرئەوە تائێوارەیەکی درەنگ لەو ماڵەداماینەوە. وەختێکمانزانی کاک نەوشیروان و کاک فەرەیدون عەبدولقادر خۆیانکرد بەژوردا، ئەوە یەکەمجار بوو من کاک فەرەیدون ببینم. دوایئەوەی ماوەیەک دانیشتین هەڵساینو ماڵەکەمان بەجێهێشتو لەگەڵیاندا

ڕۆیشتین. بەتەنها هەردووکیان هاتبوون‌و هیچ "پ. م" یکیان لەگەڵدا نەبوو. ئێوارەیەکی درەنگ بوو کەس نەیبینین. تاگەیشتینە بەردەمی چادرێ .

مام جەلال؛ خۆی هاتە دەرەوەو زۆر بەگەرمی پێشوازیکردین‌و چووینە ناو چادرەکەوەو بەچوارمشقی دانیشتین. ئەوە یەکەمجار بوو ڕووبەڕوو لەگەڵیدا دانیشم. من پێشتر هەر لەسلەیمانی سروودی "مەشخەڵان"م نیشانی بێگەرد دابوو. پێی باش بوو. بەڵام ئیعترازێکی لەسەر ناوهێنانی "ی. ن. ک" هەبوو. ئەو پێی وابوو ئەمە زیادەیە. چاکتروایە هەر بۆ (پ. م) بێ بەگشتی باشترە. بەڵام من لەگەڵیدا نەبووم، چونکە ئەوانم بەهێزی گەورەی هەڵسانەوەی شۆڕش‌و موقاوەمەت ئەزانی. ئەو ڕۆژگارە وابوو، لەچاوی ئێستەیشەوە تەماشای ئەو سەردەمە ناکرێ. دوای تێپەڕبوونی وەختێکی زۆر. تێگەیشتم تێبینییەکەی بێگەرد لەجێی خۆیدا بوو. عەقلیش هەموو جارێ میوانی کەس نییە. ئەو شەوە تادرەنگ دانیشتین‌و شیعری سروودەکەم دانێ و مام جەلال خستیە گیرفانییەوەو وتی: (پێویستە بەزووترین کات ئاوازی بۆ دابنرێ). هەروەکوو مام جەلال هەموو جارێ خۆی ئەیگێڕێتەوە. (ئەڵێ دامان بەکاک فەرەیدون دارتاش بۆ ئەوەی ئاوازی بۆ دابنێ. بەڵام نەیکردبوو). جا ئیتر لەبەر هەر هۆیەک بووبێ ئەمە لەکاتێکدا کاک فەرەیدون، لەزووەوە لە ڕێکخستنەکانی "ی. ن. ک"دا کاری ئەکرد. دوایی کاک ئەنوەر قەرەداخی شیعرەکەی وەرگرتبوو ئاوازیشی بۆ دانا. لە ڕۆژگارێکدا کەم کەس ئەیوێرا کاری وا بکات. ئەوەی ڕاستیبێ من لەو سەردەمەدا پەنام ئەبردە بەر هەر شتێ کە وەک سەرئەنجام دژی بەعس‌و پلانەکانی بێت‌و هێزی موقاوەمەتی پێ گەورەبێ .

سروودی "مەشخەڵان"یشم هەر لەو بڕوایەوە نووسیبوو. لە "ی.ن.ک"یشدا نەبووم. هەندێجار ئەو حەماسەتەی لای من گەرماوگەرم دروست ئەبێ بۆ خۆشەویستی هەر شتێک: ڕووداوێک، سومبولێک، ژنێک، شەهیدێک، بەجۆرێک داگیرم ئەکەن کە ئیتر توانای ڕەفزکردنم یان ڕەخنەگرتنم تێدا ئەکوژن. بەیەکجار هەموو شتەکانی خۆم ئەڵێم. ئەم سیفەتە کەعاتیفە ناونیشانێتی، زیانی زۆری پێگەیاندووم .

بۆ نموونە من کە دڵداریشیم کردووە زیاد لەپێویست باسی خۆشەویستیی خۆم کردووە، زیاد لەپێویست بەجوانیی دڵدارەکەمدا هەڵمداوە! زیاد لەپێویست خۆم بۆ کردۆتەوە. باسی وردەکارییەکانی ناو ژیانی خۆم بۆ کردووە. ئەمە لەکاتێکدا، نە ئەو کەسە داوای لێکردووم، نەخۆشیم لەحاڵەتێکدا بووم ئەوە قازانجێ بەمن

بگەیەنی. هەڵبەت لەدوای ئەزموونێکی دوورو درێژ، لەدوای چەندین هەڵەو تێکەوتن، وریا بوومەوە. بەڵام درەنگ.!

من درۆم لەگەڵ سروشتی خۆمدا نەکردووە، دووفاق نەبووم، قسەی دڵ وزمانم یەکێک بوون. نووسینو شیعرو ئاکارم یەکێک بوون، بەڵام کەسانی تر هەبوون ئەدیبو نووسەرو شاعیرو هونەرمەندیش بوون، چ لەشاخ و چ لەشار و تائێستا لەبەرئەوەی خۆیان بچووکن لەبەردەمی ئەو بەرپرسانەدا بچووکتر ئەبنەوە. ڕۆژێ لەڕۆژان ڕووبەڕوو یان بەنووسین ڕەخنەیەکیان نەبووە، یەخەیان نەگرتوون، بێدەنگبوونو بەڵام لەولاترەوە هەڵوێستیان پێفرۆشتونەتەوە.

بەر لەشەهید بوون،
وتی: " لێرە نامێنمەوە!.."

لەسەرەتای مانگی دوانزەی (١٩٨٤)دا هەموو گفتوگۆو دانوسانێ، لەنێوان (ی. ن. ک) و حکومەتدا گەیشتە بنبەست .

قسەم لەگەڵ نەسرین کردوو پێموت: (نامەوێ بەردەستی بەعس بکەوم و ئەبێ بڕۆم!). چاکیش ئەمزانی هەموو دەردەسەرییەکە هەر بۆ ئەو ئەمێنێتەوە.

بەڕاستی ژنی ئێمەو مانان نەک هەر خێریان لەئێمە نەدیوە، بەڵکو ببووینە مایەی ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەریش بۆ ئەوان، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، هەر ئێمەیان ویستووەو بێزرە نەبوون و ڕیخۆڵە بەکێش بردوویانەتە سەرو پەیامی ئێمەیان بەهی خۆیان زانیوە. ئەمە دووەمجاربوو نەسرین و منداڵەکان بەجێبهێڵم و ڕووبکەمە شاخ و بەچارەنووسی نادیاریان ببەخشم .

تائەوکاتەیش هەر لەبەڕێوەبەرێتی بیری ئیرتوازی سلێمانی فەرمانبەر بووم، کاک هوشیاری غەنی شاڵی-ش هەر لەوێ ئەندازیاری جیۆلۆجی بوو. جگە لەوەی خۆی لەبنەماڵەیەکی ڕەسەنو ناسراوی شاری سلێمانی بوو، لەهەمانکاتدا خۆیشی کورد پەروەرو دۆستی نزیکی شۆڕشی نوێو موقاوەمەت بوو. هێشتا شەڕ دەستی پێنەکردبۆوە، بەڵام لەئان و ساتا بوو، ڕێگەکان نەبەسترابوون. لەگەڵ کاک هوشیاردا ڕێککەوتینو لەناوەڕاستی هەمان مانگدا، بەئۆتۆمبیلەکەی خۆی بەرەو ناوچەی مەرگە ڕۆیشتین .

ئەوەی لەگەڵ خۆم هێنابووم، هەندێ جلوبەرگی پێویست و دیوانە چاپکراوەکانو ڕەشنووسی هەندێ شیعری تازەبوون و لەجانتایەکی بچووکدا جێمکردبوونەوە. ڕاستەوخۆ چووین بۆ ئاوەژێ، بۆ ماڵی کاک "نەوشیروان مستەفا".

هەر ئەو ڕۆژە کاک هوشیار گەڕایەوەو منیش لەماڵ و بارەگاکەی کاک نەوشیروان مامەوە. ژوورێکی خۆم هەبوو، بۆ خواردنیش پێشمەرگەکان ڕۆژانە چییانبکردایە پێکەوە ئەمانخوارد. لەئاوەژێ سەردانی ئەو دۆست و ناسیاوانەیشم ئەکرد کە لەوێ ئەژیان. کاک "جەمال حەکیم و کاکە حەمەی فەرەج و کاک عەبدولڕەحیم"ی بەرپرسی کەرتی عەسکەری ئەو ناوچەیە، چەند جارێک لە ماڵ و بارەگای خۆیاندا میوانداریان کردم.

هەمووی چەند ڕۆژێ بوو لەوێ بووم، لەسلێمانییەوە هاوڕێ نزیکەکانم گەیشتنە لام و پێیانوتم: (لەلایەن پۆلیس و ئاسایشەوە سۆراخ نەکراوم و هیچت لەسەر نییەو ئیتر بۆ ناگەڕێیتەوە). بەڵام من پێموتن: (بڕیارێکەو داومەو تازە ناگەڕێمەوە!).

شەوی سەری ساڵی تازەی (١٩٨٥) لەگەڵ کاک نەوشیروان-دا پێکەوە دانیشتین، هەموو چاوەڕوانی ئەوەبوون، کەی بتەقێتەوە، لەمانگی یەکی (١٩٨٥)دا لەناوچەی گەرمێن، داوێکیان بۆ (پ. م)ی قارەمان مامەڕیشە نایەوەو نامەردانە شەهیدیان کرد!

تائەوکاتەیش من هەر لە ماڵی کاک نەوشیروان بووم. ئەو شیعرەی کە بۆ مامەڕیشەیشم نووسی هەر لەماڵی ئەواندا نووسیم. ماڵ و بارەگای مام جەلال و هەروەها کاک عومەر عەبدوڵڵا (مولازم عومەر)ی هاوڕێ و دۆستی نزیکم لەسێروان بوون. سێروانیش لە(ئاوەژێ)وە زۆر نزیک بوو، بۆیە بڕیارمدا تاجێوڕێی تەواوو کاری خۆم نەبێ، بچمە لای ئەو.

ئەوەی نزیکی کاک عومەریش بێ پەکی ناکەوێ! بەتایبەتی بۆمنی دەستوپێ سپی، هەر لای (پ. م)ەکانی ئەو باشتر بوو. ئەوکاتە "دلارام" خانی دایکی "بەیار" مابوو، ئەویش خزم و بۆ منیش خوشکێکی دڵسۆزبوو. لەدەستەکەی تەنیشت ماڵی خۆیەوە لەناو بارەگای مەکتەبی عەسکەریدا، ژوورێکی لاکێشەی درێژکۆلەیان بۆ تەرخانکردم. ڕاخەرو کەلوپەلی پێویستی تێدابوو. ئیتر لەو ژوورەدا جێگیربووم. بەهۆی کاک عومەرەوە لەماوەیەکی کەمدا زۆربەی هەرە

زۆری فەرماندەکان و (پ. م)و کادیرە سیاسییەکانم ناسی، خەڵکەکەو بەتایبەتی (پ.م)ەکان زۆریان پێخۆشبوو کە من بەئێجگاری هاتوومەتە دەرەوەو نارۆمەوە.

هەر لەسێروان و لەبەشی سەرەوەی ئەوبەری شارێکەوە، بارەگاو ماڵی مام جەلال-ی لێبوو. خانوویەکی ئاسایی بوو، پێموایە هەر لە سێروانیش بوو، "د. خەسرەو خاڵ"م بینییەوە. هەڵبەت پێشتر لەسلێمانی یەکترمان ئەناسی. بەڵام تێکەڵ و نزیکی یەک نەبووین. پێموایە ئەو و کاک "عومەر فەتاح"یش زۆر نەبوو هاتبوونە شاخ. کاک "دلێری سەید مەجید"ی هاوڕێشم هەر لەو ناوەبوو. کاک (کاوە)ی برایشی لە "پ.م"ەکانی کاک عومەر بوو، لەزۆر کاروباریشدا رۆژانە یارمەتیئەدام.

"مولازم عومەر"م لە دەمێکەوە ئەناسی، واتە لەکۆتایی شەستەکانەوە. یەکەمجار لەگەراجەکەی کاکە "مەحمودی حاجی" مامی ناسیم. پێموایە ئەو کاتە لەکۆلێجی عەسکەری ئەیخوێند. لەشۆڕشی ئەیلولیشداو لەساڵی (١٩٧٤) یشدا یەکترمان بینییەوە، بەڵام ئیتر لەساڵی (١٩٨٤)ەوە بوو بە یەکێک لەهاوڕێ هەرە نزیکەکانم و تانووسینی ئەم دێڕانەیش ئەو خۆشەویستی و پەیوەندییە بەردەوامەو لەیەکتر دانەبڕاوین. کاک عومەر لەناو (پ.م)و خەڵکدا بەگشتی خۆشەویستە، دەست و دڵی جوانە، بەهەموو کەسێکەوەیە، مامە خەمەیەکە بۆخۆی. هەر ئەوەندەی ناسیت و ناسیتی، ئیتر ئەبێتە دۆستی گیانی بەگیانی. ئەوەی گوێ نەداتە پارەوپوول و ماڵی دنیا، ئەوە. بچیتە قوتبی ژوورو یان خواروو ئەتدۆزێتەوەو بەسەرت ئەکاتەوە، ئەو دڵسۆزییو تاقەتەی بەوەوەیە بۆ تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی، لەخۆشیو ناخۆشیدا بێ نموونەیە. من ئاگام لێبووە کەسیی وای بەسەرکردۆتەوەو یارمەتیداوە کە ئەو کەسە خۆی چاوەڕوان نەبووە جارێکیتر ئەو بیری بکەوێتەوە. جگە لەوەی هەر لەتەمەنی لاوییەوە چۆتە ناو شۆڕشی ئەیلولەوە. هەر لەدوای هەرەس و دەستپێکی دروستبوونەوەی موقاوەمەتەوە، لەسەرەتای سەرەتاوە یەکێک بووە لە(پ. م)ەکانی چیای قەندیل و شۆڕشی نوێ.

چەند مانگێ لەسێروان مامەوە. لەوماوەیەدا چەند جارێ مام جەلال-م بینی، من خۆم وامپێباشبوو، لە فرسەتێکدا بەرەو خوار بڕۆم و ئیتر لەڕاگەیاندندا کاربکەم و هەروەها برایانی نووسەرانی کوردستانیش ببینم، بۆ ئەوەی بزانم چۆنییەتی ئیشکردنم لەگەڵ ئەوانیشدا چۆن ئەبێ. مام جەلال-یش ئەم ڕایەی منی پەسەند

کرد، وەک لەبیرمبێ هەر یەک دوو مانگێکمان خۆشبوو، ئیتر کەوتینە بەر پەلارماری تۆپ و تەیارەی دوژمن.

لەمانگی چواری هەمان ساڵدا "عەبدولخالق مەعروف"ی هاوڕێم و هاوڕێی هەمووان، لەشاری هەولێر تیرۆرکرا. شەهید عەبدولخالق وابەتەمابوو بێتە دەرەوە. من دواجار کە ئەوم لەهەولێر بینی، وەختێ پێموت (بەنیازم بڕۆم). ئەویش وتی (منیش دێم بەڵام هەندێ کار هەیە ئەبێ یەکلاییان بکەمەوە، ئەوسا ئەگەمەڵتان. بەڵام دڵنیابە لێرە نامێنمەوە!) .

هەر لە ژوورەکەی "سێروان"دا، شیعری "کەڵ"م بۆ شەهید عەبدولخالق نووسییو هەر لەوێش چلەمان بۆ گرت. لەڕۆژی چلەکەدا لەخوارەوە، لەنزمیدا مەنەصەیەکیان هێنا، (پ.م)ەکانی کاک عومەر خەریکی چاککردنی شوێنەکەی بوون، وایشیان ڕێکخستبوو (پ.م)و خەڵکەکە لەبەرزاییەکەی بەرامبەر دانیشن .

کاک "بەهادین"ی قسەخۆش و قۆشمە، خەریکی چاککردنی شوێنی مەنەصەکەبوو. بەڵام جێگەکە زۆر لێژبوو. هەرچەند تەماشام ئەکرد خوارەو ئەموت ڕاستیکەنەوە، بەڵام بێسوود بوو، تالەدواییدا بەهادین وتی (ئێ کاک شێرکۆ قەیچێکە تۆیش باجارێک لەسەر شان خوار ڕاوەستیو شیعرەکانت بخوێنیتەوە).

هەموو ڕۆژێ چەند جارێک، دوو دوو، سێ سێ فڕۆکە ئەهاتە سەرمان و بۆردومانی ئەکردین. هەرچەندە چەند کونە تەیارەیەکیش دروستکرابوون، بەڵام کەسمان دڵنیانەبووین لەخۆڕاگری ئەو کونە تەیارانە. لەبەرئەوە لەبەیانی زووەوە دوور ئەکەوتینەوەو ئەچووینە چیاکانی پشتی سێروانەوەو پارووە نانیشمان لەگەڵ خۆماندا ئەبرد. یان کتێب بۆ خوێندنەوە .

لەو ڕۆژانەدا بەزۆری لەگەڵ کاک "سەید مەجید"ی پێشمەرگەی دێرین و هاوڕێ (جەبار)دا پێکەوە ئەبووین. چەند جارێکیش کاک دلێری سەید مەجید-یشمان لەگەڵدا بوو. فڕۆکە هەموو ئەو ناوچانەی دائەبێژاو ڕۆژێکیشیان بارەگاو ماڵەکەی مام جەلال-یش بەرکەوت. زیانی گیانی نەبوو، بەڵام پارچەی گەورە گەورەی بۆمباکان دابووی لەژوورەکان و من خۆم بەچاوی خۆم ئەو پارچەیەم بینی کەڕێک دابووی لەجێگە نوستنەکەی مام جەلال .

لەو ڕۆژگارانەدا کاک "ئازاد هەورامی" لە (کانی توو) بوو، خۆیی و (پ. م)ەکانی چەند جارێک داوایان لێکردبووم کەبچم بۆلایان و شەوێک لەلایان بمێنمەوەو کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەیشیان بۆ بگرم .

کانی توو؛ لەهاوینە هەوارە هەرە خۆشەکانی ئەو مەڵبەندەیە، میوەهات و کانی و ئاوێکی زۆری لێیە، ڕۆژێکیان لەگەڵ یەکدوو (پ. م)ی کاک عومەردا، چووین بۆ کانی توو، پێشتر کاک ئازادم بینیبوو، بەڵام ئەمە یەکەمجاربوو والەنزیکەوە بیبینم. گەنجێکی باریکەلەی باڵا مام ناوەندی، قژ ڕەش بوو. ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین. زۆری پێخۆشبوو منی بینی. نزیکەی سی چل (پ. م) لەوێ ئەژیان. کەپرێکی گەورەیان دروستکردبوو. شوێنەکەیان تابڵێی دڵگیربوو. دوو شەوێ لەوێ مامەوە. لەو ماوەکورتەدا کاک ئازادم ناسیی. عاشقی شیعرەکانی مەحمود دەرویش بوو، بەشێکی زۆری لەبەرکردبوو. جگەلەوەش خۆی گیتارژەن بوو، گیتارەکەی بەپشت سەری خۆیەوە هەڵواسیبوو .

کاک ئازاد؛ ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕش بوو، بەڵام سیاسییەکی وشک و برنگ نەبوو. ئەو زیاتر حەزی بەوە ئەکرد لەگەڵ ئێمەوماناندا هەرباسی ئەدەب و هونەر بکات. هەموو جارێ ئەیوت (باواز لەباسکردنی سیاسەت بهێنین و ئەم وەختەی خۆمان بدەین بەشیعرو موزیکو گۆرانیی!) .

یەکەم شەویان، کۆڕی شیعرەکەم بۆ بەستن، دووسێ (پ. م)یان تێدا بوو، لەدواییدا کەوتنە پرسیاری سیاسیی، بەتایبەتی دەربارەی تێزەکانی مارکسیزم و خەتی چینی و لەم بابەتە، پێشئەوەی من قسە بکەم کاک ئازاد پێیوتن (ئەم پرسیارانە چییە؟! ئەم پیاوە شاعیرەو هاتووە بۆلامان. ئەم چ پەیوەندییەکی بەخەتی چینی و ئەو تێزانەوە هەیە. ئەگەر پرسیارتان دەربارەی شیعرو هونەر هەیە بیکەن، بەڵام پرسیارەکانی ترتان هەڵگرن بۆ کۆڕە سیاسییەکان!).

هەر لەسێروان و لەو ڕۆژانەدا بوو کاک عومەر ئەو ڕاپۆرتە سەیرو سەمەرەیەی شەهید "دلشاد مەریوانی" نیشاندام کە لەلاپەڕەکانی پێشووتردا ئاماژەم پێدابوو. لەو چەند مانگەی سێرواندا چوار پێنج شیعری تازەم نووسی، پەیوەندی هاوڕێیەتی‌و دۆستایەتیم لەگەڵ دەیان (پ. م)ی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا بەست‌و دروستکرد. ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش بۆردوومان و تۆپبارانی ناوچەکە چڕتر ئەبۆوە، نازانم لەو ڕۆژانەدا بوو یان دواتر کە کاکە "حەمەی فەرەج" بەرکەوتوو قاچێکی لەدەستدا .

بەهارێکی درەنگ بڕیاردرا کە ئیتر مام جەلال و ئەندامانی سەرکردایەتی ناوچەکە چۆڵبکەن .

شەوێک بەرلەوەی بەرەو دۆڵی جافەتی بڕۆین، کاک "مەلا بەختیار"م لەماڵی کاک عومەر بینی، پێموایە بەر لەوکاتە جارێکی تر کاک مەلا بەختیارم لەپشتی مالوومە، لای حزبی کۆمۆنیست- کۆمەڵە بینیبوو، لاوێکی زیت و وریاو چالاک بوو. لەو ڕۆژگارانەدا، بۆ ئەوەی لەپشتی سیروانەوە بڕۆیت و ڕووبکەیتە ناوچەی دۆڵی جافەتی، ئەبوو ماوەیەکی باش بەپێ بڕۆی، تادواتر ئەکەویتە سەر ڕاستە ڕێیەکو ئینجا لەوێوە سواری ماشێن بیت .

وەختێ کەوتینەڕێ، پەنجا شەست (پ. م)ێ ئەبوون. لەبیرمە مام جەلال و کاک بەختیارو من پێکەوە ئەڕۆیشتین، لەڕێگە مام جەلال بەکاک بەختیاری وت:

(ئەوەی خۆیت بۆ کاک شێرکۆ گێڕاوەتەوە؟!)، وتی (نەوەڵلا). ئیتر ئەم حیکایەتەی بۆ گێڕامەوە.

)لەوەختی وتووێژی "ی. ن. ک" و حکومەتدا لەسلێمانی یەکێک بەناوی "ڕەشەی حەمە سەلە" ئەگیرێ و ئەبرێ بۆ ئاسایشی سلێمانی، هەر لەوکاتەدا (پ. م)ێکی مەلا بەختیار-یش گیراوەو بەڕێکەوت هەردووکیان لەژوورێکدا پێکەوەن. لەوەختی لێکۆڵینەوەدا وەک ڕەشە خۆی بۆ "پ. م"ەکەی مەلا بەختیاری گێڕاوەتەوە، کە ئەمان تۆڕێکی ڕێکخستنەکانی پارتی بوون و بۆ ئەنجامدانی چەند کارێک هاتوونەتە سلێمانی، یەکێک لەو کارانە تیرۆرکردنی من بووە! بەپێی ئەم گێڕانەوەیە ڕەشە لەئاسایشی سلێمانی و لەوەختی لێکۆڵینەوەدا دان بەمەدا ئەنێ) .

دواتر (پ. م)ەکەی مەلا بەختیار بەرئەبێ و ئەم مەسەلەیە بۆ ئەو ئەگێڕێتەوە. دواتر من لای خۆمەوە بەزمانێکی ئەدەبی و نەرم نامەیەکم بۆ سەرکردایەتی پارتی نووسیی و وێنەشم لێدابوو، بەمامۆستا "هەژار موکریانی شاعیر و کاک فەتاح ئاغاو کاک فەلەکەدین کاکەیی" دیارە نامەکەیان پێگەیشتبوو، بەڵام نەلەپارتی و نە لەهیچکام لەو کەسانەوە وەڵامم پێنەگەیشتەوە !.

بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە گرێیەک بوو لەدڵما! تاکۆتایی (٢٠٠٤)، وەختێ "کاک مەسعود"م لەسەری ڕەش بینی و بەر لەوەی هاوڕێکانم بێن، خۆی مەبەستی بوو بەتەنیا بمبینێ، پێیوتم (لەکاتی خۆیدا قسەیەکی وا کرابوو. حەز ئەکەم دڵنیات بکەم. ئەو مەسەلەیە ئەسڵ و ئەساسی نییە. یەکەم لەبەرئەوەی تۆ ئەگەر خۆیشت نەبی، کوڕی فایەق بێکەسی، دووەمیش ئێمە چۆن لەگەڵ تۆدا کاری وائەکەین، بەڵکو ئێمە لەسەرمانە تۆ بپارێزین، بۆیە حەز ئەکەم لەمبارەیەوە هیچ شتێ لەدڵتا نەمێنێ).

دوایئەوەی بەرەو خواربووینەوە. لەگەڵ "پ. م"ێکدا ئێسترێکمان بەکرێ گرت‌و ڕوومانکردە بەرگەڵوو. بەشی سەرەوەی ئەم دەربەندە سەرگەڵووەو شاخی دابانە. لەزاری بەرگەڵوودا، لەسەروو ڕووبارەکەوە بەوبەرەوە، لەپانتاییەکی بەردەمی شاخەکەدا بارەگاو خانووەکانی ستافی ڕادیۆی لێبوو. بیرمە هەر لەبەردەمی ژوورەکەی کاک "هەڤاڵ کوێستانی"دا، ئێسترەکەم ڕاگرت‌و دابەزیم. گوت ببووم، لەو ئاستەدا چەند کەسێکم بینی بەخێرهاتنیان کردم، بەڵام تائەوساتە هیچیانم نەئەناسی .

چوومە ژوورەکەی کاک هەڤاڵ و لای ئەو بووم بەمیوان. کاک هەڤاڵ خۆی خەڵکی دەوری چوارقورنەو ڕانیەیە، من لەوەوبەر ناویم بیستبوو، بەڵام لەنزیکەوە نەمئەناسی. کوڕێکی سپیکەلەی چاوشینی مووزەرد، ئەو کاتە لەڕادیۆ کاریئەکرد. هەواڵەکانی پێئەگەیشت و دایئەڕشتەوەو لەهەمانکاتیشدا ڕۆژە ناڕۆژێ ئەگەر "کاک ئەرسەلان" خۆی وتاری سەرەکی ڕادیۆی نەنووسیبایە، هەڤاڵ ئەینووسی. جگەلەوە ناوبەناو شیعریشی ئەنووسی. لەچەند ساڵ لەوەو بەرەوە ئەندامی کۆمەڵە بوو، هەروەها ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردستان بوو، هەندێ شیعریشی هەبوو. ئەوکاتە هێشتا ژنی نەگواستبۆوە. گەنجێکی هێمن و کەمدوو بوو. ئیتر ژوورەکەی ئەوبوو بەژووری هەردووکمان. لەبەری ئەوبەریشەوە ژوورەکانی تیپی مۆسیقای شەهید کارزان بوو .

کاک ئەرسەلان؛ بەرپرسی ستافی ڕادیۆ بوو. لەوەو بەر ناسیاویمان نەبوو، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم. ئەو وەختە "بەخشان" خانیشی لەگەڵدا بوو، ماڵەکەیان لەهەمانشوێندا بوو. سێ ئەندازیاری ڕادیۆیش لەوکاتەدا لەوێ کاریان ئەکرد، "کاک ڕەنج و کاک پشتیوان و کاک ڕێبوار".

کاک ڕێبوار "ئاشتی" خانی ژنیشی لەگەڵدا بوو. هەر لەوێ لەگەڵ "کاک یوسف زۆزانی"شدا یەکترمان ناسیی. کاک یوسف؛ خەڵکی ڕۆژئاوای کوردستان و ناوچەی سەرکانی بوو. کوڕێکی قسەخۆش و خوێندەواربوو، بۆ هەر ڕووداوێکیش چیرۆکێکی تەنزئامێزی پێبوو. بۆ بەشی عەرەبی ڕادیۆکەو هەروەها بۆ "الشرارة"یش ئەینووسی. لەگەڵ هەمووواندا ڕێکبوو. دواتر بوو بەهاوڕێیەکی نزیکم. هەر لەوێش لەنزیکەوە "حاکم فەرهاد و کاک فەرهاد سەنگاوی"م ناسی. حاکم فەرهاد؛ کوڕی گەورەی شەهید "مەلا ڕەسووڵ"ە، لەزووشەوە وەک خێزان یەکترمان ئەناسی. چونکە لەدراوسێکانی گەڕەکی ئیسکان بوون. شیعری "باوکی شەهید" کە "ڕەفیق چالاک" ئاوازی بۆدانا، ئەو "باوک"ە مەبەست لەشەهید مەلا ڕەسووڵی باوکی حاکم فەرهادە. حاکم فەرهاد؛ بەردەوام نوکتەی تازەی پێبوو، یەکێک بوو لەو کەسانەی لەو شاخ و داخەدا بەقسەی خۆش ڕۆژگاری ئەبردە سەر، لە بێژەرە چاکەکانیش بوو.

کاک فەرهاد سەنگاوی گەنجێکی پڕ لەحەماسەت و لەبێژەرە دەنگ زوڵاڵەکان بوو، لەخوێندنەوەی هەواڵەکاندا، گوێگری ئەهەژاندو ورەی (پ. م)ەکانی بەرزتر ئەکردەوە، بەزمانێکی کوردی پاک و پوخت ئەینووسی. هێشتا ژنی نەهێنابوو. بەڵام عاشقێکی شەیدا بوو. دەردە دڵی خۆی لای من هەڵئەڕشت. باشبوو خۆش

بەختانە بەئاواتی خۆی گەیشت و "کەژاڵ" خان بوو بەهاوسەری. لەمنەوە نزیکبوو .

"کاک زێرەڤان و کاک سەربەست"یشم هەر لەوێ ناسی. کاک زێرەڤان لەبەشی کرمانجی ژوورودا ئەینووسی و بێژەریش بوو. لەو ساڵانەی دواییدا کاک زێرەڤان-م لەسلێمانی و کاکَ "سەربەست"یشم لە لەندەن بینییەوە، هەر لەوێ کاک "فەرید ئەسەسەرد"و کاک "ئازاد چالاک"م بینی.

کاک فەرید؛ خەڵکی هەولێر بوو، گەنجێکی ڕووناکبیرو لەقەڵەمە چالاکەکانیش بوو. لەگەڵ کاک ئازاد-دا، لە ژوورێکدا پێکەوە بوون، قۆشمە بوو، نەتئەتوانی قسەی جیدی و گاڵتەی لەیەکتر جیابکەیتەوە. بەردەوامیش لەسەر مێزە بچووکە نزمەکەی بەردەمی، بەدانیشتنەوە خەریکی نووسین بوو. چەند جارێکیش لێمپرسی "ئەسەسەرد" چییە؟! ئێستاو ئەوسایش وەڵامێکی تەواوی نەدامەوە، ئیتر لەدوای بەهاریشەوە جانتایەکی بچووکی هەڵئەگرتو عەینەکەکەی ئەکردە چاوی و خواحافیزی ئەکردو ئەڕۆیشتو ئیتر نەمان ئەبینییەوە تاپایزێکی درەنگ. وەکو بۆمنیان گێڕایەوە ئەچۆوە بۆ ناو هەولێرو ئەگەیشتە بەغدا !

چەند پێناسەیەکی جۆربەجۆری لەباخەڵدا بوو، خەڵک نەیئەناسی. کاک "قوباد"ی برای حاکم فەرهادیش هەر لەوێ بوو. پێموایە ئەوکاتە لەسەر بێسیمەکەی ڕادیۆ بوو. ئەگەر هەواڵێکی گرنگ و سەرکەوتنی گەورە ببوایە، یەکەمجار لەدەمی ئەوەوە بڵاوئەبۆوە. هەمیشە سەریشی پاکپاک ئەتاشی. کاک ئازاد چالاک پێموایە دووەم کوڕی هونەرمەندی ناسراو ڕەفیق چالاکە. لەبەری قەرەداخ شەهید بوو. کاک ئازاد لەبەشی عەرەبی ڕادیۆ وەک نووسەرو بێژەریش کاری ئەکرد. گەنجێکی ورياو بێدەنگ و کارامەبوو. من ئازادم بەمنداڵی دیبوو، کە بینیمەوە زۆرم پێخۆشبوو ئەو کوڕەی لێدەرچووە .

کاک "موراد"یش لەوێ بوو، خەڵکی کەرکوک بوو، بەڵام من ئەوەندە تێکەڵ نەبووم لەگەڵی .

ئێوارەیەک چووم بۆ میوانخانەکە، هیچی وامان نەبوو. ئەم هات و حاکم فەرهادو ئازادو فەرهادی بانگکرد وتی (بەیارمەتی خۆتان ئیشێکم هەیە). جارێکی تر هاتەوە برادەرێکی تری بانگکرد، بەکورتی خۆم و یەکێکی تر ماینەوە! تومەز خواردنێکی باشی هەبووەو هەرئەوانەیشی بانگ ئەکرد کەزیاتر

تێکەڵیان بوو. دوایی کە زانیم مەسەلە چییە؟، بۆسبەی ئێوارە لەبەرچاوی هەموویان پێموت و ئیتر دەنگی نەکرد .

"کاک حەمەی چێشتکەر" وابزانم خەڵکی سەرگەڵوو بوو، ئەو لەدوو مەنجەڵی گەورەدا خواردنی نیوەڕوانی بۆ دروست ئەکردین، ئیتر هەر ئەو ژەمەبوو، ئەگەر لەخواردنی نیوەڕۆ بمایەتەوە بۆ ئێوارەیش دائەنرایەوە!. بەیانیانیش هەر کەسەو بۆ خۆی بەرچایی خۆی ئەکرد. هەفتەیەک یان دەڕۆژ جارێکیش گۆشتێکی تێئەکەوت. میوانخانەکە ژوورێکی گەورەبوو، تەلەفزیۆنەکەیش هەر لەوێ دانرابوو. هەموو ڕۆژێکیش خەفەرێ بۆ سەرپەرشتی کارەکان دانرابوو، کە نیوەڕوان وەختی نانخواردن ئەهات. ئیتر بانگ ئەکرا "وەرن بۆ نان، وەرن بۆ نان" دوو دەوری و کەوچکەکەت هەڵئەگرت و کاکە حەمە بۆی تێئەکردین، جا یان ئەچوویتە میوانخانە یان ژوورەکەی خۆت، یان ئەگەر دنیا خۆشبوایە ئەچوویتە پەنایەکەوەو نانی خۆتت ئەخوارد .

بەڵام هەمیشە کۆڕی ئێواران گەرم بوو، خەفەر سفرەکەی ڕائەخست و بەڕێز لەئەمبەرو ئەوبەر دائەنیشتین، ئەگەر جێگە تەنگبوایە. ئیتر ئەوترا "وەک مزەلی دانیشن"! واتە ئەژنۆیەکت هەڵئەبڕی و خۆت بچووک ئەکردەوەو نانەکەت ئەخوارد. ئەمانە هەموو لەگەڵ نوکتەو قسەی خۆشی فەرید ئەسەسەردو حاکم دا .

یەکەم زستان کە ڕاخەرەکەیان ڕاخست، نیشانەی سەری عەلادینێکی پێوەبوو، سوتابوو!. وتیان ئەمە فولکەی "مارف عومەر گوڵە"!. وتم یەعنی چی؟! وتیان (پێشتر ئەویش لێرەبوو، سەری عەلادینەکەی لابردووەو خستویتییە سەر کومبارەکەو سوتاندویتی، لەبەر ئەوە ناونراوە فولکەی مارف عومەر گوڵ!) .

نانەواخانەیەکیشمان هەبوو ئەو کاتە "هونەر"ی نانەوا ئەیبرد بەڕێوەو یەکدوو کەسی دیکە یارمەتیان ئەدا. بەیانیان زوو دەنگی پریمزەکەی ئەو ناوەی بێدار ئەکردەوە !

ستودیۆی ڕادیۆ کەوتبووە بەشی سەرەوەی خانوەکان بەدەستەڕاستدا. ژوورێکی ئاسایی و دیوارەکانی بە بەتانی داپۆشرابوو. ئەگەر شیعرێکم هەبوایە ئەچووم بۆ ئەوێ و تۆماریان ئەکردو دواتر بلاوئەبۆوە .

دوومانگ لەژوورەکەی کاک هەڤاڵ-دا بووم. دواتر کاک عومەر عەبدوڵڵا، کاک "ئەنوەر حەمە ڕەشید"ی ئەندازیاری ڕاسپاردوو بە بەری ئەوبەرەوە ژوورێک و

هەیوانێکی بچووکیان بۆ دروستکردم، ئیتر بووم بەخاوەنی ماڵی خۆم. عەلادین و هەندێ قاپ و قاچاغ و کتریو قورییو تەباخێکی یەکچاوم هەبوو، ژوورەکەم خراپ نەبوو، پەنجەرەو دەرگایشمان بەنایلۆنی ئەستوور کونبڕ کردبوو. لەو ژوورەدا بەشێکی تر لەکەشکۆڵی پێشمەرگەو ئاوێنە بچکۆلەکانم نووسی. بۆ خوێندنەوەیش لەشارەوە کتێبیان بۆ ئەناردم یان لەبرادەرانم وەرئەگرت .

لەخوار ئێمەیشەوە، بینای بەندیخانەی شۆڕش بوو، ئەوەندە نەبوو تەواو کرابوو، کاک فەرهاد بەڕێوەبەری بوو. بەندەکان یان جاش بوون یان عەسکەری گیراو، ناوبەناویش ئەگەر هەتاو بوایە ئەیانبردنە سەربان و بەڕیز دائەنیشتن. من چەند جارێ عەرەبی عەگال بەسەرم لەوێ دیوە، کە هاتوون بۆ بینینی کوڕ یان کەسوکاریان .

یەکەمجار بوو بگەمە بەرگەڵو؛ بەبەری ئەوبەرەوەو بەسەر شاخەکەوە چادرێک هەڵدرابوو، سێ کەس بوون، پرسیم ئەوە چییە؟! وتیان (ئەو سێ کەسە لەحزبێکی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی جیابوونەتەوەو خەریکی خەباتکردنن!). دیمەنەکە زۆر کۆمیدی بوو، سێ کەسو هیچی ترا ئەیانویست کۆماری ئیسلامی ئێران بڕوخێنن!، من هەتا بەرگەڵویشم بەجێهێشت ئەو سێ کەسە هەر بەسەر ئەوشاخەوەبوون!. گەلییەکە دوورودرێژو قایم بوو، چەندین ئەشکەوت و کەوێڵی قوڵی تێدا بوو. هەر بەبەری ئەوبەری چەمەکەوە، خەستەخانەی شۆڕش بوو. خەڵکی گوندەکانیش ڕوویان تێئەکرد. من بەهۆی ئازاری ددانمەوە چەند جارێک سەردانیمکرد، ئەوکاتە دکتۆرێک لەوێ بوو، لەپاشدا چوو بۆ ئێرانو لە تاران جێگیر بوو. لەو ساڵانەی دواییدا لەوێ بینیمەوە، عیادەی تایبەتی خۆی هەبوو، لەماڵی خۆشیان و لەدەریشەوە میوانداری باشیی کردمو زۆر شوێنی ناو تاران و دەرەوەی تارانی گێڕام.

بەرەو ژوورتر، بەو بەری گەلییەکەوە بەشی ڕاگەیاندن و چاپخانەی "ئیبراهیم عەزۆ" بوو. کاک "سەعدون فەیلی" بەرپرسی بوو، هەر لەوێش بۆ یەکەمجار کاک "ئەردەڵان"ی هونەرمەندو وێنەکێش، برای شەهید "د. بەختیار"م ناسی .

د. بەختیار؛ لەسەرەتاو کۆتایی حەفتاکاندا لەسلێمانی هاوڕێمان بوو، چەندینجار پێکەوە دانیشتبووین. ئەوکاتەی نەقلی ڕانیەیش کرا، لەگەڵ بێگەرد-دا چووین بۆ سەردانی و شەوێک لای ماینەوە. لاوێکی خوێن گەرمی ئازابوو، مارکسی و چەپ بوو. ئەو بەیانییەش من لەماڵەوە بووم کە گوێمان لە تەقەیەکی نزیک بوو، هەرکۆلانێ ئەودیو ئێمە لەگەڕەکی ئیسکان، دواتر کە دەرکەوت، د. بەختیار

خۆی چوو بووە سەر سیخوڕێ بۆ ئەوەی بیکوژێ، بەڵام وەک باسیانکرد دەمانچەکەی ئەوەستێ و جووتە ئەکا! ئیتر ئەو جاسووسە دێتە دەست و د. بەختیار شەهید ئەکات و لەوێدا ئەکەوێت .

کاک سەعدون فەیلی-م لەوێ ناسی، خرپلەیەکی زیت و گورج وگۆڵ بوو، زوو زوو سەردانی لای ئێمەی ئەکرد. بەهەمووی چەند جارێک ڕێمکەوتە ڕاگەیاندن و چاپخانەی ئیبراهیم عەزۆ. جگە لە ئەردەڵان، ڕەوەز-یشم هەر لەوێ ناسی، هەروەها کاک بەختیاری تایپیست و زۆری تریش. لەگەرووی دەربەندەکەداو بەو بەرەوەو لەشوێنێکی زۆر قایمدا بارەگاو ماڵی کاک نەوشیروان بوو، لەو سەردەمەدا "دکتۆر فوئاد مەعسووم و د. خدر"ی برایشی هەر لەو شوێنەدا ئەژیان، بۆ یەکەمجاریش هەر لەوێ کاک "حەمە تۆفیق ڕەحیم"ی زاوای کاک نەوشیروانم ناسی. دەرۆژ جارێک سەردانێکی کاک نەوشیروان-م ئەکردو تا ئێوارە لای ئەمامەوە. من دانیشتنم لەگەڵ کاک نەوشیرواندا پێخۆش بوو .

تا ئەمڕۆ بیست و سێ ساڵ زیاترە ئەیناسم و من بەمجۆرە ئەو پیاوە هەڵئەسەنگێنم: ڕووناکبیرەو لەبواری مێژوو نووسین و وتاری سیاسیدا وردو دەستڕەنگینە، شارەزای ئەدەبی کلاسیکی و شیعری کوردییە، عەقڵێکی فراوان و چالاکی پێوەیە، بەکورتی و پوختی مەبەست ئەدا بەدەستەوە. درک بەهەندێ شت ئەکا، دوایی تۆ ئەڵێی ئەی من بۆ درکم پێنەکرد! مەسەلە گرانەکان بەزمانێکی ئاسان ئەنووسێت. وەختێ قسە ئەکات بەتەواوی ئەزانی چی ئەڵێ و بۆچی .

بیری تیژەو شارەزای جوگرافیای کوردستان و گوند بەگوند و شاخ بەشاخ و کانی بەکانی ئەم وڵاتەیە. بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە خۆی پیا ڕۆیشتووە یان دیونی و تیایاندا ژیاوە. ناوی سەدان گوڵ و ڕووەک و درەخت ئەزانێ، زۆر قسە ناکات، قسە لەڕووە .

بەرامبەرەکەی هەر کەسێ بێت ئەگەر هەڵەی کردبێ ئەیخاتە قولی مشتییەوە! هەرگیز بەتەنگ ماڵی دنیاوە نەبووەو خۆپەرست و خۆویست نەبووە، لەشاخیش و لەشاریش هەر سادە ژیاوە. ڕۆژنامەوانە، لەبواری ڕاگەیاندندا یەکێکە لەپسپۆڕەکان. تەنانەت لەدانانی پلانی شەڕی پارتیزانی و عەسکەریدا وردوشارەزایە. لەگەڵ ناخۆشی و ڕۆژگاری سەختدا هەناسە درێژە، عاتیفی و سۆزدار نییە .

ئەگەر یەکێک زۆر تێکەڵاوی نەبێ بەباشی نایناسێ. لەپۆشینی جل و بەرگ و خواردندا ئاسایی و کەمخۆرەو بەهەموو شتێ ڕازییە. مەگەر هەر ئەو بەقەد من جگەرە بکێشێ. چوار پێنج زمان ئەزانێ. لەوەختی سەرهەڵدانەوەی موقاوەمەتدا و بۆ ئەوەی بەزووترین کات بگاتەوە کوردستان، دەستبەرداری نووسینی نامەی دکتۆراکەی بوو! کە پێموایە دووسێ مانگێکی مابوو تەواوی بکات. کۆمەڵێ نووسینی هەبوو لەبارەی ئەدەب و شیعری کوردی و هەڵسەنگاندنەوە ئەگەر لەکاتی خۆیدا بڵاوببکردنایەوە، نرخی مێژوویی و ئەدەبی خۆیان ئەبوو. خەم و مەراق و دەردە دڵی تایبەتی خۆی کەم ئەدرکێنێ و لەناوەوەیدا پەنگ ئەخۆنەوە. ئیتر نازانێ کەی بەربەست ئەشکێنێ و لافاو دروست ئەبێ .!

گاڵتەی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانیدا، ئەگینا وەکی تر، وشک و برنگە.ساڵێک نەتبینێ لێت ناپرسێتەوە! لەتێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتیدا گەرم و گوڕ نییە، مەگەر یەکێک بیجوڵێنێ و پێی بڵێ ئەوە فلان نەخۆشەو بابچین بۆلای، یان ئەوە پرسەی فلانەو بابچین بۆ پرسەکەی یان بابڕۆین بۆ ئەو دەرو دەشتەو پیاسەیەک بکەین. هەندێجاریش لەسەر شتێ کە خۆی بڕوای پێیەتی ئەکەوێ بەقینداو نایەتە خوارێ. ئەگەر یەکێکی خۆشبووێ لەلای خەڵکیتر باسی ئەکات و لەبەردەمی خۆیدا هیچ ناڵێ. دیارە ئەمە خاسیەتێکی جوانە.

دە تەلەفۆنی بۆ بکە، ئەو جارێک تەلەفۆنت بۆ ناکاتەوە. سەد سەردانی بکە، ئەو جارێک سەردانت ناکاتەوە!. کەچی سەیر ئەوەیە تۆ هەر ئەچیتەوە بۆلای، چونکە وەک سەرئەنجام کاک نەوشیروان نابینرێ و ناتوانی دەستبەرداری بیت. لەسەر شیعری تازە زۆرجار لەگەڵ کاک نەوشیروان-دا لێمانبووە بە مشتومڕو هەندێجاریش بەدەمەقاڵێی توند. ئەو تائێستەیش چێژ هەر لەشیعری باوی کوردی وەرئەگرێو نەهاتووە بەملاوە.

ناو بەناو سەزدانی سەرگەڵوم ئەکرد، ماوەیەک کاک "قادری حاجی عەلی" لەوێ بوو، ئەچووم بۆلای. هەروەها "کاک حەمەی موکری و کاک حەمە کەریم عارف"یش لەوێ بوون و هەردووکیان چالاکانە خەریکی کاروباری یەکێتی نووسەرانی کوردستان بوون. لەدواییدا چوونە نزیک یاخسەمەر .

کاک "حەمەی حەمە باقی و نەجیبە" خانی هاوسەریشی لەگوندێکی خوارتر بوون‌و جارێکیش بەمیوانی چووین بۆلایان. جاربەجاریش کاکە حەمە سەردانی بەرگەڵوو سەرگەڵوی ئەکردو یەکترمان ئەبینی .

هەر لەبەرگەڵو؛ گەنجێکی باریکەلەی لێبوو، کە پێیانناساندم وتیان (ئەمە کاک "ئەبو شەهاب"ە)، خۆی عەرەب و خەڵکی موسڵ بوو، بۆ بەشی عەرەبی ڕادیۆی ئەنووسی، بەڵام کوردییەک فێر ببوو کەس نەیئەزانی عەرەبە. پێموابوو لەچەند ساڵ لەوەو بەرەوە هاتبووە ناو شۆڕش و لەناو یەکێتیدا مابۆوە. دوای ئەوەی ئاشنایەتیمان پەیداکرد، هەندێ لەشیعرەکانی دیوانی "کازیوە"ی بۆ عەرەبی وەرگێڕاو جوانیشی ئەکرد. دواتر چووە بارەگای یەکێتی نووسەرانی کوردستان، لای کاک حەمەی موکری و کاک کەریم عارف و لەگەڵ ئەواندا ئەژیا. لەو ساڵانەی دواییدا کە هەواڵم پرسی وتیان ئێستا لە ئەوروپایە. بەڵام ئیتر نەمبینیوەتەوەو نەهاتۆتەوە بۆ کوردستان .

لەبەرگەڵوو تیپی مۆسیقای شەهید کارزان-یش شوێنی خۆیان هەبوو. لەگەڵ کاکە "دلێر ئیبراهیم و ئاراس"ی برایدا بەینمان خۆشبوو، کاک "شوان کابان"یش هەر لەگەڵ ئەواندا بوو. ناوبەناو سەردانم ئەکردن و لەوەختی پرۆڤەی سروودو گۆرانییەکاندا بەدیاریانەوە دائەنیشتم. لەو ڕۆژگارانەدا ئەم تیپە جێدەستی دیاربوو، چەندین گۆرانیَ و سروودی تازەیان هەر لەویَ تۆمارکردو بڵاوبۆوە. دوایئەوەی من چوومە دەرەوە، ئیتر کاک دلێر ئیبراهیم-م نەبینییەوە، تا لەکۆڕێکی شیعر خوێندنەوەدا لەسوید لەشاری یۆتۆبۆری بەیەکتر گەیشتینەوە.

لەشوێنی زستانەداو لەبەرگەڵوو، ئەو کۆمەڵەی لەویَ ئەژیاین، شەوانە سەردانی یەکتریمان ئەکرد، جاری وایش هەبوو هەندیَ لەپێشمەرگەی تیپەکان ئەگەر دۆست و ناسیاویان لای ئێمە هەبوایە ئەهاتن و شەوێک ئەمانەوەو بەسەرهات و شەڕی نەبەردەکانییان ئەگێڕایەوە .

کە شەڕی دابان بوو، من لە بەرگەڵوو بووم و بەشێک لەو هێزانە بەلای ئێمەدا سەرئەکەوتن، دوای سەرکەوتنی "پ. م" لەم نەبەردە گەورەیەدا، شیعرێکم نووسی و پێشکەشی کاک عومەر عەبدوڵلام کردو بەدەنگی خۆم لە ڕادیۆوە خوێندمەوە. پێشمەرگە گەلیَ حەزیان بەو شیعرانە ئەکردو تیایاندا بوو بەشێکی زۆری کەشکۆڵی پێشمەرگەیان لەبەر کردبوو. ئەو شیعرانە گوڕوتینێکی تری ئەدانیَ و هەستیان ئەکرد شاعیرێک هەیە نزیکیانەو بەردەوام لەگەڵیاندایە .

هەر لەبەر ئەوەیش بوو کەم هەگبەو کۆلەپشتی "پ. م" هەبوو کەشکۆڵی تێدانەبیَ. تاکۆتایی ساڵی (١٩٨٦) سیَ بەرگی لێدەرچوو. بیرمە جارێکیان کاک "جەبار فەرمان" لەبەری قەرەداخەوە گەڕایەوەو بینیم، پێیوتم: (دیارییەکی تایبەتیم بۆ هێناوی) وتم: چییە؟! وتی: (یەکدوو کەشکۆڵی پێشمەرگەی بریندار کە لەبۆردوومانی فڕۆکەکاندا لەوبەر پڕیشکیان بەرکەوتووە!). دووردانەی هێنابوو کە ساچمە لێیدابوون، کوناودەری کردبوون! لێموەرگرت و تاماوەیەکیش پاراستمن، بەلام لەدواییدا لێم بزربوون .

من ئەو وەختەی گەیشتمە بەرگەڵوو، پاشماوەیەک بڕیارمدا لەو گوندانەی دەوروبەردا دەستبکەم بەکۆڕگرتن بۆ پ. م و خەڵکی، بەتایبەتی لەدۆڵی جافەتیدا. بەکورتی ئەو شوێنانەی کە ئەمتوانی بیانگەمیَ. خوێندنەوەی شیعر لەکۆڕداو ڕووبەڕووی خەڵکی، کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە. چونکە ڕاستەوخۆو زیندوو ئەتبینن و گوێت لێئەگرن. یەکەمجار لە سەرگەڵووەوە دستمپێکردو لەم دواییەشدا زانیم کە کاک "عەباسی ڤیدیۆ" ئەو کۆڕەی گرتووەو

شریتەکەی پاراستووە. ئیتر دوای ئەو کۆڕە، لەمانگێکدا دووجار ئەچووم بۆ گوندەکانی دۆڵی جافەتی. لەهەندێ گوندیشدا لەناو مزگەوتەکاندا کۆڕەکانم ئەبەست. یەکێک لەو کۆڕە گەورانەی کە لەبیرم ناچێتەوە لەگوندی "کاپیلۆن"بوو .

لەمیوانخانەکەی بەرگەڵووی خۆشمان هەندێجار شیعرم ئەخوێندەوە. چیرۆکە شیعری "داڵ"یشم هەر لەوێ نووسیی و خوێندەوە. ئەم قەسیدەیە باڵا ئاوێنەیەک بوو بۆ ژیانی ئەو مەفرەزانەی کە ئەچوونە سەر شارو شارۆچکەکان، وێنەگرتنی هەموو جووڵەیەکیان بوو، وەک ئەوەی کامێرایەکی سینەماییان لەگەڵدا بێت. لەنامیلکەیەکی بچووکیشدا "ئاوێنە بچکۆلەکان"م هەر لەوێ چاپکرد. ئەم کورتە شیعرانە هەر درێژەدان بوون بەشیعرەکانی دیوانی "کازیوە". شیعری برووسکە، یان شیعری فلاش و پۆستەر. چەند ڕۆژێ بوو ئەم دیوانە دەرچووبوو. چووم بۆ ژوورەکەی کاک ئەسەسەرد و کاک ئازاد .

ئەسەسەرد؛ ڕیشی ئەتاشی، کە منی بینی یەکسەر پەنجەی بۆ ئاوێنەکە ڕاکێشاو وتی (ئەمەیش هەر ئاوێنە بچکۆلەکانە!) .

یەکێتی نووسەرانی کوردستان لەماوەی ئەو دووساڵەدا کە من لەوێ بووم، چەندین دیوانە شیعرو نامیلکەو کۆمەڵە چیرۆکی بەچاپگەیاند، جگە لە گۆڤاری "نووسەری کوردستان" کە لەکاتی خۆیدا دەرئەچوو. بەکورتی بزووتنەوەیەکی تازەی چاپ و بڵاوکردنەوەی لەو شاخ و کێوانەدا دروستکردبوو. ئەرکی زۆری ئەو کار ڕاپەڕاندن و نووسینو سەرپەرشتی کردنانە، بەڕاستی بۆ کاک حەمەی موکری و کاک حەمە کەریم عارف دەگەڕایەوە. تامنیش لەوێ بووم، ژمارەیەکی باشیان لەیادی شەهیدکردنی "سەیدا ساڵح یوسفی"دا دەرکردو منیش لای خۆمەوە بە پەخشانێک بەشداریم کردبوو. ئەمەیش وەفایەکی جوان بوو بۆ پیاوێ کە لە سەردەمێکدا سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی کورد بوو .

ئەبێ لێرەیشدا ئاماژە بەوە بکەم کە نووسەرە جوامێرەکانی شار، هەر لەسەرەتاوە بەشیعر یان وتار یان چیرۆک ڕۆڵی دیارو لەبەرچاویان هەبوو لەنووسینی ئەدەبی موقاوەمەت و بەرگرییدا و ئەمەیش لەو سەردەمە سەختەدا نیشانەی بەشداریکردنی وشە بوو لە شەڕی چارەنووس و ئازادیدا. هەڵبژاردەیەک لەو چیرۆک و شیعرانە، ئەدەبێکی ئاسایی یان هاوار هاوار و دروشم نەبوون، بەڵکو بەمانای وشە ئەدەب و هونەربوون، بەڵام بۆ موقاوەمەتی دژی فاشیزم نوسرابون. دیسانەوە لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی یەکێتی

نووسەرانی کوردستان لە دیسمبەری ساڵی (١٩٨٥)دا کتێبی (ڕووبەڕوو لە سێبەری چیا)دا دەرچوو .

ئەم کتێبە کورتەیەکی ژیانم و دیدارو چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژی لەخۆگرتبوو کە "بێستون" کاک هەڤاڵ کوێستانی ئامادەی کردبوو. ئەوەی ڕاستیبێ، وەختێکیش هاتمە سەر ئەوەی ئەم بیرەوەرییانە بنووسم، گەڕامەوە سەر ئەو بنەمایەی ئەو "کورتەیەم" درێژکردەوە، بەوجۆرەی کەئێستە لەبەر دەستاندایە. بەڵام پێویستە ئامازەیش بەوە بکەم گێڕانەوەی ئەو بیرەوەریانەی ئەوسا، تاساڵی (١٩٨٤) هاتبوون.

کورد؛ لەماڵومەوە دنیا ڕزگار دەکات،
کەچی دەوڵەتی بۆ خۆی ناوێت...

لەساڵی (١٩٨٥-١٩٨٦)دا دۆڵی جافەتی، لەمسەرەوە تا ئەوسەر جمەی ئەهات لە"پ. م"و بارەگاو دەزگا جۆربەجۆرەکانی شۆڕش، هەروەها لەدەیان بارەگای ئۆپۆزسیۆنە ئێرانییەکان، بەکورد و فارس و ئازەرییەوە .

لەپشت مالومە؛ خێوەتگەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران- کۆمەڵەی لێبوون. لەساڵی (١٩٨٤)دا ئەوکاتەی دانوسان لەنێوان ی. ن. ک و میریدا هەبوو، ڕێگەکان والابوون و ئێمەی نووسەران و ئەدیبانی سلەیمانی، چەند جارێک بەتایبەتی سەردانی کۆمەڵەو هەروەها حزبی دیموکراتمان کردبوو لەگەورە دێ .

حزبی کۆمۆنیستی ئێران- کۆمەڵە، زەبت وڕەبت و دیسپلینێکی بەهێزو ڕێکوپێکی هەبوو. هەموو شتێ لەکاری بچووکەوە بۆ گەورە، بەرنامەیان بۆ داڕێژرابوو. هیچ هەڵسوکەوت و جولانەوەیەکی خۆڕایی یان هەرەمەکی بەرچاو نەئەکەوت، ئێمە یەکەمجار کەچووینە لایان هەستمانکرد بەوەی لەناو کۆمەڵێ "پ. م" داین، کە لەوانەی ئێمە ناچن. هەموو شتێ وەکوو سەعاتی قورمیشکراو وابوو! هەر لەڕێکوپێکی خێوەتەکانەوە تا ئەگاتە سەر چۆنییەتی نانخواردن و بەرنامەی کارو چالاکی هونەریی و پەیوەندی ڕۆژانەیان لەگەڵ یەکتردا. ئەوەی جێی سەرنج بوو، بوونی ئەو هەموو کچ و ژنە بوو کە هاتبوونە ناو ڕێکخستنەکانییانەوە. هەموویشیان بەکاری خۆیانەوە سەرقاڵبوون. ئێمە هەر لە

یەکەم سەفەرەوە بەشێک لەڕێبەرەکانی ئەوانمان ناسی، وەکوو "د. جەعفەر شەفیعی و عەبدوللای موهتەدی و ئیبراهیمی عەلیزادە"و هەر لەویش بۆ یەکەمجار چاوم بەچاوی شاعیر "فاتیحی شێخ ولئیسلامی" و "ناصح"ی برای کەوت. هەروەها کاک "ناسری حیسام"یم لەوێ ناسی، ئەمە جگە لەدەیان کادیرو (پ. م)ی تریان.

بەلام ئێمە هەندێکمان، ئەوانمان وەک کۆمەڵێ دەرویش ئەهاتە بەرچاو لەگفتوگۆو دیالۆگیشدا تابلێی وشک و برنگ، داخراوو دۆگمابوون. لە ئایدۆلۆجییەتی مارکسی زیاتر، بەو شێوەیەی ئەوان باسیان ئەکرد، بڕوایان بەهیچ ڕاستیەکی تر نەبوو. ئەوە تەنها حەقیقەت بوو بەلای ئەوانەوەو ئیتر دوایئەوە کۆتایی بەشتەکانی تر ئەهات. ئەوان لەو دۆڵەدا لەوەهمێکدا ئەژیان‌و وایانئەزانی خۆیان قیادەی کرێکاران و پرۆلیتاریای دنیا ئەکەن. لەئاست مەسەلەی نەتەوایەتی کوردو کێشە کوردستانییەکاندا پێوانەیان لەبەرژەوەندی یەک چیندا ئەبینی و لەو ڕوانگەیەوە تەماشای مەسەلەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیان ئەکرد. مانگرتنی کۆمەڵێ کرێکاریان لە کەنەدا بەلاوە گرنگتر بوو وەک لە بۆردومانکردنی گوندێکی کوردستان! کاک "ناصح" وەک شاعیری یەکەمی کۆمەڵە ناسرابوو، لەوەوبەریش هەندێ شیعرێم بینیبوو، لەگەڵ ئێمەیشدا هەندێ لە شیعرەکانی خۆی خوێندەوە. شیعرەکان ڕەق وتەق و ئەترت بەزۆر زمانی کوردیان بەسەردا سەپاندوون. وتە مارکسییەکان ڕیزکرابوون و کرابوون بەجۆرێ لەشیعری گوایە شۆڕشگێڕی! مۆمیای زمان بوون. تەڕاییان تێدا نەبوو، بەر لەوەی ژیان و هەست و نەست بن، برگە برگەی تیۆری ساردوسڕو بێ گیان بوون. یەک وشەی نەبوو بمجوڵێنێ. کاک (فاتیح)ی برای بەرلەوەی ببێ بەکۆمۆنیست یەکێک بوو لەشاعیرە باشەکانی وەک سوارە "سوارەی ئیلخانیزادە". بەلام حزبایەتی بەتەواوی گوشی‌و تلپەی تەڕی شیعری تیا نەهێشت .

لەو سالانەی دواییشدا کە هاتە سوید، پێموایە یەکدوجارێ چاوم پێکەوت و خۆزگەم بەو سای پشتی مالومە خواست. هەر تەواو وەک دەرویشی تەریقەتی قادری و نەقشی بینیمەوە. هەرچی هەستی کوردانە هەبوو تیا نەمابوو! چونکە ئەو گاڵتەی بەهەستی کوردایەتی ئەهات‌و بەپاشماوەی دەرەبەگایەتی و ئیمپریالیزمی لەقەڵەم ئەدا !

دوایئەو هەموو ئەزموون و تەمەنە، ئەگەر دەرسێکی لەهەر عەقڵەو خەساریَ وەربگرتایە، دڵنیام تێئەگەیشت ئەو چەند شیعرە جوانەی جارانی لەم دەروێشیێتییەی بەبەهاترن.

لەیەکێک لەو سەفەرانەدا کە چووین بۆلای کۆمەڵە، سەریشمان لە "شێخ عیزەدین"دا، پیاوێکی لەسەرخۆ و کوردپەروەرو بێ غەل وغەش، لەناو کۆمەلانی خەڵکی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا خۆشەویست و بەڕێز و پایەدار. بەلام بەداخەوە لەدوای هاتنە سەرحوکمی مەلاکان لەئێراندا، لەگەمەی "مەنسوری حیکمەت" و کۆمۆنیستەکان نەگەیشت و ڕیشی خۆیدایە دەست ئەوان. ئەمە لەکاتێکدا بەتەنها شەخسییەتی کۆمەلایەتی و ئایینی و نەتەوەیی شێخ عیزەدین لەو ڕۆژگارانەداو لەناو خەڵکیدا دە بارتەقای کۆمۆنیستەکان بوو. بەلام بەداخەوە نەیزانی چۆنیان بەکاربێنێ و کۆمۆنیستەکانیش هەر بۆ گەمەیەکی سیاسییو حزبی بوو، لەو ڕۆژگارانەدا لەخۆیان نزیک کردبۆوە. ئەو وەختەی لەولاتی سویدیش بووم، چەند جارێک بینیمەوەو جار لەدوای جاریش خۆشەویستتر ئەبوو لەلام.

لەشەوکۆڕێکی گەورەداو هەر لەگۆڕەپانەکەی خێوەتگای کۆمەڵەدا، بەئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە (پ. م)ەکانی خۆیان و خەڵکی دەوروبەر، کە هەموو لەسەر ئەرزەکە بەچوارمشقی دانیشتبوون. بیرمە کاک "عەبدوڵلای موهتەدی" لەنێوان "من و کاک ڕەووف بێگەرد"دا دانیشتبوو. بەڕێوەبەری کۆڕ، یەک لەدوای یەک دروشم و ڕێبازەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی ئەخوێندەوە. تا لەوکاتەدا بوو، ڕوومکردە کاک عەبدوڵلای موهتەدی و پێموت: (باشە کاکە گیان، قەیناکا کۆمۆنیستن، ئەگەر هەر ئەوەیش بێ، باحزبی کۆمۆنیستی کوردستان-تان پێکبهێنایە! ئەم ئێرانە بۆ؟!)، بەلام ئەو زەردەخەنەیەک گرتی و وەلامی پرسیارەکەی نەدامەوە .

کاک عەبدوڵلای موهتەدی؛ لەخێزانێکی نیشتمانپەروەرو ڕووناکبیری کوردستان، چ لەگەڵ خۆی و چ لەگەڵ هەردوو براکەی "کاک سەلاحەدین موهتەدی، کاک محەمەدی موهتەدی"یشدا، دۆستایەتی و خۆشەویستی و پەیوەندیم هەمیشە باشبووەو لەئێستەیشدا زیاترو نێوانمان تەباو پڕ لەڕێزبووە.

هەر لەو سەفەرانەدا، یەکەم بەیانی بوو، لەدەنگی سروودی ئەنتەرناشناڵی ئەوان خەبەرمان بۆوە. ئالایەکی سوور هەڵکراوو بەسەر سەرەوەو هەموویان ڕیز ببوونو بەدەنگی بەرز سروودەکەیان ئەوتەوە. بەبێگەردم وت: (کورد لە مالومەوە دنیا ڕزگار ئەکات و کەچی سەربەخۆیی و دەوڵەتی بۆ خۆی ناوێت!).

ئەوەی ڕاستیبێ ئێمە لەدڵی خۆماندا پێکەنینمان بەو قسانە ئەهات و پێمانوابوو لەوەهمێکی گەورەدا ئەژین و جاربەجاریش لەگەڵیاندا تووشی گفتوگۆی توند ئەبووین! بەڵام ئێمە سیاسیی نەبووین و سەفەرەکانیشمان لەبەر هیچ هۆیەکی سیاسیی نەبوو. حەزمان ئەکرد دۆستمان بێو پەیوەندیمان لەگەڵیاندا باش بێت و کۆڕەکانیشمان زیاتر کۆڕی ئەدەب و شیعرو گۆرانی و مۆسیقابێت .

لەدوای شەوی یەکەم. بێگەرد وتی (خۆ ئەمانە کۆمۆنیستن، ئەبێ چەم کردن بەلایانەوە ئاسایی بێ و هیچ نەبێ لەبەرئێمە ئەم ڕۆژووە کۆمۆنیستییەی خۆیان بشکێنن)، کنەمان تێداکردوو، ئیتر بۆ شەوێ قاسملو ئەستێرەی دانیشتنەکە و خواردنەوە و گفتوگۆکەمان بوو. هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسییەکەیان لەوێ بوون و کێبڕکێیەکی خواردنەوەی سلێمانی و سنەمان کرد و ئەو دیوارەمان نەهێشت و بوو بەمەجلیسی یاران و شەوی عاشقان و بادەو گۆرانی، کەتادرەنگانی خایاند.

دیارە هەر لەوگەشتانەداو بەکۆمەڵ، حزبی دیموکراتیشمان لەگەورەدێ بەسەرکردەوە، لەوێش کۆڕی شیعر خوێندنەوەمان گرت، لەنزیکەوە بەشی زۆری ئەندامانی دەفتەری سیاسیی ئەوانیشمان ناسی. بۆلای هەرکام لەدیموکرات، کۆمەڵە بچوینایە، سەرەتای هەموو قسەکانمان داخوازی ئاشتبوونەوەو تەبایی بوو لەگەڵ یەکترداو کۆتایی هێنان بوو بەشەڕی ناوخۆیان .

ئەوکاتەی تەرمی تۆفیق وەهبی گەڕایەوە،
مام جەلال چی وت؟

سالی (١٩٨٤) بەهۆی ئەوەوە، کە بارودۆخە سیاسییەکە لەئەنجامی دانووسانەوە لەگەڵ حکومەتدا تاڕادەیەک ئاسایی ببۆوە، شەڕی جەبهەکان ڕاگیرابوون. ئەگەرچی لێرەو لەوێ بەیەکدادان و شەڕی بچووک هەر هەڵئەگیرسا، بەتایبەتی لەگەڵ جاشەکاندا، بۆسە نانەوەو کەمینی سەر ڕێگاکان جێی مەترسی بوون، بەڵام دەرفەتی باشی تیا ڕەخسا بۆ ئەوەی ئێمە ئەو گەشتانە بکەین و چالاکی ئەدەبیشی تێدا بنوێنین.

سەرکردایەتی سیاسی (ی. ن. ک)و بەشی زۆری دامودەزگاکانیان گواستبوویانەوە بۆ سورداش. یەکێتی نووسەرانی کوردستانیش هەر هاتبوونە ئەوێ. هەر لەسورداش چەند جارێک "مام جەلال"مان لەنزیکەوە بینی، جارێکیان لەگەڵ چەند نووسەرێکی سلێمانیدا و دووجاری تریش لەگەڵ کاک "فەرەیدون دارتاش"داو هەموو قسەکانیش لەبارەی بارودۆخی سیاسی و مەسەلەی شەڕ بوونەوەو نەبوونەوە بوو لەگەڵ حکومەتدا .

نەورۆزی (١٩٨٤) لەسورداش کرا، خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەلێ گەورەبوو، بە مەزەنە نزیکەی ملیۆنێ کەس لەوناوچەیەدا بەدرێژایی ڕێگەی دوکان سلەیمانی کۆببوونەوەو سەیرانیان ئەکرد. ئەو ڕۆژە شانۆنووس و ئەدیبی ناسراو "محێدین زەنگەنە" و چیرۆکنووسی ناسراو "جەلیل قەیسی" لەگەڵ ئێمەدا

بوون. یەکێک لەو دیمەنانەی لە بیرمناچێتەوە ئەوە بوو: (مامە ڕیشە هاتبوو بۆ سورداش و ئەم سەیرانە، وەختێ خەڵکەکە زانییان ئەوە مامە ڕیشەیە، بەسەدان کەس شوێنی کەوتبوون و لەدواییدا هەڵیانگرت و خستیانە سەر شان و لەچەندین لاوە پەلاماریان ئەدا بۆ ئەوەی ماچیبکەن و لەدواییدا پێشمەرگەیەکی زۆرهاتن و تکایان لە خەڵکەکە کرد دووربکەونەوە).

لێرەدا سێ مانگێک ئەگەڕێمەوە بۆ دواوە، واتە بۆ مانگی یەکی (١٩٨٤) ئەوکاتەی تازە دەنگی دانووسان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا بلاوببۆوە، بەلام هێشتا بەڕەسمی هیچ دانیشتنێ نەببوو، هەواڵێکمان پێگەیشت کە تەرمی زانای بەناوبانگی کورد "تۆفیق وەهبی" لەفلان ڕۆژدا لە لەندەنەوە ئەگاتەوە پیرەمەگرون و لەسەر وەسیتی خۆی لەوێ بەخاک ئەسپێردرێ. ئێمەیش لە سلەیمانییەوە دەستەیەک لە نووسەرانی کورد بەڕێکەوتین و گەیشتینە پیرەمەگرون .

من؛ چەند ڕۆژێ لەوەوبەر وتارێکی پەخشان ئامێزم نووسیبوو، وەختێ زانای گەورەیان بەخاک ئەسپارد، لەوکاتەدا لەشاخەوە مام جەلال و کاک فەرەیدون عەبدولقادرو د. کەمال خۆشناو و دەستەیەک پێشمەرگە پەیدابوون، هەڵبەت لەسلێمانییەوە خەڵکی تریش هاتبوون. چەند وتارێک خوێنرانەوە. دواکەسیش کە قسەی کرد مام جەلال بوو، بارودۆخەکەی ئەوکاتەی بۆ ئامادەبووان ڕوونکردەوە، لەهەمانکاتیشدا بەتوندی پێی لەسەر ئەوە داگرت کە کەرکوک شارێکی کوردستانییەو جێی پێکەوە ژیانی هەموو نەتەوە جیاجیاکانەو هەروەها وتی (پێویستە هەموو ناوچەکانی تری کوردستان وەک خانەقین و زمار و شێخان و مەندەلی و شەنگار بگەڕێنەوە بۆ سەر کوردستان) .

ئەو قسانە بۆ ئەو ڕۆژگارەو لەکاتێکدا ئەوان تازە لەسەرەتای ئەوەدا بوون دانووسان لەگەڵ حکومەتدا بکەن، تاڕادەیەک ئاستەنگی بۆ ئەو مەبەستە دروست ئەکرد، بۆیە دوای گەڕانەوەیان و لەڕێگە یەکێک لەو برادەرە نزیکانەی خۆی پێی ئەڵێ: (بەڕاستی مام جەلال ئێجگار دەستت داگرت، ئێ تۆ خۆت نازانی ئێمە وا تازە خەریکین لەگەڵ حکومەتدا دەستبکەین بە موفاوەزات؟)، ئەویش لەوەلامدا ئەڵێت: (ڕاستە! بەلام ئەو "شێرکۆ بێکەس"ە وتارەکەی ئەوەندە بەسۆزو گەرم و حەماسەتدار بوو، منیشی جولاند!) کە ئەم قسەیەیان بۆ گێڕامەوە وتم: (وادیارە تائێستە زمانی شیعر دەنگی زولاڵی خۆی هەرماوەو

ئەتوانن لەکات و شوێنی خۆیدا کاریگەربن، بەڵام من شاعیر و ئەو سیاسەتمەدار، ئەبوو ئەو خۆی لەو سۆزدارییە بەدوور بگرتایە!).

بەپەیوەندیگرتن لەگەڵ یەکێتی نووسەرانی کوردستانداو ئاگادارکردنەوەی نووسەرانی شاری سلەیمانی، لەسەرەتای هاوینی ساڵی (١٩٨٤) دا مام جەلال لەهاوینەهەواری "مێرگەپان" داوەتێکی گەورەی بۆ نووسەران و شاعیرانی شاری سلەیمانی کرد .

ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کوردستان و بەشێکی لەبەرچاوی نووسەرو شاعیرانی دیارو ناسراوی شاری سلەیمانی هاتبوون، ژمارەی هەموو ئامادەبووان لەسەرو چل ئەدیبەوە ئەبوون "هەردی، دیلان، ع. ح. ب، ع. ع. شەونم"یش لەم دیدارەدا بوون.

لە (١٩٨٥-١٩٨٦)دا و لەشاخ بەردەوام پەیوەندیم لەگەڵ هاوڕێ نزیکەکانی خۆمدا لەسلێمانی هەر مابوو، بەتایبەتی لەگەڵ بێگەرددا، لەڕێی نامەکانی ئەوەوە ئاگام لە هەموو دەنگوباسێکی ئەدەبی و هونەری هەبوو، تەنانەت لەهەموو کتێبێکی تازە چاپکراو چ بەکوردیو چ بە عەرەبی یان وەرگێڕدراو لەزمانەکانی دنیاوە. ناو بەناو کتێبیشی بۆ ئەناردم. بەتایبەتی ڕۆمان. من هەر لەزووەوە شەیدای خوێندنەوەی ڕۆمان بووم، یان ئەو توێژینەوانەی کە ئەمزانی سوودیان لێوەرئەگرم. چونکە کە خوێندنەوە نەبوو نووسینیش نابێ !

خوێندنەوەی چیرۆک، کاریگەریەکی زۆری لەسەر ڕەوت و ئەزموونی شیعریم هەبووە. ئەگەر خوێنەر یان ڕەخنەگری وردبین تەماشا بکات. درامای شیعرم پەیوەندییەکی زۆری بە جووڵەو دیالۆگ و گێڕانەوەی هونەری ناو چیرۆکەوە هەیە، ئەمە نەک هەر لەقەسیدە درێژەکاندا، بەڵکوو تەنانەت لەپۆستەرە شیعرو کورتە شیعرەکانیشدا "هەوێنی چیرۆک" ئەبینرێتەوە. جۆرێک لەسەردی ئەم هونەرەی تێدایە، شیعر لای من لەڕێی موتوربەکردنی هەردوو هونەری سەردو شیعرییەتەوە، لەڕێی ئەو ئاوێتەبوونەوە پێگەیشتووەو گەشەی کردووە، شیعری زهنیم یان زەینیم کەمە. من بەوێنەکێشانی وشەو کامێرای خەیاڵ و درامای شانۆو سینەما درێژەم بەئەزموونی خۆمداوە. ئەمەوێ ئەوەی وتم بیهێنمە پێشچاوی خوێنەری شیعرم، وەک ئەوەی لەبەردەم پەردەی سینەمایەکدا دانیشتبێ، وەک ئەوەی شیعرەکە بەرجەستە بکەم .

شیعریی زەینی و موجەڕەد زۆر زوو لەبیرئەچێتەوە. هەر ئەوساتەیە کە ئەیخوێنیتەوە. تامەکەیشی، چێژ لێوەرگرتنیشی، ئەگەر خۆشیش بێ، وەک تامی شۆکۆلاتەیەک وەهایەو هەرزوو لەدەمدا ئەتوێتەوەو دوای خۆی هیچ لەناخی خوێنەردا بەجێناهێلێ .

من؛ لەیەککاتدا بۆ خۆیشم ئەنووسم و بۆ خەلکیش، خۆشەویستیی خەلکیشم بۆ ئەدەبەکەم لەلا گرنگەو بەهای خۆی هەیە. چونکە ئەزانم شیعریش لەدوای خۆم بۆ ئەو کەسانەیە هۆگری ئەم هونەرەن. من ئەوەندە هێماو ڕەمزو ئاماژەی ناڕاستەوخۆو مانای شاراوەم لابایەخدارە کە شیعر نەکەن بەژێر هەرەسی خۆیانەوە، یان لە چاووگوێ و عەقل و هەست ونەست بزری بکەن. من بۆ یەک هەلبژاردە نانووسم، بەلکوو بۆ هەموو هەلبژاردەکان ئەنووسم، چونکە تەنانەت لەناو خەلکی سادەیشدا هەلبژاردە هەر هەیە. من نەهەموو دەرگاکانی ناو شیعر ئەخەمە سەرپشت و نەقفلیش لە هەموویان ئەدەم. ناوەندێک هەیەو کار لەو ناوەندەدا ئەکەم .

شیعر؛ بۆیە شیعرە چونکە لە قسەی باوو لەمانای باوو تەنانەت لە مەنتیقیش دەرئەچێت، کە عەقل جلەوگیری یەکەمێتی، بەلام لەهەمانکاتیشدا لەو هونەرو ئەزموون و زانیاریانەیش خالی نییە کەعەقل گەنجینەین. چۆن ژیان تاریفێکی چوارچێوەداری نییە، شیعریش هەروایە. ئەدەب بەشیعر و چیرۆک و شانۆو ڕۆمانیشەوە ئەگەر "خەیال"ی لێدەربهێنین، شتێکی وای بۆ نامێنێتەوە بتوانێ پێی بچێ و بەردەوام بێ. هەر ئەم خەیالەشە، شاعیر و ئەدیب لەمێژوونووس و وتار نووسە سیاسیی و کۆمەلایەتییەکان جیائەکاتەوە. شاعیر ڕووی دەمی ئەکاتە دل و دەروون و ناوچە حسییەکانی ناخی مرۆڤ، ئەمەیش بە پلەی یەکەم دێت .

نازانم بەلای منەوە ئەوە هەلەیەکی باوە، وەختێ ئەوترێ فلان شاعیر، شاعیرێکی سیاسیی یان شاعیری موقاوەمەت یان شاعیری غەزەل و دلدارییە. چونکە ئێمە وەک سەرئەنجام شیعرمان ئەوێت، جا ئیتر بۆ هەرچییەک بوترێ، ئەشێ شاعیرێ وەک "بابەت و ژانر" زۆرتر و کەمتر لەبوارێکدا بەرهەمی هەبووبێ، بەلام ئێمە بەشوێن شیعریەتدا وێلین، نەک ناونیشانەکان. جگەلەوەیش شاعیری بەخشندە هەرگیز لەیەک وێستگەدا گیرناخوات. دوێنێ بۆ غەزەل خوێندوێتی و ئەمڕۆ بۆ موقاوەمەت و ئەشێ سبەینێ هەر تەواو پێچەوانەی ئەو دوو دنیایەو بۆ بێهودەیی بنووسێت، بەلام ئێمە ئەو دنیایانەمان بەشیعرەوە

ئەویت. شیعر بەکۆنی و تازەیی نییە، بەزەمان و کات و شوێن نییە، بە کێش و سەرواو یان پێچەوانەکەی نییە. شیعر هەیە هەزار ساڵە نووسراوەو کەچی لە ئێستەیشدا هەر ئەخوێندرێتەوەو ماوە. شیعر هەیە ئەمڕۆ ئەنووسرێ و هەر ئەمڕۆیش ئەمرێ. شیعر هەیە شێوەی تازە ئەپۆشێ و بەلام زۆر کۆن و دواکەوتوو بیرئەکاتەوە. زۆرجار جوانترین شیعر ئەو شیعرانەن، کە سادەن. تۆ وائەزانی ئەتوانی لەوە بڵێیت و بەلام بۆت ناوترێ. ئەو شیعرانەی ڕاگوزەر بەلاماندا ئەڕۆن و نەبیستن و نەهەست و نەستمان و نە ڕۆحمان تووشی هیچ سەرسامبوون و ڕاچڵەکین و ڕامانێک ناکەن، ئەوانە شیعری عادیین، شیعر بە کورتی و درێژیش نییە، بە ئەفراندنە.

لە سالانی (١٩٨٥-١٩٨٦)دا دەرفەتی زۆرترم لەبەردەمدا بوو، بۆ ئەوەی لەڕێی خوێندنەوەی شیعرەوە یان کۆڕ گرتنەوە بگەمە لای (پ. م)ەکانی کۆمەڵەی ئێران و حزبی دیموکرات. بۆیە مانگی جارێ یان دوو مانگ جارێ بەلایەنی کەمەوە ئەو کۆڕانەیان بۆ ئەگرتم. لێرەدا لەجێی خۆیدایەتی کەمێک لەسەر مەسەلەی خوێندنەوە یان ئیلقاکردنی شیعر ڕابوەستم..

شیعر هەر لە کۆنەوە لەگەڵ ئیلقاکردن و بەگۆرانی کردندا هاتووە، چونکە هونەرێکەو زۆرتر بۆ بیستنەو کەمتر بۆ بینین. ئەمەیان بەپێچەوانەی هونەری شێوەکارییەوە. هەر لەکۆنیشەوە داستانە شیعرییەکان بەئاهەنگ و ڕیتمێکی تایبەتییەوە خوێندراونەتەوە. شیعر "بەخوێندنەوەی" باشەوە زیندووترە وەک لەوەی بێدەنگ و لەسەر کاغەز یان بەچاپکراوی بیخوێنیتەوە. با شیعرێ جوانیش بێت، بەلام ئەگەر جوانیش ئیلقا نەکرێ لە "تارێ"ک یان "کەمانچە"یەکی هەڵواسراو ئەچێت بە دیوارێکەوە بێدەنگ و بێجووڵە! بەلام کە جوانیش خوێنرایەوە باڵندەیەکە لە هەڵفڕیندا و یان شەپۆلێکە بەزیندوویی گوێت لێیەو ئەیبینی نەک لە وێنەیەکدا. خوێندنەوە هەر بریتی نییە لە تۆنەکانی دەنگ، بەڵکوو پەیوەندیەکی دینامیکیشی بەلەش و سەمای لەش و جووڵەی سەروو دەستیشەوە هەیە .

شاعیر هەیە زۆر شاعیرەو بەلام ئیلقای باش نییە، لەبەرئەوە لەڕۆژئاوا زۆرجار شاعیرە هەرە باشەکان کە خوێندنەوەیان باش نییە پەنا ئەبەنە بەر ئەکتەرەکان بۆ هاوکاری کردنیان. من هەر لەسەرەتاوە بایەخێکی زۆرم بەخوێندنەوە داوە. ئەو بەهرەی خوێندنەوەیەشم تێدا بووە. ئەوەتەی لەبیریشمە شیعرم

بەدانیشتنەوە نەخوێندۆتەوە، چونکە هەستمکردووە بەشێک لە لەشم ئەمرێنم و ئەمەیش بەگشتی کارئەکاتە سەر ئیلقاکردنم، جوولانەوەی دەست و سەرم .

ئیلقاکردن پێویستی بە هەموو ئەندامەکانی لەشە، لەقورگەوە بۆ پەنجە، لە "سەر"ەوە بۆ جوولەی هەردوولق. ڕەنگینکردنی ڕەنگ لەوەختی خوێندنەوەدا، ئاگا لێبوون لەبەرزی و نزمی و چرپە و هەموو ئیمایەک کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر هەستی گوێگر. زۆرجار لەخوێنەرانی شیعری خۆم بیستووە وتوویانە: (وەختێ ئێمە خۆمان شیعرەکان ئەخوێنینەوە ئەو چێژەی لێوەرناگرین کاتێ کە خۆت ئەیخوێنیتەوە). بەکورتی وەک مایکۆفسکی وتویەتی: "ئیلقاکردنی باش نیوەی شیعرە ".

وەک لەدواییشدا باسی ئەکەم من بۆ خۆم دووسەعات زیاتر لەیەک وەستاندا قەسیدە درێژەکانی خۆم خوێندۆتەوە، لە هەمانکاتیشدا گوێگرانم تاقەتیان نەچووەو بێزارنەبوون و هۆڵیان بەجێنەهێشتووە. بێگومان ئەبێ ئەوەش بزانین دەنگ و جوولەی لەش و ڕاوەستان بۆماوەیەکی دووردرێژ پەیوەندیەکی فیزیکیان بە تەمەن و تەندروستی و میزاجی شاعیرەوە هەیە. لەم تەمەنەی ئێستەمدا، هەست ئەکەم، ئەو دەنگەی جاران و ئەو تاقەتەی جارانم نەماوەو خوێندنەوەم لەیەک سەعات تێپەڕ بکات ئیتر تەواو ماندوو ئەبم.

لەسەر مەلا بەختیار؛
تکام لە مام جەلال کردا!..

شوێنی هاوینەی ستافی ڕادیۆ لەناو داروبارو گوێ ڕووباری ئاوی گەلییەکەدا بوو .

جێگایەکی دڵگیرو سێبەری زۆر بوو، هەر دوو دوو سێ سێ یان هەر خێزانەو شوێنێکی بۆ خۆی چاککردبوو، کەپرو ساباتیان لەسەر دروستکردبوو. لەناوەندیشدا سەکۆیەکی گەورە هەبوو، یان بابڵێین، میوانخانەی هاوینە بوو. ئیتر لەوێ کۆئەبووینەوە یان تەماشای تەلەفزیۆنمان ئەکرد. نزیکی ئاوەکەیش کەپرێکیان بۆمن بەتەنیا چێکردبوو، لەبەردەمی کەپرەکەیشدا، گابەردێکی زل هەبوو، بنەکەیان کۆڵیبوو. ئیتر بووبوو بەکونە تەیارەیەکی باش .

نەبەردەکانی پێشمەرگە لەهەموو کوردستاندا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ جەزرەبەی گەورەو کاریگەریان لەسوپای عێراقی ئەدا، دەستکەوتی (پ. م) زۆر بووبوون، دیلەکانی دوژمن زیادیانکردبوو. پەیوەندیکردن بەهێزی پێشمەرگەوە زۆر بووبوو، لەبەرئەوە حکومەتی عێراقیش تۆپ بارانکردن و بۆردومانکردنی بەفڕۆکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بۆ سەر ناوچە ئازادکراوەکان لەزیادبووندا بوو. لەوماوەیەدا، چەند جارێک فڕۆکە جەنگییەکان هاتنە سەرمان، بەتایبەتی بۆ سەربارەگاکەی کاک نەوشیروان، بەڵام شوێنەکە لەوە عاسی تر بوو کە ئەوان بتوانن زەفەری پێبەرن. تۆپباران کردنیش لە زیادبووندابوو، ناوبەناویش لەپڕدا

ئەوەستاو دیسانەوە دەستی پێئەکردەوە. لەشوێنی زستانەیش چەند شوێنێک بۆ خۆحەشاردان و خۆشاردنەوە دروستکرابوون. جاری وا هەبوو کە تۆپ باران یان بۆردومان بەهێزو بەردەوام بووایە، لەو ژێر زەویانەدا کۆمەڵ ئەبووین، سەیر ئەوەیە زۆرترین نوکتەو قسەی خۆش و پێکەنین لەو کاتانەدا دروست ئەبوون.

من زووتر کاک مەلا بەختیارم نەئەناسی، پێموایە لە نزیکەوە بۆ یەکەمجار هەر لەشاخ بوو یەکترمان بینی، ئەویش یەکێک بوو لەو کەسانەی هەر لە سەرەتاوە ئالوودەی شیعرەکانم بوو، یان خۆی وتەنی (لە دەروێشەکانی شیعرم بووە).

ئەو وەختەی لەلایەن هێزەکانی یەکێتییەوە گیرا، من بۆخۆم زۆرم پێناخۆش بوو، ئەمەیش هیچ هۆیەکی سیاسیی لە پشتەوە نەبوو، بەتەنها لایەنی ئینسانی و ئازادی ڕادەربڕین و بەرگریکردن نەبێ لە هەقی مرۆڤێ. لە یاخسەمەر بوو زۆر بەپەشۆکاوی کاک ئازاد هەورامی-م بینیو پێی وتم (پێویستە فریاکەوین نەبادا کارەساتێکی ناخۆشتر ڕوبدا). یەکێتی نووسەرانی کورد هەر لەدوای گرتنەکەی بەچەند ڕۆژێ یادداشتێکیاندا بەمام جەلال و هەموومان ئیمزامان کرد .

بەتایبەتیش مام جەلال-م بینی و تکام لێکرد بوارنەدا کارێ بکرێ ئەنجامی ناخۆشتری لێبکەوێتەوە. داوایشم لێکرد ڕێگەمبدات ببینم، ڕێگەیاندام و بینیم، لەماڵێکدا بوو، هەموو پێداویستییەکی تێدا بوو. پێموایە جارێکی تریش لەگەڵ کاک "جەوهەر کرمانج" دا بەیەکەوە دیمان، لەوەختی قسەکردندا پێموت (ئایا ئەم جیابوونەوەیە لە کاتی خۆیدا بوو، ڕاست بوو؟!). من تەنها ئەوەندەم لەبیرماوە، کە وتی (ئەی ئەو خۆی بۆچی "مەبەستی مام جەلال بوو" لەکاتی خۆیدا لەبارزانی جیابۆوەو کوتلەیەکی تری دروستکردا) .

ئەوەی ڕاستیبێ وەلامەکەیم بە دل نەبوو، بە هەرحال ئەو هەر گیرابوو. کە من چوومە ئەورووپاو، لەوێش کۆمەڵێ لەڕووناکبیران و خەڵکی تر یادداشتێکیان بۆ ئازادکردنی مەلا بەختیار-دا بەسەرکردایەتی "ی. ن. ک"و دیسانەوە جارێکیتریش دەنگی خۆم خستەوە پاڵ دەنگی ئەمانیش، لەسلێمانیشەوە بێگەرد نامەی تایبەتی بۆ نووسیبووم و ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەو گرتنەی مەلا بەختیار دەربڕیبوو.

هەر لەو سالانەدا، لەسەروەدەمێکدا کە حزبی دیموکرات لە گەورەدێ بوون و د.قاسملوێش لەوێ بوو، چەند جارێک بۆ کۆڕی شیعر خوێندنەوە چووم بۆ لایان. بیرمە سالیادی حزبی دیموکرات بوو، لەگۆڕەپانەکەی ئەوێدا، شوێنی

دانیشتنی خەڵک و شانۆیەکی بچووکیشیان دروستکردبوو. منیش کۆمەڵێ شیعری خۆم خوێندەوە. بەتایبەتی ئەو شیعرانەی پەیوەنداربوون بەڕۆژهەلاتی کوردستانەوەو بەقوربانییەکانی ئەوێوە. لەشیعرێکدا کۆمەڵێ وێنەی کاریکاتۆری تێدا بوو، لەسەر ڕیش و جبەو فرو‌فیڵی مەلاکان، دوایئەوەی هاتمە خوارەوەو ئاهەنگەکە تەواو بوو، د. قاسملو پەلیگرتم و بردمییە ئەولاوەو بەپێکەنینەوە پێی وتم: (ئەرێ تۆ ئەو هەموو مەلاو ڕیشنانە لەپێشەوە دانیشتبوون نەتبینین؟! ئەوە چیتکرد؟!). منیش پێموت: (دکتۆر گیان مەبەستم ئەم ڕیشانە نەبوو، ئەمانە ڕیشی دۆستن. من مەبەستم لەڕیشە دۆزەخییەکان بوو!).

د. قاسملو؛ ئەگەر سەفەری ئەوروپای نەبوایە هەر لەگەورەدێ بوو، مام جەلال-یش کردبووی بە بەرنامە، دوور لە بەرنامەی سیاسی و کۆبوونەوەی حزبی، هەموو جارێ کەئەچوو بۆ گەورەدێ، ئەینارد بەشوێن چەند کەسێکدا لەوانە "کاک جەمال حەکیم و کاک یوسف زۆزانی و منیش". ئیتر ئەو کۆڕانە لەوێ ئەبوو بەکۆڕی قسەی خۆش و باسی شیعرو ئەدەب، دیارە بەئامادەبوونی هەڤاڵەکانی دەفتەری سیاسی یان کۆمیتەی ناوەندی خۆیشیان وەکوو "شەرەفکەندی و کاک عەبدوڵلای حەسەن زادەو کاک فەتاح کاویانی و کاک جەلیل گادانی و کاک حەسەن شەرەفی". لەو ماوەیەدا ڕەنگە لەپێنج شەش جار زیاتر ئەم دیدارانەمان کردبێ .

دانیشتن لەگەڵ د. قاسملودا تامی خۆی هەبوو، چونکە ئەم پیاوە چەند پیاوێ بوو لەیەک کاتدا: "دیبلۆمات و سیاسی، ئابووریناس، مێژوونووس و ئینجا شیعر و ئەدەبناس و نوکتەبازو جوانیی پەرست و دەم وپل پاراو قسەزان". ئەوکاتەی باسی شیعری ئەکرد ئەیزانی چی ئەڵێ، من بۆ خۆم گوێم لێبووە. نیوەی شیعری (گۆران)ی لەبەربوو. بەتایبەتی ئەو شیعرانەی بۆ سروشت و ژنی وتوون. هەموو جارێکیش ئەیوت: (گۆران ئەمەیانە) نەک "گۆران"ی "بۆ میهرەجانی بۆخارست ."

د. قاسملو لەڕوانیندا جۆرە تیلییەک لەچاوەکانیدا هەبوو، هەمیشەیش لێو بەخەندە بوو. کە باسی نەیارە سیاسیەکانی خۆیشی ئەکرد، هەر بەتەنزوگاڵتەوە باسی ئەکردن، نوکتەی لەسەر دروست ئەکردن، توندڕەو نەبوو. هەمیشە میانڕەو بیری ئەکردەوە. کە گوێی لەهەندێ شیعری من ئەبوو، هەر ئەوەنەبوو باڵ نەگرێ. ڕێزی زۆری لێئەگرتم، بەهەڵسوکەوت و قسەیدا دیاربوو کە چەندی خۆشئەویستم. باسی هەرچیەکت بکردایە، شتێکی لێئەزانی. ئەوکاتە لەگەڵ

کۆمەڵەدا ناتەباو لەشەڕدابوون. هەروەختێ پێتبوتایە ئەوەبۆچی ئاشت نابنەوەو ڕێک ناکەونەوە؟ ئەیوت: (ئەوە بەمن ناکرێ بەمام جەلال ئەکرێ، خۆی چۆنی دروستکردن ئەتوانێ بەو جۆرەیش ئاشتمان بکاتەوە!). خەڵکی سلەیمانی خۆش ئەویست، باسی ئەو چەند جارەی ئەکرد کە هاتۆتە سلەیمانی و گاڵتەی لەگەڵ خەڵکی ئاسایدا کردووەو ئەوانیش چۆنیان وەڵامداوەتەوە ..

هەر *لەو دیدارانەدا،* ڕەنگە من بۆ خۆم چەند جارێک ئەوەم *لێبیستبێ* ئەیوت: (ئەوە وەسیيەتی باوکمە قەت بڕوا بە عەجەم نەکەم! ئەگەر پێتگەیشت و توانیت بیکوژی بیکوژە ئەگەرنا هەڵبێ و لەگەڵیدا دامەنیشە! چونکە لەدواییدا ئەو تۆ لەناوئەبات!!). ئەوەندەی من لە د. قاسملو گەیشتبم، پیاوێکی خەیاڵی نەبوو، هەرشتێ بنەمایەکی نەبوایە بڕوای پێنەئەکرد. جا ئەو شتە یان ئەو مەسەلەیە چەند پیرۆزیش بوایە، بەشی زۆری شیعرەکانی حافزی شیرازی و خەیامی لەبەر بوو، ئەو ڕای وابوو لەناو شاعیرانی کورددا "هەژار" لەهەموویان باشتر خەیامی کردووە بە کوردی. د. قاسملو "حەیاتی" بوو، وەختی سیاسەت بۆ سیاسەت، گاڵتە بۆ گاڵتە، ژیانی تایبەتی بۆ ژیانی تایبەتی.

پارێزگاری خۆی زۆر ئەکرد؛ چی ئەخواو چی ناخوا، چەند ئەخواتەوە؟! جارێکیان پارچە نانێکی هێناو هەندێ کەرەی تێهەڵسوو خواردی. وتی: (ئەمەیش بۆ ئەوەی نەبادا ئەمشەو هەندێ "زیادە خواردنەوە"م هەبێت). لێمپرسی یانی چۆن؟! وتی: (ئەمە دیواری مەعیدە سواغ ئەداو ئیتر بادەکە کەمتر ئەمژێ) .

باسی شەراب یان هەر بادەیەکت بکردایە، ئەو مێژووەکەی لەبەربوو. ئەمە چییە؟! لەکەیەوە دورستکراوە؟! جیاوازییەکەی لەگەڵ ئەوانی تردا چییە؟! بۆ باشەو یان بۆ خراپە!. جارێکیتر لەدانیشتنێکدا نیو سەعات زیاتر باسی جیاوازی نێوانی ئایینی ئیسلام و مەسیحی کرد، بەسلبیات و ئیجابیاتی هەردوو ئاینەکەوە. یەکێک لەو خاسیەتانەی لە د. قاسملودا هەبوو.. کە من زۆر بەدلم نەبوو، بەلام دەمێک بوو هەستم پێکردبوو، سۆزی ئێرانچێتی بوو! تێکەڵاوبوونی من لەگەڵ دکتۆردا، تێکەڵاوبوونی سیاسی و حزبی نەبوو، چونکە هەندێ کەسی تر ڕایان وابوو د. قاسملو لەناو حزبی دیموکراتدا سەبارەت بەدەسەڵاتی سیاسی و دیموکراسی نەک هەر کراوە نەبووە، بەڵکوو جۆرێک لەدیکتاتۆریەتیشی تێدا بووە!. من ئەوە نازانم و هیچ زانیارییەکیشم لەو بارەیەوە نییە. من باس لە ئەزموونی خۆم و ئەو دیدارانە ئەکەم، کە ئەوم تیا بینیوەو بەس. واتە دوور لە سیاسەت و حزبایەتی .

بۆ نموونە لەپڕێکدا ڕووی ئەکردە من و ئەیوت: (شان وملی و گەردنی ڕووتی بێگەرد/ سنگی نەرم و مەمکی قوتی توند وەک بەردا) شیعرەکەی گۆران. ها کاک شێرکۆ ئەڵێی چی؟!. منیش ئەو شیعرەی خۆم بۆ ئەخوێندنەوە:

مەدالیای کەمانێکی بچکۆلانەت

دابوو لە سنگ

کە هات و چۆت بە بەردەمی مندا ئەکرد

گوێم لێئەبوو

کەمان ئەکەوتە لێدان و

ئەشمبینی

مەمکەکانت ورد ورد سەمایان بۆ ئەکرد

ئیتر ئەویش یەک لەسەر یەک ئەیووت (بەه. بەه. بەه) .

بێگومان قسە خۆش و بەمەغزاکانی کاک "فەتاحی کاویان"یش لەلاوە بوەستێ، کە ئەو کۆڕو مەجلیسانەی چەند ڕەنگین و خۆشتر ئەکرد. ئەو وەختەی کە کوردستانیشم بەجێهێشت و چوومە ئەوروپا، دوای چەند ساڵێک لەپاریس یەکترمان بینییەوە. ئەوە یەکەمجارم بوو پاریس ببینم، ئەو ڕۆژانە لای کاک فەرهاد پیرباڵ میوان بووم .

کاک فەرهاد لەسۆربۆن ئەیخوێند، دیارە ئەو چاوساغ و ڕێنیشاندەرو دەلیلی من بوو، چووین بۆ کۆڕەکە. ژمارەیەکی لەبەرچاوی گوێگر هاتبوون، دوای تەواوبوونی کۆڕەکە، دووسێ کوڕی گەنج هاتن بۆ لام و وتیان: (سڵاوی تایبەتی د. قاسملوت پێ ئەگەیەنین. داوای لێبوردنی ئەکرد کە خۆی نەیتوانی لەم کۆڕەدا ئامادەبێت، بەڵام بۆ ئێوارە لەدەفتەری حزب چاوەڕێت ئەبێت، خۆت و هاوڕێکانت).

بۆ ئێوارە من و کاک فەرهاد پیرباڵ و چەند هاوڕێیەکی تر چووین بۆ ئەو شوێنەی، کە ناونیشاکەیمان وەرگرتبوو، وەختێ لە دەرگاماندا، دکتۆر خۆی دەرگاکەی کردەوە، ئەوە یەکەمجار بوو دوای چەند ساڵ بیبینمەوە. مێزێکی درێژ لەهۆڵەکەدا ڕازابۆوە، دیاربوو هەر خۆیشی خەریکی بووبوو. دوای دانیشتن، دکتۆر وتی: (کاک شێرکۆ پاریس ئەوەندە جوانە مەحاڵە لەبیرت بچێتەوە. بەلای منەوە پاریس و پراگ هاوتایان نییە). ئەو شەوە تادرەنگ هەر

قسەی خۆشیکردووە. لەدواییدا وتی: (ئێستا ئیتر لە پاریسدا ژیانێکی تر دەست پێئەکات، لەبەرئەوە خواحافیزت بێ و هەریەکەو بۆ هەواری خۆی) .

هەر لەو سەفەرەدا، کە بۆ دواجار د. قاسملوم بینی. لەچایخانەیەکی جوانی پاریسدا بوو. دیارە هەر لەگەڵ کاک فەرهاد پیربال-دا بووم. دکتۆریش کاک "عەبدوڵلای قادری" لەگەڵدا بوو. بەرامبەر بەیەک دانیشتبووین. چامخانەکەی تەنیشتمان لەسەر شەقامێکی دڵ فڕێندا ئەیڕوانی، من چاوێکم هەر لەدەرەوەبوو، لەوەختی قسەکردندا دکتۆر وتی: (من سەردانێکی ڤییەننام هەیە بۆ هەندێ کار، بەڵام دوای ڤییەننا دێم بۆ ستۆکهۆڵم و لەوێ یەکتر ئەبینین). ئێمە پێشتر هەستاین و تەوقەو خواحافیزی و لەیەکتر جیابووینەوە. ئیتر ئەوە دوا دیدارو دوا تەوقەو دوابینینی یەکتر بوو بۆ هەتا هەتا!

ئاوی چەمەکە؛

کاک نەوشیروانی لەمەرگ ڕزگار کرد!..

پێموایە لەبەهاری (١٩٨٥)دابوو، دەمەو عەسری لەبەرگەڵو غەڵبەغەڵب و بەیەکدا هاتنێ دروستبوو، وەختێ چوومە خوارەوە، بینیم برادەرەکانمان پەشۆکاون و قسەئەکەن، پرسیم چیبووە؟ گێڕایانەوە: (پێش نیو سەعاتێ لەوسەری پردە دارو تەختەکەی سەرچەمی گەلییەکە، بۆمبێکی تەوقیتکراو بۆ کاک نەوشیروان دانراوەو تەقیوەتەوە، بەڵام سەلامەت بووە). ئەمە کاتێک ڕوویداوە کە کاک نەوشیروان و کاک فەرەیدون عەبدولقادر پێکەوەئەبن و ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ ماڵ و بارەگاکەی کاک نەوشیروان، وەختێ ئەگەنە سەر پردەکە، لەوێدا کەمێک ڕائەوەستن و تەماشای ئاوی چەمەکە ئەکەن، ئەو تۆزە دواکەوتنە ئەبێتە هۆی ڕزگاربوونیان.

بۆ ئێوارە چووم بۆلای کاک نەوشیروان، پێموایە ئەژنۆیشی کەمێک بریندار بووبوو، بەهەرحاڵ، ئەو شەوە کۆنترۆڵی ناوچەکەکراو دەرکەوت "کابرایەک" کە کارگێڕێکی فەنیی بوو لای کاک سەعدون و لەڕاگەیاندن کاری ئەکرد. ئاسایشی حکومەت توانیبووی بیکڕێ و ئەوکارەی پێبکات، بەڵام ناوبراو توانی دەربچێ و خۆی بگەیەنێتە ناو هێزەکانی حکومەت. برایەکی هەبوو، کە لەدواییدا ئەمیش گیراو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کراو دوایی بزربوو! جا ئیتر نازانم ئایا ئەمیش لەو پیلانەدا لەگەڵ براکەیدا ببوو یان نا؟! لەم ڕووەوە ئێستاو ئەوسایش هیچم بۆ ڕوون نەبۆوە!

لەساڵی (١٩٨٦)دا ئەو وەختەی چووبووینە شوێنی هاوینەمان، ڕۆژێک بێگەردی هاوڕێم هات بۆلام و هەندێ کتێبیشی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێنابووم. هەروەها کۆمەڵێ نوکتەی تازەیشی لەسەر قادسییەی سەدام پێبوو، هەروەک دەنگوباسی نووسەران و یەکێتی نووسەرانیش، ئەو سەردەمە "دڵشاد مەریوانی" سەرۆکی لقی یەکێتی نووسەرانی سلێمانی بوو، "شێخ حەسیب و جەمال شارباژێڕی و ئەژی گۆران" ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەربوون. بێگەرد؛ ئەوەیشی بۆ گێڕاینەوە کە گوشار لەسەر نووسەران زۆرتر بووە، بۆ ئەوەی بۆ قادسییە بنووسن. من خۆم بەر لەوەی سلەیمانی بەجێبهێڵم واتە هەر لەساڵی (١٩٨٤) لەپارێزگای سلەیمانییەوە بانگیانکردم، بریکاری پارێزگاری سلەیمانی ئەو وەختە بینیمی و بەکورتی داوای لێکردم، کە بۆچی شیعرم بۆ قادسییە نەنووسیوە! ئەوەی بێتەوە بیرم، وەڵامی من ئەوەبوو کە شاعیر، دارتاش و خەیات و قوماش فرۆش نییە، کە داوای کورسییەک یان قاتێ جل و چەن مەترێ قوماشت لێکرد، دەستبەرێ و بداتێ. ویستم ئەوەی پێبڵێم کە شیعر لەدڵ و هەست و سۆزەوە سەرچاوە ئەگرێ بۆیە بەزۆر بەمن دروستناکرێ!. ئەمە لەکاتێکیشدا بوو کە هێشتا شەڕ نەبووبۆوە، جا دوای ئەوە دیارە گوشارەکان بۆسەر شاعیران و نووسەران لەزیادبووندا بوون .

وەک لەدوایشدا زانیم لەسالانی (١٩٨٧-١٩٨٨)و لەسالانی دواتردا، ئەم گوشارانە گەیشتبوونە ڕادەیەک، ڕاستەوخۆ هەندێ لەو ئەدیبانە لەلایەن بەڕێوەبەری ئاسایشی سلەیمانی یان هەولێر یان دهۆکەوە بانگ ئەکران و هەر لەژوورەکانی خۆیاندا جۆرە لێکۆڵینەوەیەکیان بەدەم هەڕەشەوە لەگەڵدا ئەکردن و سووکایەتیان پێئەکراو ئەوانیش ئیتر بەبیانووی جۆراوجۆر خۆیان قوتار ئەکرد .
بێگەردو تایەر ساڵح سەعیدی هاوڕێمان، لەسەرودەمێکدا چەند جارێک لەلایەن بەڕێوەبەری ئاسایشەوە بانگکرابوون، زۆر بە توندیو بۆ چاوترساندن قسەیان لەگەڵدا کردبوون، هەڕەشەیان لێکردبوون. هەڵبەت لەو سەردەمەدا گەلێ ئەدیب و نووسەر و هونەرمەندی تر بەو جۆرەی ئەوان هەڕەشەیان لێکرابوو، گوشاریان خرابووە سەر، بەلام لەبەرئەوەی من نازانم کێ و کێ بوون، بۆیە تەنها ئەو دوو هاوڕێیەی خۆم کرد بە نموونە. ئەوەی ڕاستیبێ ئێمەیەک کە لەشاخ بووین، لەباری دەروونییەوە زۆر باشتر بووین لەو هاوڕێیانەی ناو شارمان. لەو ڕۆژگارە دژوارانەدا ژیان لەشارداو لەژێر سایەی دەسەلاتی بەعسدا هەروا ئاسان و سانا نەبووە.

لەماوەی ئەو دووساڵەدا کە لەبەرگەلوو بووم، چەند جارێک نەسرین و منداڵەکان، بەدزییەوە ئەهاتن بۆلام و ماوەیەک لەژوورەکەمدا ئەمانەوەو لەگەڵ خۆیشیاندا نامەی ئازیزان و ئەوەندەی بۆیان ئەکرا کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاریان بۆ ئەهێنام.

نەسرین؛ لەدوا سەرداندا ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە ئاسایشی سلەیمانی لە قوتابخانەکاندا تاقیبی ئەو قوتابیانە ئەکەن کەباوکیان یان براو کەسوکاریان لەناو پێشمەرگەدان و لەوانەیە ئەگەر وابڕوا نەتوانن دەوام بکەن. منیش پێموت: (منداڵی ئێمەیش وەکوو منداڵی ئەو هەموو پێشمەرگانەی ترو چی ئەبێ بابێ!).

لەم هاوینەدا کاک "هەڤاڵ کوێستانی" فریشتەی ژنی لەلای بوو، ئەوانیش کەپرو جێی هاوینەی خۆیان هەبوو، ناوبەناویش ئەگەر خواردنێکی باشیان هەبووایە بانگیان ئەکردم. لەدوای گرتنی مەلا بەختیار هەڤاڵ بێتاقەت بووبوو، هەرچەندە ئەیوت من هیچ جۆرە پەیوەندییەکم بەوانەوە نییە، بەڵام پێئەچوو لەگەڵیاندا بووبێت، ئەمە بەلای منەوە ئاسایی بوو. لەنووسینیش بۆ ڕادیۆ سارد بووبۆوە .

لەناو هاوڕێ نزیکەکاندا؛ من بەتەمەڵ و لەشگران ناسراوم، ئەمە ڕاستی تێدایە، بەڵام کاک حەمەی حەمە باقی و سامی شۆڕش-یش بەهاراتی قسەی خۆیانی زۆر پێوە ئەکەن. ئەوەندەیشیان باسی ئەم لەش گرانی و تەمەڵییەی من کرد، بۆیە لە دواییدا بڕیارمدا لەو سەیران و گەشتانەدا کەپێکەوە ئەمانکرد، بەتایبەتی لەکۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا، ئیتر هەر نەجوڵێم. چونکە بیشجوڵامایە ئەوان ئەو قسانەی خۆیان هەر ئەکرد! ئەو کاتەی چووبوومە لای هەڤاڵ و لەژوورەکەی ئەودا بووم، نوکتەیەک ڕوویداو ئیتر دەماودەم بڵاوبۆوە. چاکتر وایە خۆم بیگێڕمەوە .

لەشاخ میوانی سەرەڕێ و ناسیاوو دۆستی پێشمەرگە زۆربوون، کە لەپڕ خۆیان ئەکرد بەژووورداو ئیتر ئەبوایە تۆیش یەکسەر چایەکت لێبنایە! بۆئەوەی لەمە ڕزگارم بێ، نوقڵم کڕیبوو، هەر میوانێ ئەهات نوقڵەکەم ئەگێڕاو تەواو، بەڵام ئەگەر هەڤاڵ لەوێ بوایە، چایەکەی لێئەناو ئیتر ئەوسا منیش نوقڵەکەم نەئەگێڕا. جارێکیان پێنج شەش پێشمەرگەی ناسیاوی هەڤاڵ خۆیانکرد بەژووورداو، بەڵام هەڤاڵ لەوێ نەبوو. دوای بەخێرهاتن پێموتن: (بەخێربێن یاخوا بەخێربێن، بەداخەوە هەڤاڵیش لێرە نییە چایەکتان بۆ لێبنێ!) .

بەڕاستی زۆر قسەی خۆش و ڕووداوی پێکەنیناوی لەژیانی پێشمەرگایەتیدا بوون، چ لەشۆڕشی ئەیلولدا و چ لە تازەیشدا. پێموایە کاک حەمەی حەمە باقی؛ سەردەمێ بوو بیری لەوە ئەکردەوە ئەو قسە خۆش و گاڵتەوگەپانەی ناو ژیانی پێشمەرگایەتی کۆبکاتەوەو چاپیشی بکات. چونکە بەڕاستی ئەوەیش کولتورێکە بۆخۆی و هەقوایە بپارێزرێ، بەڵام ئیتر نازانم لەبەرچی کاکە حەمە ئەوەی نەکرد. لە سنووری ناسین و زانیاری مندا قسە خۆشەکانی کەسانی وەک: (عوسمان قادر منەوەر، کاک عەزیز ئەحمەد، کاک دلێری سەید مەجید، کاک بەهاددین، کاک حەمە جەزای گۆرانیبێژ)و زۆری تریش، کە ڕەنگە من ناویانم نەبیستبێ و کەمتازۆر بەشێکی تەمەنیان لەناو شۆڕشەکانی کورددا بەسەربردبێ، بریتن لە گەنجینەیەکی بەنرخی ژیانی نێو شاخوداخ و کولتوورێکی ڕەنگینی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە ئاوێتەن بۆ ئەو ڕۆژگارانە .

ئەمە جگە لەوەی بەهایەکی تری ئەو قسە خۆشانە لەوەدایە، کە لەکاتە ناخۆش و پڕ مەترسییەکاندا کراون و خوڵقاون. پێکەنین بوون لەگریاندا، یان زەردە خەنە بوون لەفرمێسکدا، هەڵبەت من ناتوانم لەدوو توێی ئەم بیرەوەرییانەدا هەرچییەکم دیوە یان بیستووە بیگێڕمەوە. مەگەر یەکدوو نموونەیەک بکەم بەسەرتڵی قسەکانم و هەر ئەوەندەیش لەم ژیننامەیەدا جێگەی ئەبێتەوە.

کاک حەمە جەزای هونەرمەند و گۆرانیبێژ هاوڕێم بوو، جگە لەبەهرەی دەنگ خۆشی، دانیشتنیش لەگەڵیدا تابڵێی مایەی دڵخۆشی و ئاسوودەیی بوو. جگەلەوەیش بەدرێژایی چەندین ساڵ "پ. م"بووەو ڕۆژانی سەخت و ناهەمواریشی زۆر دیبوو. جارێک بۆیگێڕامەوەو وتی: (لەناوچەی شاربازێڕ پێشمەرگەبووم، تیپەکەمان لەیەکێک لەو گوندانەی ئەوێ، ئێوارە درەنگ لایداو دوو دوو و سێ سێ دابەشبووین بەسەر ماڵەکاندا. من و "پ.م"ێکی تر بەرماڵێ کەوتین، بەتەنها پیرێژنێکی لێبوو. زۆریشمان برسیبوو، دوایئەوەی دانیشتین، وتمان: "دایەگیان چیت هەیە بیخۆین؟" ئەویش وتی: "پیر خەنیلە!" وتمان "زۆر باشەو بەزیادبێ" دوایی من وتم: "وەڵلا دایەگیان ئەگەر یاغنی کێشێکت هەبێت من لەوەدا بەتێکۆشین ئەیخۆم ."

پیرێژنەکە قەیرێ ڕاماو لەدواییدا وتی: "ئەغنیکێش؟!" ئەبێ بۆی بگەڕێم. ئیتر گەڕاوگەڕا تا دۆزییەوە. منیش وتم: "خۆیەتی زۆرباشە". دوایئەوەی نانمان خواردو سەروو چایشمان خواردەوە، هەستاینە سەرپێ و ئەوکاتە وابوو بەتانی

یان لێفەت لەهەمان ماڵ وەرئەگرت و ئەچوویت بۆ مزگەوت، لەوێ ئەنووستی و بۆ سبەینێ ئەتبردەوە. ئینجا وتمان: "دە دایەگیان سەرو بەتانیمان بەرێ و ئەچین بۆ مزگەوت". داپیرە گەڕاوگەڕاو بەتانییەکی تازەی دا بەهاوڕێکەم، ئینجا دەستیبرد لێفەیەکی زۆر شڕوکۆنیشیدا بەمن! تۆزێ بێدەنگ بووم و دوایی پێموت: "باشە دایەگیان بۆ بەتانییەکەی ئەم واتازەیەو لێفەکەی منیش وا شڕوکۆن؟ وەلامی دایەوە: "ڕاست ئەکەیت، بەلام ئەوەی لەیاغنێکێشدا نان بخوا، ئەبێ لێفەی وایش بدا بەخۆیدا!).

کاک عوسمانی قادرمنەوەر؛ لەناوچەی سلەیمانی سەردەستەی کۆمەڵێ "پ. م" ئەبێت. بەتەنها یەک "پ. م"ی خەڵکی هەولێریش لەم دەستەیەدا ئەبێت و تازەیش هاتۆتە دەرەوە. هەر یەکەم شەو بانگی ئەکات و پێی ئەڵێ "هاتیت بەخێر بێیت، بەلام لەئێستەوە وریات ئەکەمەوە، گێچەڵم بۆ دروست نەکەیت و هەولێر چێتی بکەیت!).

لەمیوانخانەکەی بەرگەڵو، تەلەفزیۆنێکی ڕەش و سپیمان هەبوو، شەوانە بەدیارییەوە دائەنیشتین. ئێوارەیەک کاک دلێری سەید مەجید میوانمان بوو، لەپێشەوە لەبەردەمی تەلەفزیۆنەکەدا دانیشتبوو، کاتێ بەرنامەی منداڵان بوو، فیلمە کاریکاتۆرەکەی پاپای نیشان ئەدا، کاک دلێر چاوی لێ نەئەتروکان. وەختێ فلیمەکە تەواو بوو، ئاوڕێکی لەمن دایەوەو یەکسەر وتی: "ئەم فیلمانە بۆ منداڵیش ئەبن !"

لەشۆڕشی ئەیلولدا ئێمە لەڕاگەیاندن کارمان ئەکرد و هەوارمان لە "ئازادی" هەڵدابوو. لەگەرووی هۆمەر ئاغاو سەری حەسەن بەگ شەڕێکی قورس بوو، کاک "عەزیز ئەحمەد"یش ئەوکاتە گوایە پ. م بوو. خۆی لێیەستبوو، بەرەو خوار بێتەوە. زەردی ئەکردەوە لە فیشەکدا، دوا دیوانی منیش کە ساڵێ پێشتر دەرچووبوو ناوی "من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ"ی پێبوو.. لەچادرەکەی خۆمدا بووم، کاک عەزیز خۆیکرد بەژووورداو یەکسەر وتی: (ئەوا ئێمە ئەچین بۆ ناوگڕەکەو تۆیش وەرە تینوێتی خۆت لەوێ بشکێنە!) .

وەک وتم لەم قسە خۆش و گاڵتەوگەپانە بەخەروار هەنو بەلام تەنها لێرەدا ئەم مشتە بچووکەم کرد بە نموونە.

لەبەرگەڵوو هەر لە هاوینی (١٩٨٦)دا بوو، یارییەکانی تۆپی پێی جیهانی دەستیان پێکردبوو، ئیتر لەئێوارەوە ئێمەیش بەچوارمشقی لەسەر کومبارەکە

دائەنیشتین و چاومان لەتەلەفزیۆنەکە نەئەتروکان، لەناو خۆیشماندا لەسەر بردنەوەی ئەم تیپ یان ئەو تیپ گرەومان ئەکرد. پێموایە دوا یاری نێوان بەرازیل و ئەڵمانیا بوو، ئەبوو بەپەنالتی ئەم یارییە کۆتایی بێ. بیرمە "زیکۆ"ی یاریزانی بەرازیلی هات و شووتەکەی خۆیلێدا، بەلام گۆلی نەکرد! بۆچەند چرکەیەک ئێمەی لایەنگری بەرازیل متبووین و لە دواییدا من وتم (ئەوە دووکەسن لەم دنیایەدا ناتوانن گۆل بکەن، زیکۆ و شێرکۆ)!.

ئەو هاوینە کاک "فەرید ئەسەسەرد" لەوێ بوو، نازانم چۆن بوو تا ئەوکاتە خۆی ون نەکردبوو، ئێوارەبوو لەسەر سەکۆکە کۆمەڵ بووبووین، لەناو خۆماندا قسەمان ئەکرد. لەپڕێکدا کاک فەرید وتی: (ئەوەی ناوێ ساڵێکی تر ئەڕۆینەوە!). وتم: (چۆن؟) وتی: (ئێ سەدام ئەڕوخێ و ئێمەیش هەریەکەو بۆماڵی باوکی خۆی!). وتم: (ئەمە گاڵتەیە یان بەڕاستییە؟!). وتی: (زۆر بەڕاستمە). وتم: دەبا پێت بڵێم بیست ساڵی تریش سەدام ناڕوخێ. ئیتر بوو بەمشتومڕ، ئەڕوخێ و ناڕوخێ و کردمان بەگرەو لەسەر سەد دینار! لەم دەنگە دەنگەدا بووین، لەناکاو لەناو دارەکانەوە مام جەلال دەرکەوت و هات بۆلامان. هەر لەڕێوە وتی: (گرەو لەسەرچی؟!) .

بۆمگێڕایەوە کە کاک فەرید ئەڵێ ساڵێک نابات سەدام ئەڕوخێ و منیش پێی ئەڵێم نەخێر تا بیست ساڵی تریش هەر ئەمێنێ!. مام جەلال وتی: (من لەگەڵ کاک فەرید-دام!). ئەوسا وتم (ئێ زۆر باشە من ئەگەر لەسەر سەد دینار گرەوم لەگەڵ ئەودا کردبێ؟ ئەی لەگەڵ تۆدا لەسەر چەندبێ؟). وتی: (دە ئەوەندە باشە؟!) وتم (زۆرباشە). بەلام ئیتر ئەوەندەی نەخایاند، من چوومە دەرەوەی وڵات و سەدامیش نزیکەی ئەو بیست ساڵەی من وتم هەر لەسەر حوکم مایەوەو گرەویش لەبیرچۆوەو منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

ئەو ڕۆژەی بەکوڵ؛
بۆ عوسمان و دوو کوڕەکەی گریام..

لەناوەڕاستی مانگی حوزەیرانی (١٩٨٦)دا نەسرین و منداڵەکان هاتن بۆ بەرگەڵوو بۆ لام، هەر لەشوێنی هاوینەو کەپرەکەماندا هەفتەیەک زیاتر مانەوەو ڕۆژی (١٩٨٦/٦/٢٤) پیکابێکم بۆ گرتن بەکرێ و خواحافیزیم لێکردن و ڕۆیشتنەوە بۆ سلەیمانی.

تەنها دوو سەعاتێ دوای ئەوان، زۆر بەکوتوپڕی، دوو فڕۆکەی جەنگی لەجۆری سیخۆ هاتنە سەرمان، من ئەوساتە لەسەر قەرەوێڵەکەی خۆم پاڵکەوتبووم، نزیکی نیوەڕۆبوو. لە گڕەگڕی یەکەمجاری فڕۆکەکاندا من هەر پاڵکەوتبووم، کە بوو بەگڕەگڕی دووەم، هەستمکرد زۆر نزیکن. هەستام و بەدوو هەنگاو گەیشتمە بەردەمی کونە تەیارەکەو گرمە هەستاو گوشاری هەوایەکی بەهێزم بۆ هات و بەقنگدا کەوتمە ناو کونەکەوە. دیسانەوە گرمەیەکی ترو چوارپێنج دەقیقەیەک لەو شوێنەدا مامەوە تا گڕەگڕو گرمەژن نەما، ئەوسا هاتمە دەرەوە. کەتەماشام کرد هێشتا هەر تەپ و تۆزبوو، تۆزێ ڕوونیکردەوە ئەمجارە سەرنجمدا بەدەیان چناری دەوروبەرم وەک درونێنە کرابن پڕوپۆیان نەمابوو، بەڵام کەپرەکە هەر لەجێی خۆی بوو، لەبەری ئەو بەریشەوە لەشوێن چایخانەکەی 'عوسمان سەرگەڵویی'ش تەپ و تۆزێکی زۆر بە ئاسمانەوە بوو، هاتمەوە ناو کەپرەکە، بەڵام دیمەنێکی ترسناکم بینی:

"تەڵزمی ڕیشاڵ ڕیشاڵی بۆمبایەک، کە هەر ئەوەندەی پاکەتە جگەرەیەک ئەبوو، ڕێک دابووی لەناوەڕاستی سەرینەکەم و ئینجا لەژێر قەرەوێڵەکەدا دابووی لەجانتا بچووکەکەی ڕیش تاشینم و لەکتێبێک کە کاک بێگەرد بۆیناردبووم بۆ خوێندنەوەو لەدواییشدا لە ئەرزەکەدا چەقیبوو". دوایئەوەی ئاسمان بەتەواوی ڕوونبۆوە، هاوڕێکانم هەموو هاتبوونە دەرەوەو گوێم لێبوو یەکێکیان هاواری ئەکرد "هیچ نەبووە.. هیچ نەبووە"، هیچ کەسیش لەئێمە بەرنەکەوتبوو .

کاک عوسمان سەرگەڵویی؛ ئەوە دوو هاوین بوو بە بەرزییەوە لەوبەری ئێمەوە، چایخانەیەکی دانابوو. ناوبەناویش ئەگەر لەسەرگەڵو قەسابی بکرایە، ئەمیش سەر لەبەیانیان بۆ فرۆشتن جگەرو دڵی ئەبرژاندو منیش یەکێک بووم لەمشتەرییەکانی. کاک عوسمان لەسییەکانی تەمەندا بوو، هەموو ڕۆژێکیش لەگەڵ خۆیدا هەردوو کوڕە بچووکەکەی ئەهێنا بۆ چایخانەکە. منداڵەکان چوارپێنج ساڵان بوون، هەردووکیان چاوشین و جوانکیلە. پێموایە جمک بوون، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو لەوبەرەوە بوو بەهاوار هاوار، هەواڵێکی ناخۆش گەیشت کە عوسمان و هەردوو کوڕە بچکۆلەکەی پێکەوە شەهید بوون .!

ساتەوەختێکی خەماوی و تراژیدی بوو، بۆیە خۆم پێڕانەگیراو بەکوڵ گریام. ئێمە لەم شپرزەییەدا بووین و بێگەردی هاوڕێم دەرکەوت. لەسلەیمانییەوە هاتبوو، ئیتر بێگەرد هاتە ژێر کەپرەکەم و بەچاوی خۆی سەرینەکەم و پارچەکەی بینی و کتێبەکەی خۆیشی چاوپێکەوت و دوایی لەگەڵ خۆیشیا بردییەوە.

تۆپباران و بۆردومان وچانیان بۆ نەبوو، بە درێژایی دۆڵی جافەتی و تائەگەیشتمەوە نزیکی کارێزەو ئیتر لەولایشەوە هەموو ناوچەی بالیسان، بارەگا بەبارەگاو گوند بەگوند ڕۆژانە بەفڕۆکەو شەوانەیش بەتۆپ دائەگیرایەوە. هەر لەو ماوەیەدا لە"یاخسەمەر"ی دا، من ئەوکاتە بەمیوانی چووبووم بۆ لای ناوەندی کۆمەڵە کە لەنزیکی یاخسەمەر چادرەکانیان هەڵدابوو، کاک ئازاد هەورامی لەوێ نەبوو "د. خەسرەو خاڵ" بریکاری بوو. دوو شەو لەلای د. خەسرەو مامەوە، ئەویش لەمن جگەرەکێشتر بوو. بیرمە شەوێکیان تانزیکەی بەرەبەیان دانیشتین و بەهەردووکمان یەک گلۆز جگەرەی "ڕۆسمان"مان کێشا! گلۆزەکە لە شارەوە بۆ دکتۆریان ناردبوو. ڕۆژی بۆردومانەکەی یاخسەمەریش دوای ئەوەی فڕۆکەکان ڕۆیشتن هەردووکمان بەیەکەوە چووین بۆ یاخسەمەر، تەماشامانکرد چوار پێنج خانوو بەتەنیشت یەکەوە وێران بوون و ئەسووتێن .

"پاییزه"خانی ژنی کاک "فەرەیدون عەبدولقادر" لەبەر ماڵەسووتاوەکەیدا، غەمبارو چاوبەفرمێسک تڕووشکەی کردووە، کە ئێمەی بینی هەستاو سەیر ئەوەبوو بەمنی وت: (توخوا کاک شێرکۆ ئەم ماڵ وێرانی و ئاگر و دووکەڵە، هەقی شیعرێکی نییە). منیش هەربەپێکەنێک وەڵاممدایەوە.

هەر لەساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٦)داو لەدۆڵی جافەتی و لەپشتی مالوومە لای حزبی کۆمۆنستی ئێران- کۆمەڵە، چەند جارێک لەگەڵ هەردوو هونەرمەندی ناسراو کاک "ناسری ڕەزازی و نەجمەدینی غولامی"دا یەکترمان بینی. هەروەها بۆ یەکەمجار لەوێ "کاڵێ"ی هونەرمەندم ناسیی و ئەم خۆشەویستانە لەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا کاریان ئەکردو ئەندام بوون. ئەو سەردەمە چەند سروودێکی تازەیشیان هەبوو لە کۆڕوکۆبوونەوەی شەوانەدا ئەیانوت. ئەم هاتوچۆو تێکەڵاوبوونە لەگەڵ کۆمەڵەدا گەلێ لە "پ. م"ەکانی کردە هاوڕێم. کاک "ناسری سەلاحی" کە پێشتر لەشۆڕشی ئەیلولدا کاک "حسام"ی باوکیم "هێد"ی ناسیبوو، وا ئێستەیش لێرە کاک ناسری کوڕی بۆتە یەکێک لەئاشنا ڕۆشنا نزیکەکانم .

کاک ناسر جار جارە خۆیشی شیعری ئەنووسی و شیعری شاعیرە فارسەکانی وەک ئەحمەدی شاملۆو ئەوانی تری بەکوردییەکی جوان تەرجەمە ئەکرد. هەڵبەت پێشتر لەسلێمانی کاک ناسری ڕەزازیم ناسیبوو. پێموایە لەکۆتایی حەفتاکاندا چەند جارێک بەیەکەوە دانیشتین. دیارە خۆشترین شەویان، ئەو شەوە بوو لە ماڵی "کاوەی ئەحمەد میرزا"ی ژن برام بەیەکەوە لەگەڵ کاک "ئەحمەد میرزا"و کاک "مەحمودی تۆفیق شلک" و "ڕەووف بێگەرد" و کاک "تایەر ساڵح سەعید" و "خەسرەوی" ژن برام، کاک "ئەنوەر قەرەداخی" بەخۆیی و کەمانچەکەیەوە دانیشتین و تا درەنگان، ڕەزازی تێی ئەچریکان و کاک مەحمودیش سەفەرەکەی خۆی ئەوت و بێگەردیش گۆرانییەکانی ماملێی ئەخوێند، سەرباری ئەمانەیش هەمووی، گوڵی بۆن خۆشی مەجلیسی یارانیش کاک "ئەحمەد میرزا" خۆی بوو کە بەقسە خۆش و دانار دانارەکانی کۆڕەکەی ئەوەندەی تر گەرم و شیرین کردبوو.

هەروەک پێشتریش ئاماژەم بۆ کردبوو، کاک "ئەحمەدی میرزا عارف" ئامۆزای "بێکەس"و هاوڕێشی بوو، لەخوێندەوارەکانی سەردەمی خۆی بووە، پیاوێکی زەین ڕوون و قسە خۆش بوو. نەک هەر شیعر دۆست، شیعرناسیش بوو. لەهەر کۆڕێکدا بوایە ئیتر ئەو کۆڕە بەقسە خۆشەکانی ئەو ئەگەشایەوە. بڕوای بە خورافات و بیری دواکەوتووی ناو کۆمەڵ نەبوو. بیرمە ئەو شەوەی "ئارمسترۆنگ" پێی خستە سەر مانگ، ئێمە گوێمان نابوو بەڕادیوەکانمانەوە، کاک ئەحمەد وتی: (ئەم چوونە سەر مانگە پشتی مەلاکانی شکاند!).

هەروەها وتی: (ئیتر لەئێستە بەدواوە سەردەمێکی تر دەست پێئەکات). کاک ئەحمەد لەهاوڕێ نزیکەکانی مامۆستا برایم ئەحمەدیش بوو، هەرجارێک باسی ئەوبکرایە ئەیوت "بلیمەتەکە؟".

لەسەرەتای حەفتاکاندا شەوێک هەموومان بەیەکەوە دانیشتبووین، چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ جەژنی ڕەمەزان، کاک ئەحمەد گێڕایەوەو وتی: (لەسییەکاندا فایەق و مەبەستی "فایەق بێکەس" بوو لەگەڵ مەلا عەلی "مەلا عەلی حاجی ئەمینی کاکە حەمە" کە ئەویش هەر ئامۆزایان بوو، چاوێکی هەبوو. بێکەسیش هەر لەمنداڵیەوە بەهۆی نەخۆشی ئاوڵەوە چاوێکی لەدەستدابوو، هەردووکیان سەرلەئێوارەیەک خۆیان ئەکەن بەسەرای سلێمانیدا بۆ ئەوەی بچن شایەتی بدەن کەمانگیان دیوەو بیکەن بەجەژن! لەسەرەتای شەستەکانیشدا کاک ئەحمەد هەر لەماڵی خۆیان شەوکۆڕێک ڕێکئەخات، مامۆستا برایمیش لەوێ ئەبێت، لەوەختی قسەکردندا، مامۆستا برایم لەگەڵ یەکدوانێکی تردا قسە ئەکەن و باسی حوکمی ئۆتۆنۆمی ئەکەن، ئۆتۆنۆمی لەسویسرا بەوجۆرەیەو لە هندستان بەوجۆرەو بەکورتی سەد جار ناوی ئۆتۆنۆمی ئەهێنن. لەدواییدا کاک ئەحمەد ڕووئەکاتە هاوڕێیەکی تریان و پێی ئەڵێ: (تۆ ئەزانی ئۆتۆنۆمی یەعنی چی؟!) ئەویتر بێدەنگ ئەبێت.

کاک ئەحمەد ئەڵێ: من عەقڵت بخوێنمەوە، تۆ وائەزانی ئۆتۆنۆمی پارچەی ئوتومبیلە!. لەساڵی (١٩٧٤)دا کاتێ بەعس دەستیکرد بەپاشەکشەو نەیویست ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئازاری (١٩٧٠) جێبەجێبکات و بارودۆخەکە ئەشێوێ و

شەڕ بوونەوە لەنێوان حکومەت و شۆڕشدا تەواو نزیک ئەکەوێتەوە. کاک ئەحمەد ئەپرسێ چییە؟ بۆچی شەڕ ئەبێتەوە؟ پێی ئەڵێن لەسەر کەرکوک و خانەقین. ئەویش تۆزێ بێدەنگ ئەبێ و لەدواییدا ئەڵێت: (من پێموایە ڕەسافەیش بدەن بەکورد ئێران هەر شەڕ ئەکاتەوە!).

لەسلەیمانی کۆن و نوێدا، نەوە لەدوای نەوە، لەم پیاوە قسەخۆش و زیرەکانە هەر هەبوون. کاک "شێرزاد شەوقی" هاوڕێم، هەمووجارێ چەندین گاڵتەوگەپ و قسەی ئەنتیکەو ڕووداوی کاریکاتێری، لەمانەی من خۆشتری لەبارەی کاک مەحمود شەوقی باوکییەوە ئەگێڕایەوە.

"کاک ئەحمەد میرزا بەنەخۆشی شەکرە لە (١٩٨٢/٦/١١)داو لەتەمەنی (٧٨)ساڵیدا کۆچی دوایی کردو لە سەیوان نێژراو منیش شیعری سەرگۆڕەکەیم بۆ نووسیی."!

بەئاوی لیخن و ڕوونەوە هەر خۆمم؛
بەڵام ڕاسپاردەیەک لاڵی کردووم!..

هەشتاکانی سەدەی ڕابوردوو لەم بەشەی کوردستاندا، چەوساندنەوەو کوشتن‌و وێرانکردن‌و جینۆسایدی کورد گەیشتە ئەوپەڕی .

چیرۆکە تراژیدیەکانی قەسابخانەکانی موسڵ و زیندانەکانی ئەبوغرێب ئەوەندە زۆرن ناگێڕدرێنەوە. لەسەرەتای هەشتاکانداو ئەو وەختەی کە هێشتا لەسلەیمانی بووم، هەفتە نەبوو بەدەیان تەرمی لەسێدارە دراوی گەنجەکانی کوردستان لەزاخۆوە بۆ خانەقین نەگەنەوە بەر ماڵەکانیان. گردی شەهیدانی سلەیمانی مانگ لەدوای مانگ پڕ ئەبوو لەگۆڕی تازەتر. سەرەڕای ئەو کۆستانەیش ئەبوو ئەو خێزانانە پرسەیش دانەنێن‌و هەڕەشەیان لێئەکراو پاسەوانی ئاسایش-یشیان بەدیارەوە دائەنان‌و تەرمیشیان تەسلیم نەئەکردەوە !

خۆ ئەگەر قوربانیەکانیش سەرباز بوونایە، ئەبوو خێزانەکانیان پارەی ئەو فیشەکانەیش بدەنەوە بەحکومەت کە پێیانەوە نابوون! بەڵام لەپاڵ ئەم کارەساتانەیشدا، ئازایەتی و جوامێری‌و چاو نەترسی ئەو قوربانییانە وەختێ بەدەم وتنی سروودی "ئەی ڕەقیب"ەوە ئەچوونە سەر سێدارە، یان بەر لەمردن شاییان بۆ ئەو مەرگە شکۆدارەی خۆیان ئەگێڕاو کراسی سووریان لەبەر ئەکردو هەڵئەپەڕین، ئەم داستانە تازانە، کێوی ورە بوون‌و لوتکەکانیان لەناو ئەم گەلەدا بوون‌و نە بەکەس ئەگیران و نە هەرگیز ئەیشڕوخان .

ساڵی (١٩٨٢) درزێکی گەورە کەوتە دیواری فاشیزمەکانی عێراقەوە، واتە ئەو ڕۆژانەی خۆپیشاندان لەزانکۆی سەلاحەدیندا لەهەولێر دەستپێکردوو ئەو سەردەمەی کە لەشاری سلەیمانیدا، شەوانە لە هەموو گەڕەکەکاندا خۆنیشاندان دەستپێیکرد. من ئەوکاتە لەسلێمانی بووم و هەر لەگەڕەکی ئیسکان، شەوانە، لەهەموو گەڕەکەکاندا خۆنێشاندان دەستپێدەکرد. شەوان ئەمبینی بەدەیان کچ و کوڕی گەنج لەخۆبوردوانە، بەدەم سروود وتن و بانگدانی دروشمەکانەوە گەڕەک بەگەڕەک ئەگەڕانو خوێنی تازەیان ئەکردەوە بەلەشی خەڵکیداو وریایان ئەکردنەوەو ترس و بیمی دیکتاتوریان لەبەرچاو ئەڕەواندنەوە. ئەوە یەکەمجار بوو زەنگی ڕاپەڕین لێبدرێ و ئیتر سڵ لەنەهەنگەکە نەکرێتەوە. لەو ڕۆژگارانەدا بوو، لەگەرمەی نووسینی شیعرەکانی کەشکۆڵدا بووم .

ئێوە ئەو سەردەمە بهێننە بەرچاوی خۆتان و لەو ڕوانگەی گڕوخوێن و سێدارەو ڕاپەڕین و گەماڕۆدانەوە بڕواننە ژیانی ئەو وەختەو یان ئەو شیعرانەی، کە ئەبوو بەڵێ ئەبوو بنووسرێن.

من بێگومانم لەوەی بەشێک لەوشیعرانە بەدەنگی بەرز وەک دەنگی بەرزی کارەساتەکان هاواریان کردووە. شیعرییەت تیایاندا بواری تەنک بووە، ئیستاتیکای وێنەکان زەق بوون، بەڵام ئەوە قوربانییەکان بوون پێیان ئەنووسیم، ئەوە دووکەڵ بوون، بووبوون بەپەنجەرەی خەیاڵی خوێناویم و نە ئەبوو بێدەنگبم و کە دەنگیشم ئەکرد، ئازادی خۆی گەرووم بوو! ئەی چیم بنووسیایە؟ !

چاپەمەنی و زنجیرەی کتێبەکانی یەکێتی نووسەرانی کوردستان لە شاخ زیادیکردبوو. هەر میوانێک لەدەرەوەی وڵاتەوە یان لەناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە بگەیشتنایە یاخسەمەر و چاپخانەی شەهید عەبدولخالق مەعروف، سەرسام ئەبوون و پێیان سەیربوو، چۆن لەم شاخ و داخانەدا، ئەم بزووتنەوە بەبڕشتە ئەنجامدراوە!

لەو سەردەمەدا، ئێمەی نووسەران و شاعیرانی شاخ، لەو ناوچە ئازادکراوانەدا، بە نانو ئاوو پارەوپوولی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەژیاین، هەر لەلایەن ئەوانیشەوە یارمەتی خاووخێزانمان ئەدرا. ئەمە حەقیقەتەو پێویستە دانی پێدا بنێین، بەڵام ڕۆژێ لەڕۆژانیش داوامان لێنەکراوە بەپێچەوانەی ئیرادەی خۆمانەوە تاقە دێڕێکیش نە بۆ یەکێتی و یان بۆ کەس بنووسین. ئەو شیعرو چیرۆک و وتارانەی نووسیومانن، ناخی خۆمان سەرچاوەیان بوون. یەکێک

نەبووە لەئێمە خۆی خۆی ژیاندبێ یان بەهۆی کەس و کاریەوە ژیابێ. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو هەمیشە ژیان و گوزەران و گیرفانی نووسەران، بەهۆی ئەو یارمەتی و بەسەرکردنەوانەوە باشتر بووە لەژیانی "پ. م"ەکان .

مام جەلال؛ لەپێش هەموانەوە ئەو مشوورەی خواردووین و یەک بەیەکمانی بەسەرکردۆتەوە، بەدرێژایی ئەو دووساڵەی ئەزموونی خۆم لە شاخ. بۆ تەنها جارێکیش چییە دڵیان نەڕەنجاندووم. من هەر لەبڵاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کوردستان لەشاخ بەهاوکاری کاک هەڤاڵ کوێستانی کتێبی "ڕووبەڕوو لەسێبەری چیادا"م چاپ و بڵاوکرایەوە. بۆ خۆم لەدوو توێی ئەم کتێبەدا وەختێ باس لە جیابوونەوەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی ئەکەم، هەڵوێستی ئەوسایان شەرمەزار ئەکەم و پشتگیری خۆم بۆ هەڵوێستی هەمانکاتی قیادەی بارزانی دەرئەبڕم و بەیەکێک لەسومبولە گەورەکانی مێژووی کوردی لەقەڵەم ئەدەم. لەگەڵ ئەوەیشدا نە مام جەلال و نەکاک نەوشیروان و نە تاقەکەسێک لەوان بەمنیان نەوت ئەرێ ئەوە بۆچی ئەمەت نووسیوە !

چاکم لەبیرە وەختێ شیعری "میوان"م بۆ کاک نەوشیروان خوێندەوە کە "من خۆم بەیەکێک لەشیعرە جوانەکانی کەشکۆڵی پێشمەرگەی ئەزانم و شیعرەکەیش پێشکەش بەشەهید جەمیل ڕەنجبەر کراوە" لەم شیعرەدا ناوی "کومەڵە" هاتووە. کەچی کاک نەوشیروان پێی وتم: (شیعرەکە وەک شیعر جوانتر ئەبوو ئەگەر ناوی "کۆمەڵە"ت نەبردایە، چونکە زەق ئەبێتەوە!) .

ئەو وەختەی چوومە شاخ چیرۆکەکەی کاک محەمەد موکری "سەگوەڕ" دەرچووبوو، هەر لەشاخ خوێندمەوە، لەدڵی خۆمدا پرسیم "باشە ئەم چیرۆکە چی تێدایە؟ کە هەندێ کادیری توندڕەوی "کۆمەڵە" لەموکرییان کردووە بە هەراو زەنا؟!". کە دووەم چاپی ئەم چیرۆکەیش کرایەوە مام جەلال خۆی پێشەکییەکەی بۆ نووسیی.!

ئەزموونی ئەو دووساڵەی ناو شۆڕشی نوێ و ژیانی نێو شاخ وداخ بۆ من، ئەزموونێکی شیعری و ئەدەبیش بوون. چونکە ئەو ژیانەو ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی لەشاخدا هەبوون، هەر تەواو جیاوازبوون لەژیان و ئەزموونی شار. لەنزیکەوە بینینی بەسەرهات و چیرۆکە تراژیدییەکان و تێکەڵاوبوون لەگەڵ (پ. م)و خەڵکی گوندەکان و گوێگرتن لەڕازونیازیان و لەزمانیان و لەئیدیۆمەکانییان و لە فۆلکلۆریان، بوونە مایەی بەبڕشتکردنی زمانی شیعری منیش .

لەو دووساڵەدا باشتر لەوەگەیشتم کە کاریگەری شیعر لەسەر دڵ ودەروونی "پ.م" و خەڵکیش چەند بەهێزە. من هەتا مردن ئەو قسەیەم بیرناچێتەوە یان ئەو ڕاسپاردەیەی کە بەهادین-ی پ. م کە "لەناو هێزی پێشمەرگەدا بە بەهادینە کۆرە ناسرابوو" بۆی ناردبووم و وتبووی: (ئاواتەخوازم شەهیدبم، بۆ ئەوەی جوامێر شیعرێکم بۆ بنووسێ!). ئەم ڕاسپاردەیە تائێستەیش لاڵی کردووم و نەمتوانیوە شیعرێکی وای بۆ بنووسم کە هێندەی خۆی گەورە بێت، شیعرێک بڵێم، لەهیچ شیعرێکم نەچێت‌و هەر لەو قسەیە بچێت .

شیعر بەئەزموونی بینینی تازەو گەشتی تازەو تێکەڵاوبوونی تازەوە تێراو ئەبێت، لەخوێندنەوەی کتێب گرنگتر، مەگەر هەر سەفەرو یان بینینی ئەو ئەزموونانە بێت کە ئاوێتەیان ئەبێت. هەر لەو دووساڵەداو لەنزیکەوە بەشی زۆری ئەو سەرکردانەی ئەمڕۆم لەژیانی پێشمەرگایەتیدا دیووە، بەشی زۆریان ژیانێکی ئاساییان بووە، لەنەبەردەکانیشدا زۆرجار لەپێش پێشمەرگەوە جەنگاون، ماڵ بەکۆڵ بوون. دیارە تیایشیاندا بووە، زیاد لەپێویست خەریکی خۆی و ماڵی خۆی بووە. تیاشیاندا بوو فەرماندەو سەرکردە بووەو بوونە قوربانییو لەسەنگەرەکانیاندا هەڵنەسان تاشەهید بوون. یەکێک لەو دیاردە خراپانەی ئەو سەردەمە، هەندێ ڕووداوی ناخۆش بوون کە بەبیستن ئەمانبیست و ئازاری ڕۆحی ئەدایین. پێموایە لەدووسێ نموونەیەکیش تێپەڕناکەن، بەڵام کاری نەکردەبوون و پێچەوانەی ئەو ئیدیعای پێشکەوتنخوازییو مارکسیەتە بوون کە ئەیانکردو لەبانگەشەی خۆیاندا بڵاویان ئەکردەوە، ئەویش کوشتنی چەند عاشقێکی کوڕوکچ بوون، کەسەری خۆیان هەڵئەگرت‌و ڕوویان ئەکردە ناوچەکانی پ. م، ئەمانیش بۆ ئەوەی ئەو خێڵ و هۆزانە لەخۆیان نەکەن‌و یان نەچنە پاڵ حکومەت‌و ببن بەجاش، بەنێوی کڕینەوەی شەرەفەوە، ئەیاندانەوە دەست ئەوان‌و ئەوانیش ئەیانکوشتن. ئەم تاوانانە، بەهەر پاساوو بیانوویەکەوە بێت، دووکەس بووبن یان زیاتر، تاوانەو لە ئەستۆی ئەو فەرماندەو سەرکردانەیە کە لەو ناوچانەدا دەسەڵاتدار بوون. شیعری "عاشق" ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعە تاڵ‌و ئەو چیرۆکە تراژیدیانە بوون .

ئەوەندەی بۆم کرابێ، هەوڵمداوە هەمیشە مەسافەیەک کەم تازۆر، بخەمە نێوان خۆم و قیادەی سیاسییەوە، بەو مانایەی ئاگام لەکەسایەتی شیعری و ئەدەبیم بێت. ئەو ژیانە واملێنەکات داوای نابەجێ و ناواقعیانەم هەبێت. ئەوەندە پێیانەوە بنووسێم لێم بێزاربن. ئەوەندەی بۆمکرابێ هەوڵمداوە تا مام جەلال خۆی

نەنێرێ بەشوێنمدا لەخۆمەوە نەچم. داوای شەخسیی بۆ خۆم بکەمو بۆ خەڵک زۆربێ، ئەگەر ڕەخنەیەکەم هەبێت پاشملەنەبێو ڕووبەڕووبێ. ڕەنگە شایەتیشم زۆر بێ و لەو هەڵوێستانەدا منیان دیبێ. چ لەشاخ و چ لەشاریش ڕەنگە لەلاپەڕەکانی تری ئەم بیرەوەرییانەدا هەندێ لەو چیرۆکانە بگێڕمەوە.

من؛ شاعیرم و پیاوێکی سۆزدارو عاتیفیم، ئەوەی زیانی لێداوم یان منی هەندێجار بەهەڵەدا بردووە، ئەم هەڵچوونە عاتیفیانە بوون، ئەگینا وەکیتر دوورو نزیک مەسەلەی ئایدیۆلۆژی سیاسی کاریگەری بەسەر منەوە نەبووە، بەو مانایەی من ئەگەر شیعرێکم نووسیبێ ناوی "کۆمەڵە" یان "یەکێتی" تیا بووبێ، ئەوە لەپەیوەندیی حزبی و ئایدیۆلۆژییەوە سەرچاوەی نەگرتووە. من هەر لەشیعرەکانی سەرەتایشەوە کۆمەڵێ ناوم هێناوە کەوەک سومبول تەماشام کردوون، ئەو کاتانە ئەڵێم کە یەکێتی نیشتمانی و زۆر حزبی تریش لەدایک نەبووبوون، "دکتۆر فوئاد، شێخ سەعیدی پیران، قازی محەمەد ...هتد.." لە نزیکەوە تێکەڵاوبوونیش لەگەڵ هەر دەستەو تاقمێکدا، کاریگەری خۆی هەبووە بۆ کارتێکردنی ناوی شەهیدێ لەسەر هەست و نەستم، وەک لەشەهیدێکی دوور لەمنەوە .

من؛ پیاوێکی پەلەپەلکەریشم، ئەمەیش بۆ خۆی خاسیەتێکی باش نییەو هەندێجار توشی کۆڵانی دەرنەچووی کردووم و لەدڵدا پەشیمان بوومەتەوە. شیعر لەساتەوەختدا لەدایک ئەبێ بەخۆیشم کۆنترۆڵ ناکرێ، بەڵام ئیتر من بۆ خۆم هەرچییەکم نووسیوە، بەئاوی لیخن و ڕوونەوە سەرچاوەکەی هەر دەروونی خۆم بووە .

هەروەکو جارێکیش بەدورودرێژی لەدیدارێکدا باسم کردووە. شاعیر ئەبێ باجی ناوو ناوبانگی خۆیشی بدات. من شیعرم بۆ شەهیدان و پێشمەرگە نووسیوە، خەڵکیش بەوردی لەوە ناگات شیعر چییە؟ و چۆن ئەنوسرێ؟. لەبەرئەوە کاتێ ئەیانەوێ چلە بۆ ئازیزێکی خۆیان بگێڕن. دایکیان، باوکیان، هاوسەرو خوشک و برایان ڕووم تێئەکەن، داوای بەشداریم لێئەکەن. ئەمە هەڵوێستێکی پڕ لەشپرزەییە بۆ من و نازانم چیبکەم!؟. دەست ئەنێم بەڕوویانەوە زیز ئەبنو دڵیانم لێ ئەڕەنجێ. ئەیکەم ڕەنگە لەسەر هونەری شیعرو نووسینم بکەوێ، یان، بەبارێکی تردا بۆم تەفسیر بکرێ. لەبەرئەوە لەو ساڵانەی دواییدا، ئەگەر بکەوتمایەتە هەڵوێستێکی واوە لێی دەرنەچوومایە. ناچار پەنام ئەبردە بەر

"پەخشان" یان "پەیڤێکی شیعری" یان "وتەیەکی ئەدەبی"، بەلام لەمە ناخۆشتر بۆ من ئەوەیە هەرچیەک بنووسم و بخوێنمەوە تەنانەت ئەگەر نووسینەکە دورو نزیک فڕی بەسەر ئەدەبیشەوە نەبێت .

زۆربەی زۆر هەر ئەڵێن: "ئەو شیعرەی کەخوێندتەوە!". هیچ پاساوێ بۆ هەڵەکانی خۆم و هەندێجاریش لاوازی و ترسنۆکی خۆم ناهێنمەوە. ئەبوو لەسەر خۆ تربم، لەهەندێ کاتدا ئەبوو قسە بکەم و بەلام لەناخدا ترساوم و نەمکردووەو هەڵەبووم. ئەبوو هەندێجار یەخەی سەرکردەیەک بگرم لەسەر غەدرێ یان خەتایەک و بەلام نەمگرتووە. ئەبوو "هەندێ شیعرم" هەیە نەمنووسینایە، بەتایبەتی لەهەندێ سەردەمی ئاڵۆزدا، وەک شەڕی ناوخۆ، باشیعرەکەیش دوور بووبێ لەئاگر خۆشکردن، بەلام لەدواییدا واشکاوەتەوەو لەسەرم بووە بەماڵ، بەڵام من لەهەمانکاتدا پەشیمان نیم لەو شیعرانەی نووسیومن، چونکە لەو ساتەوەختانەدا، ئەو شیعرانە خۆم بوون، هەروەکوو جارێک نووسیبووم: "ئەو جۆرە پەشیمان بوونەوەیە لەوە ئەچێت تۆ لەئەلبوومی وێنەکانی ڕابوردووی خۆت پەشیمان بیت! بەلام بێهودەیە چونکە ئەو وێنانە لەوسادا کەس نییە و هەر خۆتیت ."

بەلام پێویستە ڕەخنە لەخۆم بگرم. بۆ ئەوەی کەسانی ترو شاعیرانی تر ئەو هەڵەو خەتایانەی من دووبارە نەکەنەوە. بەڕاستی من پیاوێکیشم کەم کەس ئەتوانێ لەنزیکەوە یان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵمدا بژی و بێزار نەبێ، چونکە بۆڵەبۆڵم زۆرەو بەئەرکم، زۆر زوو دڵم ئەڕەنجێ، کەم تووڕە ئەبم، بەلام کە بووم، دۆو دۆشاو تێکەڵ ئەکەم. جگەرە زۆر ئەکێشم و دەوروبەرم ئیزعاج ئەکەم. هەندێ جاریش قسەم ڕەقە. شوێنی پارچە کاغەزێ لەسەر مێزەکەم بگۆڕن. دەهری ئەبم، بەلام بەوەش چاکە سروشتێکم هەیە. هەر ئەو ساتەیەو هیچ لەدڵما نامێنێ. لەدواییدا خۆم ئەگەڕێم بەشوێن ئەو کەسەداو ماچی ئەکەمو ئاشتی ئەکەمەوە. من ڕق ئەستوور نیم. تۆڵەکردنەوەم نییە. بەڕاستی من پیاوێکی منداڵم! میزاجم شێوەی هەڵسوکەوتم دیاری ئەکات. کەس بەقەد من عاشقی ژن نییە، لەبەرامبەر جوانەکانیاندا ئەبمە تەیرێکی بەشەوارە کەوتوو. ئەم سیفەتەیش زیانی زۆری پێگەیاندوم. گەلێ جار کردوویانم بە تەڵەوەو دایاندۆشیومو شوڵێکیانداوە لەسەری لووتم. من وەک شاعیرێکی منداڵ باوەشم بۆ گرتوونەتەوەو بەلام هەیانبووە وەک جانەوەر گەمارۆی داوم و تەفرەی داومو کردوومی بەچەشەنی قولاپەکەی .

گەلێجاریش هاوڕێیەکم غەدری لێکردووم‌و ئازاری داوم، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا هەر من چوومەتەوە بۆلای‌و ڕێککەوتووینەتەوە. زۆربەی زۆری ئەو جەزرەبانەی بەرمکەوتوون یان لەهاوڕێی نزیک یان لە خزمی نزیکەوە بووە. چاوچنۆک و بەهەڵپەنیم. ئەوەی هەندێ جارو لەئیستەدا دڵخۆشم ئەکات، بەپێی توانام یارمەتیدانی خەڵکە، ئەوەی نەیزانم ئەوەیە چەند لەگیرفانمایە، بەلام وەک برادەرێکی خۆشەویست پێی وتم: (من دوژمنی خۆمم)، بەتەنگ تەندروستییەوە نیم، منداڵی و لاوێتیم بەهەژاری گوزەراندووە. ئەو ساتەی خۆم بە بەختیار بزانم ساڵی تەواوکردنی بەرهەمێکی تازەترمە، بەلام بەختیارییەکی تەمەن کورت. چونکە قەناعەتم لانییەو چاوم لەبەرهەمی باشترە. من زوو تاقەتم لەشت ئەچێت، جا ئەو شتە هەر چییەک بێت .

بەبیرم نایە لەهیچ "مەوعیدێ" دواکەوتبم، ئەگەر پێش وەخت نەچووبم، بۆیە من لای خۆمەوە پەستو بێتاقەت ئەبم لەوانەی لەوەختی بۆدانراو دوائەکەون. لەنەخۆش کەوتندا بەئەرکم و نرکەنرک و ناڵەناڵم زۆرە. لەمنداڵییەوە حەز بەڕەنگی ڕەش ئەکەم. دەنگم ناخۆش نییە بەوجۆرەی گوێی لێنەگیرێ، بەلام "ئەدام" باشە. لەخواردن دروستکردن‌و ئیشی ناوماڵ، یان چاککردنەوەی شتێکی شکاوو ئەو جۆرەکارانەدا دەست و پێ سپی منم. لەماتماتیکدا خراپم، جاری وا هەیە چوار پێنج مانگ هیچ نانووسم و خەریکە شێت ئەبم و وەختی وایش هەیە لەیەککاتدا دووکارم لەبەردەستدایە .

من چوومە سەر هەر پرۆژەیەک، شیعرێ یان نووسین، وازیلێناهێنم تا تەواوی نەکەم. ئەگەر ژیانم ڕۆمانێک بێ دایکم پاڵەوانە سەرەکییەکەیەتی. جگە لەشیعر حەزم لە هونەری شێوەکاری و گوێگرتنە لەموزیک. حەز لەسەفەری دووردرێژ ناکەم. من وەختم نییە بۆ نووسین، جاری وابووە وەختیش و شوێنی خۆشیشم هەبووە، بەلام هیچم نەنووسیوە! جاری وایشبووە کە کەوتوومەتە ناو نووسینەکەوە لەگەرمەی قەرەباڵغیدا بووم و گوێشم نەداوەتێ، مەگەر شتێکم بەرکەوتبێ یان یەکێک بانگی کردبم ئینجا سەرم هەڵبڕیبێ، گرنگ ئەوەیە جگەرەم لێنەبڕێ. چەندین جار ویستوومە جگەرە تەرکبکەم، یان زۆری کەم بکەمەوە، بەلام نەمتوانیوە .!

من بەتوندی سەرزەنشتی خۆم ئەکەم، ڕقم لەخۆم ئەبێتەوە، کە ئەو ئیرادەیەم نییە. زۆربەی هەرە زۆری ئەو بەرهەمانەی لەئەورووپاو بەتایبەتی لەسوید نوسیومن، لەچایخانەکاندا نووسیومن! ئەو شیعرەی لەناخەوە نەمهەژێنێ، جا

بەهەرشتێک بێ، ماناکەی، زمانەکەی، ئاهەنگی مۆسیقای، وێنەکانی، لای من شیعر نییە .

سەرجەمی بەرهەمی شیعری هیچ شاعیرێکی عەرەبم بەتەواوی نەخوێندۆتەوە، شاعیرانی دنیایشم لەڕێگەی زمانی عەرەبییەوە خوێندۆتەوەو ناسیوە. ئەگەر ئەورووپی بوومایە هاوڕێکانم هەرهەموویان ژن ئەبوون، لەدوای شیعریش ئەگەر مەسەلەیەکی کۆمەلایەتی هەبێ و من کاری بۆ بکەم یان بۆمکردبێ داکۆکیکردن بووە لەمافی ژن و پەیامی یەکسانی و بەرامبەری. بەڕاستی ژن لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستو ولاتە ئیسلامییەکاندا پەراوێزێکی لاوەکی و مرۆڤێکی چەندجار لەسەریەک چەوساوەیە .

پێموایە لە هەر کۆمەڵێکدا لەوپەڕی دنیاوە تائەمپەڕی، ئەگەر ژنی تیا ئازادنەبوو نەپیاویش ئازادەو نە منداڵو نەکەس! کۆمەڵێکە بێ دوارۆژ، ئازادی ژن پێوانەی سەرەکییە بۆ هەموو ئازادیەکانی تر، بۆ دیموکراسی و شارستانی و کۆمەڵی مەدەنی و هەموو پێشکەوتنێ. بەلام پێویستە ژن خۆی ببێ بەیەکەمین پارێزەرو داکۆکیکار لەمافی خۆی، بەلای منەوە کولتوری ئیسلامی، کە گوتاری عەرەبچێتی، کولتوری زاڵێتی، گەورەترین هۆکاری ئەم داڕزانەیە لەم ولاتانەدا. چونکە دوای هەزارو شەش سەد ساڵ هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە. بچووکترین دەستکاری لەبڕگە شەرعی و ئایینیەکەیدا نەکراوەو لەسەردەمی پێغەمبەرەوە چۆن بووە ئێستەیش هەروایە. ئەمە کارەساتێکی گەورەی ناو عەقڵی سەلەفییە، من لەگەڵ جیاکردنەوەی ئایینم لەدەوڵەت. تائەمەیش نەبێت ئازادی تاک مەحاڵە. داب و نەریتەکانی زیندانێو کۆتو پێوەندێکی قورسن بۆ مرۆڤ .

عەقڵی کورد: بەگشتی پاشکۆی عەقڵی ئەوان بووە! لەناو کۆمەڵی کوردا عەقڵی ئەو کولتورە زاڵە، کولتوری پیاوو دەسەلاتی پیاو. کولتوری تۆڵەسەندنەوەو شەڕی خوێناوی. کولتوری یەک پەیام و یەک ئایین و یەک جۆر بیکردنەوە. کولتووری خۆم و کەسی ترنا. کولتووری قەدەغە کردنی پرسیارو نەبوونی عەقڵی ڕەخنە. تەفسیرکردنی هەموو شتێ بەپێوانەی پەیامێکی ئایینی کە هەموو حەقیقەتەکان بەتەنها لەخۆیدا کورت ئەکاتەوەو هیچ حەقیقەتێکی تر لەدوای خۆیەوە نەک نابینێ، بەڵکوو ئەیانخاتە ناو ئەرزی حەرامیشەوە. ئێمە لەوێوە داگیرکراوین. لەوکاتەوە نێچیرین و پڕکراوین لە تۆڵەو خۆپەرستی و نەفیکردنی بەهاکانی دەرەوەی خۆمان. لەوکاتەوە جەستەمان دیلی ئەو دەقانەیە، کە

ڕەخنەیان کردە حەرام و مێشکیان گرێدایـن. من لەگەڵ ئازادی مرۆڤ و ئازادی بیروڕادام. لەگەڵ ئەوەدام مزگەوت و کڵێسەو کەنیسەو مەیخانەو کۆڕی مولحیدەکان و ئایینی ئێزیدی و سائیبەو هەرهەموویان هەبن و ڕێگەیان لێنەگیرێ .

لەم تەمەنەدا هەر تەواو میانڕەوم، بڕوام وایە هەموو ئەو بەڵاو کارەساتانەی بەسەر دنیادا هاتوون، لەکونەوە تائەمڕۆ، لەئایینەوە بۆ دەوڵەت و بۆ حزب و بۆ ماڵ و ناو خێزانیش. لە شیعری "ماک"دا ویستومە بەزمانی شیعرو وێنە ئەم ڕاستییە بدرکێنم، دیموکراتی و شارستانی و کۆمەڵی مەدەنی، کە لەم ڕۆژانەدا زۆرباس ئەکرێن، دەرئەنجامی ڕاپەڕینی عەقڵ و ڕووناکبیرین، دروشم نین، دەرئەنجامی پێگەیشتنی پرۆسەی ڕەخنەن. نەک بانگەشەی حزبی، کۆمەڵی دیموکرات وەختێ دروست ئەبێ، هەموو جیاوازییەکان یەکتریان بەسنگی فراوانەوە قبوڵکردبێ. ئازادی تاکیان ڕەها کردبێ، یەکسانی و بەرامبەری ژن و پیاویان جێگیر کردبێ. دام و دەزگا مەدەنییەکان لەگەشەکردندابن، لێپرسینەوە لەسەری سەرەوە ئەنجامدرابێ‌و دادپەروەری‌و سەروەری قانون‌و نیزام لەسەروو هەمووانە بێت. دەسەڵاتی سیاسی لەڕێی هەڵبژاردنێکی ئازادەوە، ڕاستەوخۆ لەلایەن خەڵکەوە دیاریکرابێ، سوڵتەکانی "تەشریعی و تەنفیزی و قەزائی" سەربەخۆبن‌و دەست نەخرێتە کاروباریانەوە. کۆمەڵی دیموکرات؛ کۆمەڵی هوشیارو بەرپرسیارو ئازادە. نەک کۆمەڵێ، کە تائەمڕۆیش عەقڵی هۆزو تیرەو تایفەگەری بەسەردا زاڵە، لەکۆمەڵێکدا سێ بەشی نەخوێندەواربێ، هوشیاریش لەدواوەیە، هوشیاری ڕووناکبیرییە، ڕووناکبیریش لای ئێمە تازە لەسەرەتای سەرەتادایە. تاعەقڵی ڕەخنەگریش نەبێت گۆڕان دروستنابێت .

دەیانویست؛

لەدۆڵی جافەتییەوە ئێران بڕوخێنن..

بۆردوومانو تۆپباران وچانیان بۆ نەبوو، چەند ساڵ بوو نێوان کۆماری ئیسلامی ئێرانو سەرکردایەتی ی. ن، ک تێکچووبوو، ڕێگەی پەیوەندی و هاتوچۆ نەمابوو، ئۆپۆزسیۆنی ئێران بەکوردو فارسو ئازەریو بەجیاوازی بیروڕای سیاسییانەوە لەگوندەکانو ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستاندا کاری حزبیو سیاسی خۆیان ئەکرد .

بۆ خۆم چەند جارێک سەردانی ئەو گروپانەم لە "هەڵەدن" و گوندەکانی تری دۆڵی جافەتیدا کرد. ئەم گروپانە بەشی زۆریان چەپ و مارکسی بوون. زۆر داخراوو دۆگماو وشک بوون. لەدەروێشەکانی تەریقەت ئەچوون. هەر دەکەسو زیاترو تەنانەت کەمتریش بەناوی حزبێکەوە خۆیان ئەناساند. نەیانتوانیبوو لەو ئێرانە پان و پۆڕو گەورەیەدا جێیەکیان هەبێتو هەڵاتبوونو هاتبوونە لای ئێمە. ئەمانە بەشی هەرە زۆریان بەو وەزعە ناهەموارەیشەوە وەختێ قسەت لەگەڵدا ئەکردنو پرسیاری ئەوەت لێئەکردن، کە ئایا کورد بۆی هەیە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دابمەزرێنێ؟! لەوەڵامدا ڕەفزیان ئەکردو لەخود موختارییەک زیاتریان بەمیللەتەکەمان ڕەوا نەئەبینی! من لەو کاتەدا ئۆپۆزسیۆنی ئێرانیم وەک ئاردی ناو دڕک ئەهاتە پێشچاو. بووبوون بەهەزار پارچەوە، ئەیانویست لەدۆڵی جافەتییەوە کۆماری ئیسلامی ئێران بڕوخێنن .!

بەڕاستی ئەوەی لەولاتی خۆیدا تێنەکۆشێتو خەڵکی خۆی لەدەور نەبێت، وەک چەندو چوون، نەگەشە ئەکاتو نەئەیشتوانی پەیامی خۆی سەربخات. دیارە من ئەزانم کوردستان ولاتی هەموو کوردێکە، بەلام کوردی کوردستانی عێراق ئەبی لێرەوە بجوولێو هەروەها کوردی بەشەکانی تر. ئەمە لەکاتێکیشدا، لەنێوان تەواوی حزبەکانی کوردستاندا هیچ جۆرە ستراتیجییەتێکی هاوبەشو یەکگرتوو تائێستە بۆ سەربەخۆیی کوردستان لەئارادا نییەو حزبی هەر پارچەیەک ستراتیجییەتی خۆی لەڕوخانی ئەو ڕژێمانەدا ئەبینێتەوە، کە کوردستانیان پێوە لکێنراوەو لەباشترین حاڵەتدا دروشمی فیدراڵییان لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەدا کردووە بەئامانج .

پێموایە لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، ئەگەر گریمانەیەک بکەینو بڵێین هێزی پێشمەرگەی کوردستانی عێراق لەمەهابادو سابلاخ بوونایە لەوێوە خەباتیان بۆ ئەمدیو بکردایە، من دڵنیام ئەو هێزە نەگەشەی ئەکردو نەئەیتوانی ئەوەی لەدوای هەرەس کردی بیکردایە.!

فینقییەکانو بابلییەکان تیاچوون،
بەڵام ئێمە نا..

بەر لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٦)و بەرلەوەی خۆم داوا بکەم، یەکەم کەس، کە باسی چوونەدەرەوەی منی بۆ ئەوروپا کرد، کاک عومەر عەبدوڵڵا بوو. پێیوتم: (لەگەڵ مام جەلال-یشدا قسەم کردووە، بەڕاستی ئێمە نامانەوێ تۆ لێرە تیابچیتو لەپرێکدا بەرگوللە تۆپێ یان پارچە بۆمبایەک بکەویتو لەکیسمان بچیت!). ئەمە قسەی کاک عومەر بوو .

منیش پێموت: (سوپاستان ئەکەم. خۆتان ئەزانن، من ئەوەی بیرم لێنەکردبۆوە چوونە دەرەوە بوو بۆ ئەوروپا، مادام ئەمە پێشنیازی ئێوەیە. منیش بەلامەوە باشە).

ئەوەی ڕاستیبێ هەروایش بوو، من بیرم لەچوونە دەرەوەی کوردستان نەکردبۆوە، هۆی گەورەیش، دایکمو نەسرینو منداڵەکان بوون. جگە لەوەیش ڕۆژێ لەڕۆژان کە لەسلێمانیش بووم، ئەوە خولیام نەبووەو هاوڕێ نزیکەکانم ئەمە ئەزانن، بەلام ئەوەتا ئیستە خەریکە ئەم دەرفەتە ئەڕەخسێ و منیش بۆ خۆم پێمخۆشەو لەئیستەیشەوە ئەبێ بیر لەوە بکەمەوە ژیانی دایکم و نەسرین و منداڵەکان چۆن بێو خۆیشم، کە ڕۆیشتم بەرنامەم چی بێ لەدەرەوەی وڵات.

ئەوەی بەر لەهەموو شتێ کردم، ناردم ئەو کۆنە پەساپۆرتەی لەسلێمانی لەماڵەوە هەڵمگرتبوو، بۆیان هێنام. ئەگەرچی حەوت ساڵ ئەبوو دەرهاتبوو، بەلام وتم بوونی لەنەبوونی باشترە.

هەر لەو ڕۆژانەدا بوو، هەواڵێ بڵاوبۆوە، کە خەریکە نێوان کۆماری ئیسلامی ئێرانی و یەکێتیی نیشتمانیی باش ئەبێتەوە، ئیتر ڕێگەکان ئەکرێنەوە. دوای ماوەیەک، مام جەلال برووسکەیەکی بۆناردبووم کە بەپەلە بچم بۆلای. چووم بۆ یاخسەمەرو بینیم، پێیوتم: (ئەوان حەزئەکەن بچمە دەرەوەی وڵاتو بگەمە ئەوروپا، چونکە بارودۆخەکە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپتر ئەبێ و نایشیانەوێ تیابچم. هەر لەو دانیشتنەدا بۆیەکەمجار لەدەمی مام جەلال-م بیست، کە حکومەت گازی کیمیاوی هەیەو لەوانەیشە ئەگەر زۆری بۆ بێت بەکاریبهێنێ). هەروەها وتی: (وا لەگەڵ ئێرانیشدا پێکدێینەوە، لەبەر ئەوە لەئێستەوە خۆت ئامادەبکە بۆ ئەوەی لەگەڵ برادەراندا بڕۆیت). هەروەها وتی: (خەمی ماڵ و منداڵیشت نەبێ، ناهێڵین پەکیان بکەوێ و ئەوەیش بەئەرکی سەرشانی خۆمان ئەزانین).

دوای ئەم دیدارەی مام جەلال؛ ئیتر بەتەواوی دڵنیابووم کە وڵات بەجێئەهێڵم. هەر لەویادەیشدا سەرم لەکاک نەوشیروان-دا، بەڵام باری تەندروستی باش نەبوو. ئازاری پشتی لەزیادبوندابوو.

کەوتینە پاییزەوە. لەپڕ ڕۆژێک وتیان ئەبێ بچیتە "چالاوە"و لەوێوە بەڕێ ئەکەون. یەکە یەکە خواحافیزیم لەبرادەرەکانم کرد، بەڕاستی ئەوانیش هەموو پێیانخۆش بوو بگەمە ئەوروپا. ئەو شتومەکانەی هەمبوون دابەشمکردو دەمانچەکەمدا بە کاک "ئازاد چالاک"و ئیتر خۆم و جانتایەکی بچووک، کە خاولی و کراسێک و تاقمی تەراش و دیوانەکانی تیدا بوون، ڕۆیشتم و ڕوومکردە چالاوەی بناری ژیلوان.

بۆ سبەینێ برادەرەکانی تریش پەیدا بوون، "کاک نەوشیروان و د. فوئاد مەعسوم و د. کەمال خۆشناو و کاک عومەر عەبدوڵلاو د. خەسرەو خاڵ و من"یش لەگەڵدا .

کاک "جەبار فەرمان"یش هاتبوو بۆ خواحافیزی. کاک (عەبدولڕەحیم)ی سەرتیپ-یشمان لەگەڵدا بوو، چوار پێنج وڵاخیشیان ئامادەکردبوو، سەر لەبەیانییەکی تۆزێ درەنگ بەڕێکەوتین، چوار کەسمان تادوا قۆناغ لەوڵاخەکان دانەبەزین، "د. فوئاد و د. کەمال و د. خەسرەو و من". لەڕاستیدا دەمزانی کاک "جەبار فەرمان" هەر لەوێوە خواحافیزیی ئەکاتو ئەگەڕێتەوە. بەڵام بەپێ لەگەڵماندا هات. لەو سەردەمەدا کاک جەبار لەگوڕی لەشساغی و تەندروستییدا

بوو. هیچ زیادی پێوەنانێم، ئەگەر بڵێم وەک ئاسک و لەپێشی پێشەوە بەو کەژو کێوانەدا هەڵئەگەڕاو هەرچی ماندووبوونیشبێ پێوەی دیارنەبوو .

کاک عومەر عەبدوڵلایش بەهەمانشێوە، تادوا قۆناغ هەر بەپێ ڕۆیشت، کاک نەوشیروان ئەگەرچی پشتیشی باش نەبوو.. بەڵام وتی: (جارێ بەپێ ئەڕۆم و چەندی توانی ڕۆیشت و لەدواییدا سواری وڵاغ بوو". دیارە کاک "عەبدولڕەحیم"یش لەپێشەوە لەگەڵ کاک جەبارو کاک عومەردا بوو.

هەندێ لەم کێوانەی ئێمە، لەدوورەوە یان لەبنارەوە تەماشامان کردوون، سەرمان بۆ بەرزکردوونەتەوەو تەنها ڕووکاریانمان بینیوە، وەختێ ئەچیتە ناو هەناویانەوە، ئەوسا تێئەگەیشتی، کە نەخێر ئەو بینینانە چاو خەڵەتێن بوون و ئەم "ژیلوانە"، چەندین ژیلوانی تری تێدایە. نەک هەزار بەهەزارێک، سەدان هەزار بە هەزارو هەڵەمووتیان تێدایە. سەدان دۆڵو نشێو و لێرەوار و پلەپلەی بەردو ماهیو ڕەوەزی عاسی و سەختیان لەناودایە. وەختێ ئەو دیمەنانە ئەبینی، ئەگەیتە ئەو ڕاستییەی کە جوگرافییای کوردستان و ئەم کێوو دەربەندو ئەشکەوت و کەوێڵ و گەوەو خەرەندانە بوون، نەیانهێشتووە کورد بفەوتێو داگیرکەرانیان والێکردووە بڕستیان لەبەر ببڕێ و پشتیان بشکێنێ و نەتوانن تاسەر بەشوێنمانەوە بن و بەناچاری وازبێنن و پاشەکشە بکەن .

چەندین شارستانییەتی گەورەی وەک فینیقیەکان و بابلییەکان لەبەر ئەوەی نیشتمانیان کەوتبووە پێدەشتو کەنار دەریاکان، تەفروتوناکرانو لەناوچوون و توانەوەو نەمان .

ئەو کاتەی بەم چیایانەدا ئەڕۆیشتین ئەو بیرۆکەیەی خۆم لەدڵی خۆمدا تاووتوێ ئەکرد. جاربەجاریش کە من و د. خەسرەو، وڵاخەکانمان ئەکەوتنە لای یەکەوە، ئیتر باسی سلەیمانی جارانمان ئەکرد، نوکتە خۆشەکانی "ڕەشۆڵ و خاڵە ڕەجەب"مان بۆ یەکتر ئەگێڕایەوە. ڕێگەیش درێژو هەر نەئەبڕایەوە. لەبەر مەترسی تۆپبارانی ئێرانیش پەلەمان ئەکردو نەئەبوو لابدەین .

بوو بەئێوارەو زەردەپەڕو سروشت بەسەدان شیعری زێڕینی لەسەر گەڵای دارو لەسەر بەردو لەلاپاڵە نسرم و لەگوێ جۆگەلە ئاوەکاندا ئەنووسی، شەو داهات و کێوەکان سامناکتربوون، ئەستێرەی ئاسمان جوانتر و گەشتر بوون و هەر ئەوەنەبوو جریوەیان نەڕژێننە بەرپێ و سەرە ڕێمان. کە بێدەنگیش

ئەبووین، پرمەی ولاخ و زیکەزیکی سیسرکی دەوروبەر تەنها دەنگ بوون. لەگەڵ خۆمدا ئەدوام: "لەکوێوە بۆ کوێ؟"!

ئەوەی بیرم لێنەکردبۆوە ئەم سەفەرە بوو. چارەنووس، وەک ئەودیوی ئەم کێوانە نادیارە. ئێستا بچووکترین منداڵم (هانا)یەو حەوت ساڵەو ئەبێ ئێستا لەگەڵ دایکی و نەنکی و (هەڵبەست) و (هەڵۆ) و (هێژا)-دا، لەچ کونێکدا خۆیان شاردبێتەوە بۆ ئەوەی بەردەستی جانەوەرەکانی بەعس نەکەون .

هەر ئەو شەوەو بەدەم ڕێوە، لەناو دڵما دوو کورتە شیعرم نووسی. من بۆ خۆم زۆجار وامکردووەو ئەو کورتە شیعرانەم لەدەفتەری خەیاڵما نووسیوە، هەر لەو دەفتەرەیشدا، چەندینجار ڕەشنووسم سڕیوەتەوەو، دەستکاریم کردوون، تادڵنیابووم لێیانو دواتر بەئاگاییەوە خستوومنەتە سەر کاغەز.

ئەو شەوە مانگەشەو نەبوو، بەڵام ئەستێرەکان وەک لەسەر لوتکەکان دانیشتبن وابوو. ئەستێرە تاک تاک، ئەستێرە بەهێشوو، ئەستێرە لەکەژاوەدا، ئەستێرەی بە وەنەوز، دوو ئەستێرەی عاشق سەریان ناوە بەسەری یەکەوەو چرپە چرپیانە. هەر هەموویشیان بەرگی زیوینیان پۆشیوە. ئای خودایە لەم وڵاتە، چەند سیحراویو جوانەو چەندیش کڵۆڵە! هەورازی کوورەو بەپشتا بۆدواوەو سەرەولێژیو بەدەمدا بۆ پێشەوەو توندتوند خۆت بگرە .

لەگەڵ خۆمدا ئەدوام "ئەبێ لەکام وڵاتی ئەوروپادا بگیرسێمەوە؟"!

بەخەیاڵ ئەو هۆڵانەم ئەهێنایە پێش چاوم، کە کۆڕی شیعرخوێندنەوەیان تێدا ئەبەستم! تۆبڵێی بەشێک لەو شیعرانەم تەرجەمەی ئەو زمانە زیندووانە بکرێن؟! خۆزگە بوو، خۆزگەو خەوم پێوە ئەبینی! ئەم کۆمەڵەی وائێستە پێکەوەین، هەر یەکەو بۆ کارێک ڕوویکردۆتە دەرێ .

کاک نەوشیروان بۆ چارەسەری بڕبڕەکانی پشتی، د. فوئاد و د. کەمال بەئێشی یەکێتی لەئەوروپاو کاک عومەر عەبدوڵلا هەتا سوریاو د. خەسرەو خاڵ-یش ئەبێتە نوێنەری ڕەسمی یەکێتی نیشتمانیو لەشام ئەمێنێتەوە. منیش بەرەو ئەوروپا. کاک جەبار و کاک "عەبدولڕەحیم"یش هەتا ناو ڕۆژهەلاتی کوردستان و ئەگەڕێنەوە .

لە ژیلوانەوە بەرەو هەواری شێخ محەمەدو لەوێشەوە بەرەو زنجیرە چیای سەفرەو زەروون و ئینجا بەرەو بەرگورد و لەوێشەوە شۆڕئەبینەوە بەرەو

گوندی زەردە–ی ناو ڕۆژهەلاتی کوردستان‌و لەوێشەوە ئیتر بەئۆتۆمبێل بەرەو "سەردەشت".

زنجیرە چیای سەفرەو زەروون، تووناوتوون و گەوەگەوەیەکە بڕانەوەی بۆ نییە، بەدەیان دەراڵ و کەوێل و هەموویشیان ئەوەندە لەیەک ئەچن ئەڵێی سروشت لەبەریەک کۆپیکردوونەتەوە.

قاچم دەستیکردەوە بەسووتانەوە، بۆ یەکەمجار ئەم نەخۆشییەم لەسەرەتای (١٩٨٤)دا دیارییدا، نێو پەنجەکانی قاچم و بەری پێم‌و تانزیک پووزم ئەسووتێنەوە، وەک ئەوەی تەواو نزیکی گڕێکی بەتین بن. هەر ئەوکاتە، چووم بۆ بەغداو لای دکتۆر دوای پشکنین پێیوتم: (ئەم نەخۆشییە لەکەمی ڤیتامین .B Kدروستدەبێت)، لەجەنگی دووەمی جیهاندا بەشی هەرە زۆری ئەو سەربازە دیلانەی لەئۆردوگاکاندا بوون، لەبەر خراپی خواردەمەنی، تووشی ئەبوون. بادە خواردنەوەیش هۆیەکی ترە بۆ تووش بوون بەم نەخۆشییە، ئیتر لەوکاتەوە بۆماوەی نزیکەی دەساڵ وازم لەخواردنەوە هێنا. چاک نەبووم، بەڵام نەخۆشییەکە لەو سنوورەی خۆیدا وەستا.

بەدرێژایی ئەو شەوە بەردەوام ئەڕۆیشتین، پشوودان نەبوو. دیسانەوە ڕۆژبۆوەو تا ئێوارەی ئەو ڕۆژەیش بەهەمانشێوە. کاک جەبار و کاک عومەر و کاک عەبدولڕەحیم، لەهەمان گوڕوتینی خۆیاندا بوون و سەرقافڵەبوون. گەیشتینە "بەرگورد" و لە شۆڕبوونەوەدا لەبەرئەوەی هەر هەمووی تاشە بەردی گەورە گەورەبوون و خزو لەهەندێ شوێنیشدا بەردەکان، قلیش بوون و بۆ ڕەوتی ولاخەکان نالەباربوون، ئەبوو دابەزین و جڵەوی ولاخەکان بگرین و ئینجا بەرەو دامێن و ئاوایی "زەردە" شۆڕبینەوە. وەختێ دابەزیم، گۆت بووبووم، هەرچۆنێک بوو هەستامە سەرپێ و پەنجا مەترێکی تر بڕمکرد، بەڵام ئیتر ئەمجارە کەوتم و هاوارم لە برادەرەکانم کرد بێن بەلامەوە، پێموایە ئەوکاتە هەر بیست دەقیقەیەکمان مابوو بگەینە شوێنی مەبەست. ئەوان زۆر لەپێش منەوە بوون، دووسێ جار لەسەرم ڕاوەستان و من جووڵەم زۆر کەمبوو. ئیتر ئەوانیش بێزاربوون و گوێم لێبوو کاک نەوشیروان وتی: "کوڕە دە وازی لێبێنن، دوایی خۆی بابێتە خوارەوە" ئەوان لەچاو ونبوون، بەڵام دوای چەند دەقیقەیەک، دوو کوڕی گەنج پەیدابوون‌و یەکێکیان جڵەوی ولاخەکەی ڕاکێشاو ئەویتریشیان منی کردە کۆڵ‌و هەتا خوارەوە بردمی.

لەم سالانەی دواییدا ڕۆژێکیان پیاوێک هات بۆلام، وتی: "من ئەو کەسەم کە لەبەرگورد، تۆم کردە کوڵ!" پێمخۆش بوو بینیمەوە، وەک وەفایەکیش خزمەتێکی بچکۆلەی بکەم.

ئاوایی زەردە؛ گوندێکی گەورەی بەداروبارو دڵگیرو جوان بوو، لەوێ پشوویەکی باشماندا، دنیا تەواو ساردبووبوو، لەبیرمە کاک جەبار بەچیلکەو چەوێڵ و کوتەرەدار ئاگرێکی گەورەی کردەوە، گەرممان بۆوە. هەر لەوێش شتێکمان بەسەرپێوە خواردو بووژاینەوە. پێموایە هەر کاک جەبار بوو چوو بۆ ئاوایی، کە هاتەوە دوو ئۆتۆمبێلی لەگەڵدا بوو، بۆ ئەوەی بمانبات بۆ "سەردەشت".

ئیتر هەر لەوێ خواحافیزیمان لەکاک جەبار و کاک عەبدولڕەحیم کردوو بەرەو سەردەشت کەوتینە ڕێ.

لەڕێگە د. خەسرەو باسی بەجێمانەکەی منی ئەکردو نوکتەی لەسەر دورست ئەکردم و ئەیوت: "بابە خۆ ئەمە شیعر نییە، ئەمە بەرگوردە، خۆ ئەگەر فریات نەکەوتینایە گورگ ئەیخواردی!" منیش بێدەنگ و کڕبووبووم. گەیشتینە شاری "سەردەشت."

بەبینینی هەندێ خانووی جوان و شەقام و دوکان و بازاڕ دڵم زیاتر کرایەوە، ئەو شەوە لەسەردەشت لەئوتێلێکی ئاسایی ماینەوە، بەڵام تابەیانیی دەیان جار لەخەو داچڵەکیوم، ئەو باریکەڕێ و هەزار بەهەزارانەم بیر ئەکەوتەوە، کە بەو تاریکە شەوە پێیاندا ڕۆیشتبووین، ئەو پلەو ملانەی کە تەنها سەرسمدانی وڵاخێ، بەسە بۆ ئەوەی هەڵدێریتو لەو هەڵەمووتانەوە بۆ ئەو دۆڵە قولانە گلۆربیتەوەو ونجڕونجڕ بیت!

بۆ بەیانی لەسەردەشت نانێکی باشمان خواردو سێ تاکسیمان گرت و بەرەو "تاران" کەوتینەڕێ .

تاکسییەکان تازەبوون‌و پێموایە لەجۆری مەزدەی ئێرانی بوون. هەر دوو کەس و ئوتومبیلێک، جێگەمان ڕەحەت بوو. ئەوە دووەمجارم بوو بچم بۆ تارانی پایتەخت. یەکەمجاریان لەسەردەمی شادا بوو، سالی (١٩٧٤) "، جەلالی میرزا کەریم و ئەنوەر قادر محەمەد و عەبدوللا عەباس و من ."

لە (خانە)وە بە ئۆتۆبوسە گەورەکان چووین، شەو بەڕێوەبووین. جەلالی میرزا کەریم لەلای پەنجەرەکەوەو منیش لەتەنیشتییەوە دانیشتبووم، لەدوای ئێمەیشەوە، ئەنوەر قادر محەمەد و عەبدوللا عەباس. لەبیرمە بەجەلال-م وت: (حەز ئەکەم کە گەیشتینە هەر شارێ ئاگادارم بکەیت، بۆ ئەوەی بزانم ئەو شارە ناوی چییە؟!). جەلال-یش هەر یەکەم سەفەری بوو تاران ببینێ، دوایئەوەی چاوم چووە خەوو نوستم. لەپڕێکدا، جەلال ڕایوەشاندم و خەبەری کردمەوەو وتی: هەستە.. هەستە وا گەیشتینە "یەخچال"! وتومەز کاک جەلال ئەو ڕیکلامە گەورانەی لەقەراغ شار بۆ بانگەشەی بازرگانی و "سەللاجە" دانراون، ئەوەی خوێندۆتەوەو "یەخچال" بەشار تێگەیشتووە!. ئیتر خوادای بۆ پێکەنین و گالتەو سەرکردنە سەر جەلال!. تا کاک جەلال-یش لەژیاندا بوو، وەختێ بکەوتینایەتە قسەکردن و یادی ئەو سەفەرەمان بکردایەتەوە، باسی شاری "یەخچال"یشمان ئەکرد!

من و د. خەسرەو؛ ناو تاکسی و کابرای شۆفێرمان لەدووکەڵی جگەرەدا قانگدابوو، شەوبوو گەیشتینە تاران، بەڵام ئەم "تاران"ە لەکوێ و ئەوەی حەفتاو چوار لەکوێ، کە من دیبووم. ئەرزو ئاسمان جیاوازبوون. تاران–ی ئەوسا لەکەژاوەیەکی ڕەنگین و بە بریقوباق و دەمبەپێکەنین ئەچوو، بەڵام ئەم تارانەیان لەژنێکی سەرتاپا ڕەشپۆش و غەمگین و پرسەداری ئەکرد .!

دارو دیوارو دنیا، هەر هەمووی بەوێنەی "ئیمام خومەینی" داپۆشرابوو. پێکەنین کوژرابوو! ژنان هەر نیوەی دەم و چاویان بەدەرەوە بوو، ڕەشیان ئەکردەوە. ئەو شەقام و گۆڕەپانە جوانانەی کە ئەوسا ئەتوت ئاوێنەن، ئێستە پیس و پۆخڵ و دەغەزارو پشتگوێ خراو. جۆگەلە ئاوی تەنیشت شەقامە گەورەکان وشکیان کردبوو، پڕبووبوون لەگەڵاو خۆڵ و کیسە نایلۆنی فڕێدراو .

پیاوەکان، زۆربەی هەرە زۆریان ڕیشن و گرژ و مۆن، بەڕۆژیش ئەو پیکابانەی، کە پاسدارو چەکداریان تێدا بوو. هەروەها ئەو پیکابانەی تایبەتبوون بەژنانی سەر بەڕژێم لەسەرخۆ بەشەقامەکاندا ئەسووڕانەوەو هەر چاوێکیان کردبوو بەچوارو بۆ نێچیری خۆیان ئەگەڕان .

پیاوێک، ئەو بەرگەی لەبەردا نەبوایە کەئەمان ئەیانەوێ، یان ئەو ژنەی مانتۆی لەبەردانەبێ، قژی تۆزێ دەرکەوتبێ، یا بەلەک و پووزی بەدەرەوە بوایە، ئەیانگرتن‌و سووکایەتییان پێئەکردن و هەندێجار ئەشیانبردن .

تارانەکەی حەفتاو چوار؛ سەرتاپای لە قورگیرابوو، ئێمە لەو سەفەرەی یەکەمدا چووینە هاوینە هەواری "شەمیران"ی باکووری تاران، لەبەیانییەوە تائێوارە هەر چوارمان لەسەر تەختەبەندی فەرشکراوی ناو ئەو جۆگەلە ڕوونانەی بەژێرماندا ئەڕۆیشتن، دانیشتبووین و چوار دەوریشمان دار چنارو کالیپتۆس و سەروو سنەوبەربوون. نایابترین خواردن و خواردنەوە لەسەر خوانی بەردەم‌و چاوێکیشمان هەر لەو شۆڕەژن و فریشتەو کچۆڵە ناسک و جوانانە بوو، کە لەسەر تەختەبەندی خۆیان گۆرانییان ئەوت و سەمایان ئەکردو تاریان لێئەداو لەناو خۆیاندا بەزم و ڕەزمیانبوو .

چاوێکمان هەر لەلای ئەو عاشقانە بوو، کەدەست لەملان و مەست و بێدەربەست، ڕایان ئەبواردو تازەترین جۆری کراس و پانتۆڵی ئەو سەردەمەیان لەبەردابوو. وا ئێستەیش "تاران" لەبێوەژنێکی جلوبەرگ قەترانیی پرسەدار ئەچێ و نەسوورە گوڵی ناو قژی و نەپاوپووزی سپی و جوانی و نەتارەکەی دەستی

و نەسنگ و بەرۆکی کراوەی، هەر هەمووی چۆتە ناو تاریکستانێکەوە ئەو سەری دیارنەبێ .!

ئازادی مرۆڤ و حەزی مرۆڤ و مافی مرۆڤ، ئاوێنەی وردوخاشی ئەو سەر شەقامانەن. ژن بووە بە قەلەڕەشکەو پیاو بووە بەسابرێنو شاریش بووە بەکاولاشی پەپوو. لە هەموو سەرسووچێکداو لەسیلەی هەموو بازاڕێکدا نهێن گرێ وەستاوەو چاو بەچواردەوردا ئەگێڕێ. سانسۆری دەولەت، پاسەوانی سەر هەموو شتێکە، لەقژتەوە بۆ پێلاوەکانت، سانسۆر لەسەر دەنگت، لەسەر ڕەنگت، لەسەر حەزت. لەسەر خۆراکت، لەناو جێگای نوستنت و لەسەر خەونەکانیشت. تاران لەڕیشدا نوقمبووەو لەناو جبەو مانتۆدا خنکاوە.!

لە ئوتێل "ایران شهر" دابەزین، هەریەکەو ژووری خۆی، درەنگانێ، هەریەکەم شەو لەوێ، ئەو شیعرانەی خەیاڵ لەشاخو کێو لەزەیندا نووسیبوونی، لێرە خستمنە سەرکاغەز. نزیکەی مانگێک لەتاران ماینەوە بۆ ئەوەی کاروباری دەرچوونمان لەئێران بۆ جێبەجێبکرێ. من ئەوەندە دەربەست نەبووم چەند بمێنمەوە. بەلام کاک نەوشیروان پشتی خراپتر بووبوو، ناهەقی نەبوو پەلە بکات بۆ ئەوەی ڕۆژێ زووتر بگاتە سوریاو خۆی نیشانی دکتۆری پسپۆڕ بدات، بەلام ئێتر ئێمە چیمان پێئەکرا؟! جگەلەوەی چاوەڕوان بین .

لەتاران کوردی تریشی زۆر لێبوو، لەئوتێلێکی تر چاوم بە کاک "نەوزاد حەمە سەعید عەنبەر" کەوت، ئەویش چاوەڕێی ئەوەبوو کاروباری چوونە درەوەی لەئێران جێبەجێبێ. کاک نەوزاد؛ هاوڕێی مێرد منداڵی و سەردەمی قوتابخانەی فەیسەلیەم بوو، یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی هەموو جارێ کە ئەیویست کاغەز بۆ دڵدارەکەی بنووسێ، ئەهات بۆلای من و منیش چۆنم بویستایە بەو جۆرە بۆم ئەڕازاندەوە. لەئوتێلەکەی خۆی پێکەوە دانیشتین، ئێتر باس هەر باسی ئەوە بوو کەی لەتاران ڕزگارمان ئەبێ، بیرمە یەکێک لێی پرسی: (ئەرێ کاک نەوزاد تۆ لەوەوبەر سەفەرت کردووە؟ سواربوونی تەیارە چۆنە؟ خەتەر نییە؟). ئەویش وتی: (نا هیچ خەتەر نییە، هەر ئەوەندەی کەوتە هەوای خۆیەوە لەنجەی بۆ ناکات).

ئەو مانگەی لەتاران بووم، ڕۆژانە لەگەڵ د. خەسرەودا بەیانیان تۆزێ زوو ئەچووینە دەرەوەو لەبەری ئەوبەر ئوتێلەکەوە، شوێنی جگەر فرۆشێ هەبوو. د. خەسرەو ئەیوت: (بابچین بۆلای ئەحەی گوڵە!). لەوێ نانمان ئەخواردو ئینجا ئەچووین بۆ پیاسەی سەرشەقامەکان. ئەچووین بۆ بەردەمی کتێبخانە

گەورەکان و ناونیشانی ئەو کتێبانەم ئەخوێندەوە کە لەناو جامخانەکاندا دانرابوون. ئای ئەوە چیرۆکەکانی "چیخۆف"ە و کراون بە فارسی. ئەوە جەنگو ئاشتییەکەی "تۆلستۆی"یە. ئای.. ئەوە شیعرەکانی "گارسیا لۆرکا"یە، بەلام زۆر لەبەر دلم گران و خەفەتم ئەخوارد کە فارسی نازانم و ناتوانم بیانکڕم و بیانخوێنمەوە. بزووتنەوەی وەرگێڕان، لەهەموو زمانەکانی دنیاوە بۆ فارسی و لەگشت بوارەکانی ڕووناکبیریو ئەدەبو زانستدا، لەئێراندا هەر لەکۆنەوە، بەهێزو گەورە بووە.

کتێبی وا هەیە هەر دوای مانگێک وەردەگێڕدرێو ئەکەوێتە کتێبخانەکانەوە، ئەتوانم بلێم بەتەنها ئێران خۆی زۆر زیاتر، لەهەموو ولاتە عەرەبییەکان بەسەریەکەوە، بایەخی بەبزووتنەوەی وەرگێڕانداوە. بەکورتیو بۆ نموونە: ئەگەر لەسەرجەمی بەرهەمەکانی نووسەرێکی گەورەی دنیادا، بابلێین دوو کتێبی گرابێ بەعەرەبی، ئەوا بۆ فارسی لەشەش کتێبی کەمتر نەکراون.

ئەو پەساپۆرتە کۆنەی لەگەل خۆمدا هێنابوومو هیچ هیوایەکم پێی نەبوو، لەپڕ بوو بەمایەی دلخۆشیم و لەناو هەموویاندا من یەکەم کەس بووم کەمۆری چوونە دەرەوەم لەئێران وەرگرتو دایان لەلاپەڕەی پیرە پەساپۆرتو ئیتر هیچم نەما، ئەوەنەبێ بلیتی فڕۆکە بۆ شام ببڕمو تاران بەجێبهێلم. دوای دوو سێ ڕۆژ، ئەوەیش جێبەجێکراو کاتی فڕینی فڕۆکەم دیاریکراو چەند ناسیاوو برادەرێک بۆ بەڕێکردنم لەگەلمدا هاتنو ئەمجارە جانتاکەم گەورەتر ببوو، تاکسیەکمان گرت و بەرەو فڕۆکەخانەی نێو دەولەتی تاران بەڕێکەوتین.

لەفڕۆکەخانەیش بێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک کارەکان مەیسەر بوون، گەیشتمە دوا کۆنترۆلی پەساپۆرتو مۆری لێدراو خۆمکرد بەوەدیوداو ئینجا دەستم بۆ برادەرەکانم بەرزکردەوەو خواحافیزیم لێکردن، ئەوسا لەگەل گەشتیارەکانی تردا بەرەو پلیکانەی فڕۆکەکە ڕۆیشتم، ئەمە دووەمجارمە سواری فڕۆکەببم.

یەکەمجار لەئەستەموولەوە بۆ بۆخارست و وا ئەمجارەیش لەفڕۆکەیەکی زۆر گەورەتردا بەرەو شام ئەڕۆم. وەختێکیش فڕۆکە بەرزبۆوە، بۆ من جێی سەرسامبوون بوو، بەجارێ هەرچی لەو تەیارەیەدا بوو بەیەک دەنگ کەوتنە "سەلاوات لێدان" و "یاعەلی و یاعەلی". دوای ئەوەیش هەموویان بەگەرمی کەوتنە چەپلە لێدان. زۆربەی هەرە زۆری سەرنشینەکانی ئەم فڕۆکەیە شیعە بوون و بەنیازی زیارەتکردنی ئارامگەی "سەیدە زەینەب" ئەچوون بۆ شام.

لەکاتی دیاریکراودا گەیشتینە ناو ئاسمانی فڕۆکەخانەی شام، دوای نیشتنەوە بەهەمان دەستووری وەختی فڕین، سەرنشینەکان کەوتنەوە سەڵاوات و چەپڵەلێدان.

دوای پشکنین و کۆنترۆڵی پەساپۆرت، وەختێ چوومە دەرەوە کاک "عەبدولڕەزاق کۆیی" و چەند برادەرێکی تر هاتبوون بەپیرمەوە، سوپاسمکردن و پێکەوە چووین بۆ ئەو ئوتێلەی کە پێشتر ژوورێکیان بۆ لێگرتبووم. ئەو شەوە نەچوومە دەرەوەو حەمامێکی باشم کردو لێی نووستم .

بۆ سبەی، کە لە خەو هەستام پەردەی پەنجەرەکەم لاداو تەماشای دەرەوەمکرد. یەکەمجار بوو شام ببینم، تازە جووڵە کەوتبووە سەر شەقامەکان و دوکان و کۆگاکان ئەکرانەوە.

سالّی تازەی (١٩٨٧) نزیک کەوتبۆوە. خۆمگۆڕی و چوومە دەرەوە. لەو سەردەمەدا چەندین حزب و گروپی جیاجیای ئۆپۆزیسیۆنی کوردو عەرەبی عێراقی لەوێبوون.

لەنێوان شێرەکەی من و شێرەکەی سوریا
حەمە بچکۆلی بۆیاخچی لەدایکبوو!..

ئەو کاتەی لەتاران بووم کاک نەوشیروان و برادەران بڕیاری ئەوەیان دابوو، کە لەشام خانوویەک بگرین بەکرێ‌و هەموومان پێکەوە بین. پێموایە کاک عەبدولڕەزاق ئەوەی جێبەجێکردبوو .

بەهەرحاڵ ئەوەندەی نەخایاند یەک لەدوای یەک برادەران لە تارانەوە هاتن و گەیشتنە شام و خانوویەکی زۆرباشمان لەگەڕەکێکی خۆشی شامدا بەکرێگرت‌و چووینە ناوی. لەماڵیشەوە کارەکانمان لەناو خۆماندا دابەشکردبوو، واتە ئیشی ناوماڵ، من حاجەت شتنم بۆ خۆم هەڵبژاردبوو، بەڵام کەمجار لەماڵەوە نانمان ئەخوارد، زۆربەی جار یان داوەت ئەکراین یان هەریەکەو بۆخۆی لەدەرەوە نانی ئەخوارد، لەبەر ئەوە ئەرکێکی وام نەبوو. ئەمە جگە لەوەی کەمجار ڕێکئەکەوت هەموومان لەیەک وەختا لەماڵەوە بین .

جەژنی سەری ساڵی تازەی (١٩٨٧)مان لەو خانووەی شامدا کرد، هەر لەشام و لەسەرەتای گەیشتنمدا، دوای چەند ڕۆژێ، بۆ یەکەمجار لەوێ لەچاپخانەیەکدا کاک "عەدنان موفتی"م ناسی. کاک "جەلال حسەین"م ئەناسی. واتە لەو سەردەمەوە کە لەناو "کاژیک"دا بووم، ئەگەرچی من لەگەڵ ئەوداو پێکەوە کارمان نەئەکرد، بەڵام ئەمزانی کە ئەویش دوورو نزیک پەیوەندییەکی بەکاژیکەوە هەر هەیە. کاک جەلال دواتر چووە ناو "پاسۆک"ەوە. من ئەوەندە

ئاگاداری ئەو سەردەمەی نیم، بەلام ئاگام لەوەبوو کە زۆر زوو چووە شاخ و ناو شۆڕشی تازە. لەشام و لەماڵی خۆیان پێشوازییەکی گەرمی لێکردم .

کاک جەلال؛ پیاوێکی کورد پەروەرو دلسۆزو نەترس بوو، خەمخۆری تەبایی‌و ئاشتی‌و یەکێتی ڕیزەکانی گەلەکەی بوو، هەر لەو پێناوەیشدا بوو بەقوربانیی.

دوای گەیشتنی کاک نەوشیروان و برادەرەکانی تر بۆ شام، کاک "سامی عەبدولڕەحمان"، کە پێشتر لەقیادەی موەقەتەی پارتیدا بوو، دواتر جیابۆوەو حزبی "گەل"ی دروستکردو هەر بەوناوەیشەوە بەکوردی‌و عەرەبی ڕۆژنامەی دەرئەکردو هەندێ نووسەری لاو هاوکارییان ئەکرد. لەیەکێک لە چێشتخانە باشەکانی شام داوەتێکی گەورەی بۆ هەموومانکرد .

من؛ لەسەردەمی بەغداوە، ئەوکاتەی کە وەزیری کاروباری ژوورو بوو نەمدیبۆوە. ئەو ماوەیەی لەو خانوەدا پێکەوە بووین، من ئیتر ڕۆژانە بە تەنیا خۆم ئەچوومە دەرەوەو شەوان ئەگەڕامەوە. ئەوانیش خەریکی کاروباری خۆیان بوون. ئەوەی ڕاستیش بێ من زیاتر حەزم بەکۆڕو دانیشتنی نێو ئەدیبان و شاعیران ئەکرد. دوای سۆراخکردن وتیان ئەو شاعیرو ئەدیبانە، هاتوچۆی قاوەخانەی "هافانا" ئەکەن‌و لەوێ یەک ئەگرنەوە .

بۆیە ئیتر منیش ڕۆژانە لەبەیانیەوە ئەچوومە ئەو قاوەخانەیەو تانیوەڕۆیەکی درەنگ ئەمامەوە. کۆمەڵێ کتێبی تازەیشم کڕیبوو. هەموو ڕۆژێ خەریکی خوێندنەوەو ناوبەناویش نووسین بووم. هەر لەو چایخانەیە "عەلی ئەلجندی"و "نەزیە ئەبو عەفەش"و "بەیان ئەلسەفەوی"و کۆمەڵێ شاعیرو ئەدیبی ترم ناسی .

لەگەڵ "بەیان ئەلسەفەوی"دا بووینە دوو هاوڕێی نزیک. بەیان، نووسەری ئەدەبی منداڵان بوو، شیعریشی ئەنووسی. پیاوێکی کراوەو ڕووناکبیرو پێشکەوتووخوازبوو. دۆستی مەسەلەی کورد بوو، شۆڤێنی‌و دەمارگیرنەبوو. لەدواییشدا چەند جارێک لەگۆڤاری "ئەلعەرەبی" و "ئەلکوەیت"دا لەسەر شیعرەکانی منی نووسیی‌و تائێستەیش پەیوەندیمان بەردەوامە .

دوائەوەی کە لەگەڵ بەیاندا بووینە هاوڕێ‌و منی ناسی، ئیتر قسەی دڵای خۆی لائەکردم. بەیان پێشتر لەبەغدا بووبوو، ئەیزانی بەعس چییە؟! ئاگای لەو زوڵم و زۆرە بوو کە لەکورد کرابوو. هەر لە بەغدایش هونەرمەندی کوردی ناسراو "عەلی مەندەلاوی" ناسیبوو، بەیەکێک لەهاوڕێ نزیکەکانی خۆی لەقەڵەم ئەدا .

هەر لە قاوەخانەی هاڤانا، بۆ یەکەمجار "موزەفەر ئەلنواب"ی شاعیرم ناسی، دوو سێ جار لەگەڵ ئەدیبەکانی سوریادا لەماڵی "نزیە ئەبوعەش" دانیشتین. نەزیە؛ یەکێکە لەشاعیرە داهێنەرەکانی سوریا، دواتر ئەو پێشەکی بۆ بۆننامە "سفر الروائح" نووسیی. هەر لەقاوەخانەی "هاڤانا" چەندین ئەدیب و نووسەری فەلەستینیم ناسی و ڕۆژانە یەکترمان ئەبینی.

شام لەچاو تاراندا شارێکی بچووکە، بەڵام ئێسکی سووکە. من دڵم بەشام زۆرتر ئەکرێتەوە وەک لە تاران! ڕەنگە هۆی سەرەکی ئەوەبێ لەوێ هیچ کێشەیەکی زمانم نییە، ئەمە جگە لەوەی ئازادی تاک، تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی، سەربەستی ژن، بوونی یانەو شوێنەگشتییەکان، بەراورد نەکرا بەتارانی ڕەشپۆش. هاوینە هەوارەکانی دەوروبەری شام و قاسیونو زۆری شوێنی تر دڵگیرو جوانن. سوریا؛ وڵاتێکی هەژارە، داهاتی نەوتو گازو کانەکانی تری لەجێی نەبووانە. خەڵکی کەنداو تەنها بۆ ڕابواردن دێن بۆ سوریا .

سورییەکان خۆشیان ناوێن؛ لەناو شامیشدا "باب تۆما" مەڵبەندی گەورەی مەسیحییەکانە، من زۆرجار بۆ پیاسەکردن ئەچووم بۆ ئەوێ، دیارە هەر لە سەرەتای بینینی شامدا، چووم بۆ بازاڕی حەمیدییەو مزگەوتی ئەمەوی بەناوبانگ، هەروەها چووم بۆ سەرگۆڕی "سەلاحەددینی ئەیوبی" و سەریشم لەمەزاری "مەولانا خالیدی نەقشبەندی" دا، مەزارێکی کۆن و هەژارانە، هەروەکوو میللەتەکەیو دەربەدەری خۆی. زێوانەکەیشی بەهەمانشێوە پیاوێکی هەژارو کلۆڵ.

کوردەکانی سوریا دوای ئەوەی زانییان من لەشامم و لە قاوەخانەی "هاڤانا" دائەنیشم، ئەهاتن بۆلام. لەماڵی خۆیاندا میوانداریان ئەکردم. بیرمە یەکەم کۆڕی شیعر خوێندنەوەم لەماڵێکی گەورەدا بوو، پێموابوو لە"مساکن بەرزە" بوو. بیست سی کەسێ کۆبوونەوە. لە سوریادا ئازادی سیاسیو بیروڕا دەربڕینی جیاوازو کۆڕو کۆبوونەوەی گشتی نییەو قەدەغەیەو سزای گرتنو ڕاوەدوونانی بەدواوەیە. بەتایبەتی باسکردن لە کێشەی کوردو مافی کورد هەر تەواو بڤەیە! لەڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سوریادا ناوی گەلی کوردو کوردستان ناهێنن. تەنانەت ناڵێن شاعیرو هونەرمەندی کورد، لەباشترین حاڵەتدا ئەڵێن: (خەڵکی سەرووی عێراق) .

من چەندینجار ڕێمکەوتۆتە سوریا، بەدەیان چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کردووم، بەڵام ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاویان نەئەکردەوە. تەنها دەرفەت ئەوەبوو کە

لەڕێگەی هەندێ ڕۆژنامەو گۆڤاری لوبنانیو فەلەستینییەوە قسەی خۆم بکەم و بەشێک لەشیعرەکان بگەنە خوێنەری عەرەب. ئەویش لای چەپەکان، ئەوان کە پێشکەوتووتر بیریان ئەکردەوەو بەعسی و فاشیزم نەبوون. بۆیەکەمجار هەڵبژاردەیەک لەشیعرەکانم لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا بڵاوکرانەوە وەکوو "العاصفە" و "الهدف" و "السفیر" و "النهار"دا .

"عەلی ئەلجندی" شاعیری ناسراوی سوریا، ئەوکاتە بۆیەکەمجار لەشام دیم، کەوتبووە تەمەنەوە، بەلام پیاوێکی تابلێی قسەخۆشو ئینسانیو شاعیرێکی دڵتەڕو کراوەبوو. لەم ساڵانەی دواییدا، کە دیمەوە هەر تەواو پەکی کەوتبوو، تەنانەت نەیناسیمەوە!. چایخانەی "هاڤانا" ببوو بەشوێنی هەمیشەییم، شوێنی خوێندنەوەو نووسینو دیدارم. بەشێکی تازەی شیعرەکانی "ئاوێنە بچکۆلەکان"م لەم قاوەخانەیەدا نووسیی. بۆ خۆیشم هەر لەولاتەوە هەڵبژاردەیەکی باشم لەو شیعرانە لەگەڵ خۆمدا هێنابوو کە "ئەبوشەهاب"و کاک "مستەفا ساڵح کەریم" لەکاتی خۆیدا کردبوویانن بەعەرەبی. لەبەرئەوە شاعیرو ئەدیبەکانی سوریا بەر لەبڵاوکردنەوەیان ئەم تەرجەمانەیان ئەبینیو منیان ناسیبوو .

کاک "شێرکۆ"ی خزمی "د. فوئاد مەعسوم"یش کە ئەوکاتە لەشام بوو، یەکێک بوو لەو کەسانەی لەسەرەتای هاتنمەوە دۆستایەتیم لەگەڵدا پەیدا کردبوو. بۆ چەند شەوێکیش لەشوقەکەیدا، کە شوقەی د. فوئاد بوو، میوانداری کردم. هەر لەوێش بۆ یەکەمجار کاک "حەمید دەرویش"ی کوردی ناسراوی سوریاو خەڵکی قامیشلیم ناسیو، دواتریش تێکەلاویمان زیاتر بوو .

"د. خەسرەو خاڵ" بەڕەسمی بوو بەنوێنەری ی. ن. ک لەشام و خانوویەکی گرت و نووسینگەکەیشی هەر لەماڵەکەدا بوو. ئەو برادەرانەی بەیەکەوە هاتبووین، بەرەبەرە هەریەکەو بەرەو چارەنووسی خۆی ڕۆیشت. ئەوەندە نەبوو گەیشتبوینە شام، ئەوان هەموویان یەکە یەکە چوون بۆلای دوکتور بۆ فەحسی گشتیی تەندروستی خۆیان. من تاقەتم نەبوو، لەئەنجامی پشکنینداو دوای دەرچوونی ئەشیعەکانی، دکتۆرەکەی کاک نەوشیروان وتبووی: (ئەوە تۆ چۆن ماوی؟!). ئەبێ بەزووترین کات نەشتەرگەریت بۆ بکرێ، ئەگەر نا، گوشاری زۆرتر بچێتە سەر "حەبلی شەوکیت"، ئەوا ئەپچڕێو ئەبێ تاماوی لەسەر عارەبانەبیت. کاک نەوشیروان لەدوای ماوەیەک ڤیزەی ئەڵەمانیای بۆ کراو ڕۆیشتو لەئەڵەمانیا نەشتەرگەرییەکەی بەچاکی بۆکرا .

د. فوئاد مەعسومو د. کەمال خۆشناو چوون بۆ لەندەن. کاک "عومەر"یش ماوەیەک مایەوەو گەڕایەوە بۆ وڵات. هەر خۆم مامەوەو منیش چوومە ئوتێل، ئاگام لەدەنگ و باسی ماڵ و منداڵ نەمابوو، بەڵام پێشتر لەگەڵ کاک عومەردا باسی ئەوەمان کردبوو، وەختێ گەیشتمە ئەورووپاو، لەهەر وڵاتێ جێگیربووم، نامەی بۆ بنووسمو بۆئەوەی ئیتر ئەویش لەسلەیمانییەوە نەسرین و منداڵەکان لەڕێی پێشمەرگەوە دەربکاو بیانگەیەننە ئێران. کاک عومەر خۆی بەرلەوەی خواحافیزیم لێبکات وتی (لەو ڕووەوە هیچ خەمێکت نەبێ، ئەیانگەێنینە ئێران.. ئەی گوایە ئێمە چین؟!) .

ناوەندی کولتووریی سۆڤیەتی لە شام، بیناکەی لەناوجەرگەی شامدا بوو. گەلێجار ئەم ناوەندە کۆڕو سیمیناری بۆ ئەدیب و هونەرمەندە ناسراوەکانی سووریاو دەرەوەی سوریا ئەگێڕا، هەوڵمدا لەڕێی ئەم ناوەندەوە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بگرم. بەڵام بێ ئەنجام بوو، ڕێگەیان نەدام! دیارە هەر لەبەرئەوەی کوردبووم. ڕۆژێکیان لە قاوەخانەی "هاڤانا" دووستییەک لەو شاعیرو ئەدیبە فەلەستینییانە وتیان: (ئێمە لای خۆمان لە "موخەیەم یەرموک" کۆڕێکت بۆ ئەگرین). وتم: (زۆر باشەو سوپاسیشتان ئەکەم) .

هەفتەیەکی نەخایاند، کات و شوێنی کۆڕەکەیان پێ وتمو وتیشیان: (ئێمە خۆمان خەڵکی خۆمان و شیعر دۆستی خۆمان هەیەو ئامادە ئەبن). منیش لای خۆمەوە چەند ناسیاوێکی کوردی شامم ئاگادارکرد لەوەی کۆڕێکی وائەگیرێ. شاعیرێکی بەسراوی خەڵکی عێراقم لەشام ناسیبوو "محەمەد عەلی" ناوبوو، لەدۆستە نزیکەکانی "سەعدی یوسف"ی شاعیریش بوو. لەگەڵیدا ڕێکەوتم کە ئەو ڕۆژە ئەو شیعرەکان بەعەرەبی بخوێنێتەوەو منیش بەکوردی. یەک لەدوای یەک، شیعرە وەرگێڕدراوەکانم دایە، نزیکەی چل پارچە شیعر ئەبوون. ئەو شوێنەی کۆڕەکەی لێئەگیرا "نەقابەی کشتوکاڵی فەلەستینییەکان" بوو لە یەرموک، کۆڕەکە سەر لەئێوارەبوو. هۆڵەکە جێگەی نزیکەی دووسەد کەسی تێدا ئەبۆوە، خەڵکێکی باشو لەبەرچاو هاتبوون، جێگە نەمابوو. دیاربوو بەشی زۆریان لەکوڕو کچە کوردە خوێندکارەکانی زانکۆی شام بوون .

لەدوای کوردستانەوە، ئەمە یەکەم کۆڕبوو بیگرم، هەردووکمان چووینە سەر شانۆکە. محەمەد عەلی؛ زۆر بەکورتی منی بەئامادەبووان ناساندو، ئیتر دەستمان کرد بەخوێندنەوە، شیعر بەشیعر من بەکوردی و ئەویش هەمان شیعر بەعەرەبی و لە ناوەڕاستی خوێندنەوەدا کارەبا کوژایەوە، دوای چەند دەقیقەیەک

فانۆزێکیان هێناو دەستمان کردەوە بەخوێندنەوە تاکوتایی، پێشوازییەکی باشیان لێکردم، کەچووینە دەرەوە خوێندکارەکان دەوریاندام و پرسیاریان لێئەکردمو وێنەیان لەگەڵدا ئەگرتم .

دوایئەوە خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، تاقمێکیان هەر لەگەڵما مانەوەو بەیەکەوە چووین بۆ کافتیریایەکی خۆشو نزیکەی دوو سەعاتێکی تر پێکەوە دانیشتین. دیارە ئەم هەواڵانە هیچی لەڕۆژنامەو گۆڤارە سوریەکاندا بڵاونەئەکرانەوە. کوڕو کچە خوێندکارەکانی کوردی سوریا، زۆر داخ لەدڵ بوون، چونکە لەژێر گوشارو هەڕەشەی زۆری ڕژێمدا بوونو خواخوای ئەوەیان بوو کوڕێکی وا ببەستریٚ و هەناسەیەکی تێدا بدەن. دوو ڕۆژ تێپەڕیو سەری سێیەم ڕۆژ، من هەر لە هاڤانا دانیشتبووم، دووان لەئەدیبە گەنجە فەلەستینییەکان، پەیدابوونٚ و هاتن بۆ سەرمێزەکەم .

پەشۆکاو دیاربوونو وتیان: (ئەوە تۆ لەکوێی؟! دوو ڕۆژە دوو ئەفسەری نەهێنی موخابەراتی سوری لای ئێمەنو ئەڵێن: "ئەم کوڕە چی بووەو ئەو شاعیرە لەکوێیە؟"، منیش پێموتن: (ئەوەتام و فەرموون بۆ کویٚ ئەڵێن من ئامادەم)". هەروەها وتیان: (ئێمە داوای لێبوردن ئەکەین. بەڵام دەسەڵات نییەو ئەبیٚ بچیت بۆلایانو پێویست ناکات ئێمە ببین چونکە بەتەنها داوای خۆتیانکردووە) .

هەستامو لەدەرەوە تاکسییەکم گرت بەرەو هەمان بینای نەقابە کەکوڕەکەمان تێدا گرتبوو، دوای ئەوەی چوومە ژوورەوە، یەکێک ڕاوەستابوو پێموت: (من فڵان کەسم لێرە هەواڵی منیان پرسیوە!) وتی: (ڕاستە). چووە ژوورێکەوەو هاتەوە دەرەوەو وتی: (فەرموو بچۆرە ژوورەوە). بەخۆم و جانتاکەی بن دەستمەوە خۆمکرد بەژوورەکەدا، دووکەس کە بەمەزەندە لەسییەکانی تەمەندا ئەبوون، یەکێکیان لەپشت مێزەکەوەو ئەویتریان بەتەنیشتییەوە دانیشتبوون، هەردووکیان بەرگی مەدەنی چاکەتو پانتۆلیان لەبەردابوو. وتیان: (دانیشە!). دوایئەوەی دانیشتم. پیاوە چاو سەوزەکەیان، کەئەتوت ئەکتەری هۆلیودە، کەوتە پرسیارکردن: (تۆ چیت؟! تۆ کێیت؟! لەکوێوە هاتوویت؟! کوا پەساپۆرتەکەت؟! کیٚ پێی وتیت: شیعر بخوێنەرەوە؟! کوا شیعرەکان؟! بەچ زمانیٚ تۆ شیعرت خوێندەوە؟! کوردستان کوێیە؟! لەکویٚ دابەزیویت؟! هاوڕێکانت لێرە کێن؟! چەند ئەمێنیتەوە؟! ئەچی بۆکویٚ؟!) .

ئەمانەو دەیان پرسیاری تریش. پەساپۆرتەکەم دانیو بەوردی تەماشایان ئەکردو سەدجار ئەو پەرانەیان هەڵداوەتەوە. دیسانەوە ئەیانپرسییەوە، (چەند لەسوریا ئەمێنیتەوە؟! کەی ئێرە بەجێ ئەهێڵیت؟ چۆن گەیشتیتە ئێرە؟!) منیش بەکورتیو پوختی پێموتن: (خۆ من بەدزییەوە نەهاتوومەتە ئەم وڵاتە، ئەوە پەساپۆرتەکەم و مۆری هاتنەناوەوەی شام و بۆ زانیاری خۆیشتان من لەگەڵ نوێنەرانی ی. ن. ک دا هاتووم بۆ ئێرەو ئێستە بەرەسمی مەکتەبیان لێرە کردۆتەوە. جگەلەوەیش من هیچ ئیشێکم لێرە نییە. هەرکاتێ ڤیزەی وڵاتێکی ئەوروپام وەرگرت سەعاتێک لێرە نامێنمەوە) ئینجا پرسییان: (تۆ شیعر لەسەرچی ئەنووسی؟!) پرسیارێکی سەیر بوو!، شیعر بۆ هەموو شتێ، بۆ ژیان بۆ سروشت بۆ ئازادی بۆ هەمووشتێ. (ئەی باشە کوا شیعرەکان؟!) منیش پێموتن: (لە ئوتێلەکەمە ئێستە پێم نییە). ئەم لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەیە نزیکەی سەعاتێکی خایاند، لەدواییدا هەرهەمان پیاوە چاو شینەکەیان پێی وتم: (باشە سبەینێ سەعات دە لەگۆرەپانی مالکی نزیک ئوتێلەکەی خۆت ڕاوەستە، ئێمە بە ئوتومبیلێکی جۆری ئۆپڵ دێینو هەڵتئەگرین و نیو سەعاتێ لەگەڵماندا ئەبیتو دوایی برۆ بەڵام شیعرەکان لەگەڵ خۆتدا بێنە!).

هەمان تاس و هەمان حەمامی بەعسی عێراق!. یەک سێوی گەنیون‌و کراون بەدووکەرتەوە.. هەمان عەقڵی شۆڤێنی و نەفسی لەخۆبایی. من ئەمزانی ئەمە هەمووی لەبەرەئەوەیە من کوردم و شیعرم بەزمانی کوردی خوێندۆتەوەو ئەمەیش لای ئەمان حەرامەو جێی مەترسییە! چونکە کوردیش لەسوریادا هەیەو ئەیانەوێ دوورو نزیک ئەم باسە نەکرێو ئەگەر کرایش سەرکوتێکەن، یان دیزەبەدەرخونە!. ڕەنگە ئەمە یەکەم جاربووبێ کۆڕێ سازکرابێو لە دووسەد کەس زیاتری بۆ هاتبێو بەئاشکرایش بەزمانی کوردیو بەدەنگی بەرز شیعری تێدا خوێندرابێتەوە. ئەشێ فەلەستینییەکانیش ئەم مەترسییەیان لەبەرچاو نەبووبێو ئاسایی وەک هەر کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەی خۆیان تەماشایانکردبێ. ئەگینا هەرگیز نەئەچوونە ژێری .

بەهەرحاڵ دوایئەوەی لای ئەوانم بەجێهێشت، چووم بۆلای "د. خەسرەو خاڵ" حاڵو مەسەلەکەم تێگەیاند، بەڵام ئەوەی من چاوەڕوانم نەئەکرد ئەو هەڵوێستە سەیرەی د. خەسرەوی هاوڕێم بوو، لە پێشدا کەمێ منجەمنجی کردوو لەدواییدا پێی وتم: (بەخوا کاک شێرکۆ ئێمە ئامادەنین لەسەر شیعری تۆ پەیوەندی خۆمان لەگەڵ سوریادا تێکبدەین!).

ئەم قسەیە ئەوەندە ناخۆش‌و چاوەڕوان نەکراوبوو. وەک شولکێکیان دابێ لەسەری لووتم وابوو. تۆزێ بێدەنگ بووم و دوایی وتم: (سوپاس دکتۆر! وەللا بابە ئەگەر لەسەر شیعری من ئەم پەیوەندییە تێکئەچێتەوە، منیش ڕازی نابم قسەی تێدا بکەیت!). لەقسەی یەکەمجاری ناخۆشتر، دووەمی بوو کە وتی: (ئینجا باشە شیعر چییە؟! بێ نەبێ؟! چی لەدنیا ئەگۆڕێ!)، کە وایوت ئەوەی ڕاستیبێ ئیتر منیش قسەی خۆمکردو زۆر بەڕەقی وەلامدمایەوەو بێ خواحافیزیی‌و بەتووڕەیی چوومە دەرەوە!. ئیتر ئەوە دوا قسەو دوا یەکتر بینینی من و د.خەسرەو خاڵ بوو، بەلام بەر لەکۆچی دوایی، ئەو کاتەی گەیشتبوومە ستۆکهۆلم، نامەیەکی بۆ ناردبووم، (تائێستەیش نامەکەم لاماوە)، لەو نامەیەدا داوای لێبوردن ئەکاو پیرۆزباییەکی گەرمیشم لێئەکا بەو بۆنەیەوە کەخەلاتی تۆخۆلسکی ئەدەبیم لەسوید وەرگرتووە.

منیش وەلامدمایەوە بۆمنووسیبوو: (حەزئەکەم دلنیابی کەدوای گەیشتنی نامەکەت هیچ لەدلما نەماوە، بەلام بەداخەوە وەختێ نامەکەم گەیشتبوو د.خەسرەو دووسی ڕۆژێ بوو کۆچی دوایی کردبوو!).

بۆ سبەینێ سەر لە بەیانی سەعات دە، لەکاتو شوێنی بۆ دانراودا چووم، چۆنیان وتبوو بەوجۆرە، ئوتومبیلێکی ئۆپڵ هاتو پیاوە چاوشینەکە لێی ئەخوڕی‌و ئەویتریشیان لەپشتەوە دانیشتبوو من چوومە پێشەوە، لای خۆیەوە دانیشتم. کەوتەوە ڕۆیشتن، یەکسەر پێی وتم: (کوا شیعرەکان؟!) منیش دامە دەستی‌و ئەویشدایە دەستئەوەی دواوە، ناو ئۆتۆمبیلەکە بووبوو بەژووری لێکۆلینەوە، شەقام بەشەقام ئەگەڕان‌و ئەسووڕانەوەو پرسیاریان لێئەکردم، (ئەم شیعرە یەعنی چی؟!) جاربەجاریش ئەوەی دواوە ئەیوت: (دێرە شیعرێکی ئەخوێندەوەو ئەیوت "منیحە")، تا هاتنە سەر شیعری "لە دارستانێکدا" ئەم شیعرەم چەند ساڵ بوو نوسیبوو، لەشیعرەکەدا هەندێ وێنەی تێدایە، بۆ نموونە کە ئەڵێت "شێرێ لەلانەکەی خۆیدا بیریکردەوە چۆن پەلاماری پڵنگەکەی هاوڕێی بدات" "كان الاسد يفكر فى عرينه، يهاجم النمر الذى فى جواره" وتیان (ئەم شێرە چییە لێرەدا) .

وتم (شێرە، شێر یەعنی حەیوان!). تۆزێ مات بوون "تومەز ئەوان بیر لە (الاسد)ەکەی خۆیان ئەکەنەوەو منیش بیر لەشێری ڕاستەقینە". شەقامێکی ترمان کردوو ئیتر لەوێدا ڕاوەستاو ڕوویتێکردم پێیوتم: (ئەمە شیعرەکانت! بەلام تۆ ئەبێ بەزووترین وەخت شام بەجێبێڵیت و بۆ کوێ ئەچی بچۆ). دیسانەوە

پێموتنەوە: (من داوای ڤیزەم کردووە، هەرکاتێ بۆمدەرچوو یەک سەعات لەشام نامێنمەوە. بەڵام نازانم ئەوە کەی ئەبێت!)، دەرگاکەم کردەوەو هاتمە خوارەوەو پڕ بەسییەکانم هەوایەکی ئازادم هەڵمژیو ڕوومکردە سەنتەری شام .

بیرم ئەکردەوە: ئەم دوو ڕۆژە زۆرشتی تێدا گۆڕا! ئەوە هەڵوێستی د.خەسرەو لەولاوە. تێهەڵپێچانی موخابەرات لەم لاوەو، هیچ ئومێدی ڤیزە وەرگرتنێکیش لەئارادا نییە، لەبەرئەوە باشترین شت ئەوەیە بابڕۆم بۆ چەند ساتێ خۆم مەست و بێهۆشبکەم! پێموایە هەر ئەو شەوە بوو کەشیعری "ورتەورتێک"م تێدا نووسی، واتە "حەمە بچکۆلی بۆیاخچی."

یەکێک لەو شاعیر و ڕووناکبیرە عێراقییانەی کە لە شام ناسیم "کەریم عەبد" بوو، وەختێ خۆی لەحزبی شیوعی عێراقیدا بوبوو، بەڵام وازیهێنابوو، زۆرجار یەکترمان ئەدی. ڕێزی منی زۆر لەلابوو، بەشێک لەو شیعرانەی دیوانی "مرایا صغیرە" کە لەساڵی (١٩٨٨)دا لەلایەن "دار الاهالی"یەوە لەشام چاپکرا، ئەو بەشیعرەکاندا چووبۆوەو مشتوماڵێکی تازەی تێداکردبوون .

کەریم عەبد؛ خۆی خەڵکی خواروی عێراقەو شیعەیە، بەڵام پیاوێکی کراوەو مۆدێرن بوو. بیروڕای بەرامبەر مەسەلەی کورد وەک کوردێ بوو، تا ئەوکاتە دوو کۆمەڵە شیعری چاپکردبوو. هەر لەوسەردەمەدا بوو کە لەگەڵ کەریم عەبددا ڕەخنەگری تونسی "سالح ئەلعەیاری"م ناسیی. زۆرجار سێ قۆڵی دائەنیشتین، ئەویش شیعرەکانی خوێندبۆوەو لەدوایشدا لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەو کورتە شیعرانەی من نووسیو بەر لەچەند ساڵێ بڵاوکرایەوە. دوای گەیشتنە سویدیش بەنامە پەیوەندیمان هەر هەبوو، بەڵام ئیتر پەیوەندیمان بڕاو نەمزانی کەوتە کوێوەو چی بەسەرهات!. کەریم عەبد؛ دوایئەوەی چەند ساڵ لەشام بوو، چوو بۆ "لەندەن"و بەئێجگاری لەوێ مایەوەو لەساڵی (١٩٩٤)دا لەوێ بینیمەوە.

( لە نێوان ئەو یادەوەرییانەدا، کە بووە بە گەنجینەی
هەر یەکێکمان یادەوەری وایان تێدایە تەنیا بۆ
هاوڕێکانمانی باسدەکەین.یادەوەری واشیان تێدایە
تەنانەت بە هاوڕێشی ناڵێین و تەنیا بۆ خۆمانی
دەگێڕینەوە. بە نهێنیش نەبێت بۆ خۆمانی ناگێڕینەوە.
بەلام یادەوەری وا هەیە تەنانەت مرۆڤ بۆ خۆیشی
دانی پیدانانێت.
دۆستۆیفسکی)